# تەفسیری خاڵ



بەقەڵەمی

## شێخ محەممەدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاری عیراق

جزمی سێیەم

چاپی دووهـــەم



چاپخـانەی زانکـۆی سـلێمانی
١٣٩٩ك - ١٩٧٩ز

# تەفسیری خال

به قەڵەمی

شێخ

محمدی خال

ئەندامی کۆڕی زانیاریی عیراقی

جزمی سییەم

چاپی دووهەم

چاپخانەی زانکۆی سلێمانی

١٣٩٩ك - ١٩٧٩ز

# پێشـــــــەکی

لە سالی ١٩٦٩ و ١٩٧٣دا تەفسـیری جزمی یەکـەمو دووهەمم نووسـیو لەچاپمدا ، دوای ئەوە ویستم هەر لە سەرەوە پیا بێم تا هەر چەنـدێك گەیشتم ، بەلام کە تەماشام کرد جزمی «عم»و «تبارك»و «قد سمع‌الله»و «والذاریات» لە هەموو جزمەکانی تر زۆرتر بە سەردەمی قوتابی معهدی ئیسلامیو قوتابی قوتابخانەکانو مامۆستای مکتبەکانەوەن ، هەروەك بە دەست خوێندەوارانی کوردەواریشەوەن لە کەسەبەی بازاڕ ، جا لەبەرئەوە ویستم ئەم چوار جزمە بەرودوا لەچاپ بدەم ، ئنجا بگەڕێمەوە سەر جزمی سێهەمو چوارەم لەسەرەوە تا دوایی ٠

با ئەمەش فەرامۆش نەکەین کە لە سالی ١٣٥٤هـ ـ ١٩٣٥مدا تەفسـیرێکم لە جزمی «عم»نووسی زۆر بە کورتی ، وە هەر لەو سالەدا لە چاپخانەی «ژیان» لە چاپمدا ، بەلام ئەمجارە لەسەر شێوەی تەفسیر ی خال تەفسیرێکی جوانترو ڕێکو پێکترم لێ‌کرد ، ئیتر لەسەر خوا ٠

محمدی خال

# سوورەی ( نباء )ە

**مەککی‌یە ، ٤٠ ئایەتە ، ١٧٣ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم جزمی (عم)ەیە سوورەتەکانی هەموو مەککین ، سوورەتی «بینە»و «نصر» نەبێ ، واتە هەموو لە «مەککە» ، وە لەسەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە هاتوونەتە خوارەوە، کە مەردوم لەو دەمەدا ، هەموو بێ‌ئاگاو ، نوستوو بوون ، وە ئاگایـان لە دینو لە دەنگ‌وباسی ڕۆژی دوایی نەبووە ٠

سوورەتەکانی ئەم جزمە هەموو کورتن ، لەگەڵ تۆزێك زیـادو کەمی‌دا ، وە هەموو وەك یەك وان ، لەسەر باس «موضوع»و شێوەو ، ئاهەنگو ، تیینو ، تەووژمو ، بەهێزیی‌دا ٠

سید قطب لە تەفسیری «في ظلال القران»دا ئەڵێ : ئەم جزمە هەمـووی وەك بێدارکردنەوەی ، سیخورمەو ، بانگ‌کردنی ، یەك لەدوای یەك وایە بەدەنگی بەرز بۆ ئاگادارکردنەوەی مەردومی ، نوستووی ، خەوگران ، یا هێنانەوە هۆشی سەر خۆشی بێ‌ئاگا ، یا بێدارکردنەوەی چەند یاریی کەرێکی وا ، کە لە یاری‌یەکەیانا نوقوم بووبن ، وە هەموو شتێکیان لەبیرچووبێتەوە ، وەك بانگیان بکاتو ، ڕایان وەشێنێو نقورچیان لێ بگرێو ، سیخورمەیان لێ‌بدات ، وە یەك لەسەر یەك پێ‌یان بڵێ : بێداربنەوە ٠ هۆشیاربنەوە ٠ بیربکەنەوە ٠ خوا هەیە ٠ پێغەمبەر هەیە ٠ ڕۆژی زیندووبوونەوە هەیە ٠ لێپرسینەوە هەیە ٠ دۆزەخ هەیە ٠٠٠ هەروەهـا جاری دووهەمو سێهەمو ٠٠٠ دەهەم ، وە لەگەڵ ئەم بانگ‌کردنانەشا ، دەسـتێکی بەهێز ببێ ، کە ئەم نوستووانە ڕاوەشێنێ ، وە ئەم سەرخۆشانە هەڵسێنێ ، وە ئەم یاریی‌کـەرانە هەڵیچـڕێنێ لـە یـاری‌یـەکەیـان ، ئـەمـانیش نـاو بـەنـاو چاوێکی خەواڵـوو هەڵبـڕنو خێـرا خـەویان لێ‌بکـەوێتـەوە ، ئنجـا دەسـت بکاتـەوە بە ڕاوەشاندنیانو بانگ کـردنیانو هـاوار لێکردنیان ٠ نـاو بەنـاو نوستووەکان بێداربنەوە ، بۆ ئەوەی لەڕووی لاساری‌یەوە بڵێن : هەڵناستین ٠ بێدارنابینەوە ٠ لەپاشا بەرد بگرنە ئەو بانگ‌کەرەی کە بێداریان ئەکـاتەوە ٠٠

ئنجا بنوێنەوە دیسان دەست بکاتەوە بە بانگ کردنەوەو ڕاوەشاندنیان ، وە لەگەڵ هەموو جارێکا کە چاو هەڵئەبڕن ، چەشمەندازێکیان نیشان بدات لە چەشمەندازانی ئادەمیی یابوونەوەر •

هەرچەند دەوری ئەم جزمە ئەکەمەوە شتێکی ئاناوام بە بیرادێ ، وابزانم ، هەرکەسێکی تریش ووردبیێتەوە لێی وەك من وایە ، نەخوازە لا ئەوانەی کە لەم ئایەتانە وورد ئەبنەوە :

« فلینظر الانسان مم خلق ؟ ••• » « افلا ینظرون الی الابل کیف خلقت ؟ والی السماء کیف رفعت ؟ والی الجبال کیف نصبت ؟ والی الارض کیف سطحت ؟ » •

وە ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە ئەخوێننەوە :

« ءأنتم أشد خلقا أم السماء بناها ؟ رفع سمكها فسواها • واغطش ليلها واخرج ضحاها • والأرض بعد ذلك دحاها • أخرج منها ماءها ومرعاها • والجبال ارساها • متاعا لكم ولأنعامكم » •• « ألم نجعل الأرض مهادا ؟ والجبال أوتادا ؟ وخلقناكم أزواجا ؟ وجعلنا نومكم سباتا ؟ وجعلنا الليل لباسا ؟ وجعلنا النهار معاشا ؟ وبنينا فوقكم سبعا شدادا ؟ وجعلنا سراجا وهاجا ؟ وانزلنا من المعصرات ماء ثجاجا ؟ لنخرج به حبا ونباتا • وجنات ألفافا ؟ » •• « فلينظر الانسان الى طعامه • انا صببنا الماء صبا • ثم شققنا الأرض شقا • فانبتنا فيها حبا • وعنبا وقضبا • وزيتونا ونخلا • وحدائق غلبا • وفاكهة وأبا • متاعا لكم ولأنعامكم » •

وە ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە ئەخوێننەوە : «يا أيها الانسان ما غرك بربك الكريم • الذي خلقك فسواك فعدلك • في اي صورة ما شاء ركبك ؟» •• « سبح اسم ربك الأعلى • الذي خلق فسوى • والذي قدر فهدى • والذي أخرج المرعى • فجعله غثاء أحوى» •• «لقد خلقنا الانسان في أحسن تقويم • ثم رددناه أسفل سافلين • الا الذين آمنوا وعملوا الصالحات فلهم أجر غير ممنون • فما يكذبك بعد بالدين ؟ أليس الله باحكم الحاكمين ؟» •

« اذا الشمس كورت • واذا النجوم انكدرت • واذا الجبال سيرت • واذا العشار عطلت • واذا الوحوش حشرت • واذا البحار سجرت • واذا النفوس زوجت • واذا الموءودة سئلت باي ذنب قتلت ؟ واذا الصحف نشرت • واذا السماء كشطت •

واذا الجحيم سعرت • واذا الجنة أزلفت • علمت نفس ما أحضرت » •• « اذا السماء انفطرت • واذا الكوكب انتثرت • واذا البحار فجرت • واذا القبور بعثرت • علمت نفس ما قدمت واخرت » •• « اذا السماء انشقت وأذنت لربها وحقت • واذا الارض مدت• وألقت مافيها وتخلت • وأذنت لربها وحقت •••» «اذا زلزلت الأرض زلزالها واخرجت الأرض أثقالها • وقال الانسان مالها ؟ يومئذ تحدث أخبارها • بان ربك أوحى لها » •

وە ئەوانەی کە ئەم ئایەتانە ئەخوێننەوە :

«فلا أقسم بالخنس الجوار الكنس • والليل اذا عسعس • والصبح اذا تنفس» •• « فلا اقسم بالشفق • والليل وما وسق • والقمر اذا اتسق » •• « والفجر • وليال عشر • والشفع والوتر • والليل اذا يسر » •• « والشمس وضحاها • والقمر اذا تلاها • والنهار اذا جلاها • والليل اذا يغشاها • والسماء وما بناها • والارض وما طحاها • ونفس وما سواها • فألهمها فجورها وتقواها » •• والليل اذا يغشى • والنهار اذا تجلى • وما خلق الذكر والأنثى » •• « والضحى والليل اذا سجى » •• تا دوایی •

هەرکەسێك لەم ئایەتانە ووردبێتەوە تێدەگات کە هەر یەکێکیان وەك نوقورچێك وایە بۆ مەردومی نوستوو ، یا وەك سیخورمەیەك وایە بۆ سەرخۆشێکی بێئاگای خەولێکەوتوو •

ئەم جزمە هەمووی یا باسی دروستکردنی ئادەمیی‌و گیانلەبەرانی ترە ، وە یا باسی چەشمەندازانی جیهانە ، کە هەرچەشمەندازێکی لاپەڕەیەکی کراوەیە لە نامەی بوونەوەر ، وە یا باسی هێندێ رووپەڕەی ترش‌و تاڵی ڕۆژی دوایی‌یە کە تەزوو بەناوشان‌و موچرك بە ئەنداما ئەهێنێ •

ئەم سوورەتەی کە وا ئێستا دەستی پێئەکەین نموونەیەکە بۆ ئاڕاستە بوون «اتجاه»ی ئەم جزمە لەم ڕووانەوە کە باسمان کرد ، وە سوورەتەکە دائەمەزرێنێ بە پرسیارێکی پڕ لەسام ، ئەفەرموێ : «عم يتساءلون» •

⊙ ⊙ ⊙

کاتێك کە پێغەمبەر بانگی گەلەکەی خۆی کرد بۆ بڕوا هێنان بە ڕۆژی زیندووبوونەوە ، بێبڕواکان پرسیاریان ئەکردو ئەیان ووت : ئاخۆ ئەمە ڕاستبێ، وە ڕۆژی وا ببێ ؟ •

سُورَةَ النَّبَاء

بسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم

عَمَّ يَتَسَاءلُونَ؟!(١) عَنِ النَّبَاءِ العَظِيمِ(٢) الَّذِي هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ(٣) كَلاَّ! سَيَعْلَمُونَ(٤) ثُمَّ كَلاَّ! سَيَعْلَمُونَ(٥)

# سوورەی ( نباء )ە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئەوە لەچی پرسیار ئەکەن (ئەو بێبڕوایانە) ؟!(١) لەو دەنگۆو باسە گەورەیە پرسیار ئەکەن(٢) کە ئەوان تیا دووبەرەکیین(٣) نـەء با پەشیمان بنەوە ، لەمەولا تێئەگەن (٤) دووبارە (ئەڵێم) : نەء لەمەولا تێئەگەن(٥) ٠**

**ئنجا خوا لە ڕووی سەرکۆنەوە پێیان ئەفەرموێ (عم یتساءلون)ئەوە پرسیار لەچی ئەکەن ؟!**

**ئنجا خوا خۆی وەرام ئەداتەوە بە جۆرێك کە گەورەیی ئەو دەنگۆو باسـە بگەیەنێ ، ئەفەرموێت (عن النباء العظیم) لەو دەنگۆو باسە گەورەیە پرسیار ئەکەن (الذی هم فیه مختلفون) کە ئەوان تیا دووبەرەکیین ، واتە هێندێکیان بڕوایان پێی نیەو هێندێکیان تیا دوو دڵن ؟ واتە نەئەبوو ئەم جیاییو دوو دڵییەیان ببـوایە ، وە ئەبوو بیانزانیایە ئەو خوایەی کە ئەم جیهانە ڕێکوپێکەی دروست کردووە ، کە هەرچی هەڵەبێ تیا نییـە ، وە ئەم ئادەمییەی لە گڵ دروست کـردووە ، وە ئەم هەموو ژیریو بیـرو هەستو تێگەیشتنەی پێداوە ، کە زۆر لـە نهێنی ئاسمانو زەویی دۆزییوەتەوە ـ چۆن زیندووی ناکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا ، تا بە بەری کردەوەی خۆی بگات ، و ەچۆن ئەم هەموو زۆرو ستەمو دەست درێژییەی کە لە یەکتریی ئەکەن هەروا ئەڕواو وون ئەبێ بەبێ لێپرسینەوە ؟ وە چۆن پاشەڕۆژی ئەم ئادەمییـە بلیمەتەو پاشـەڕۆژی مێشو مێشـوولەیەك وەك یەك ئـەبن ، وە هەردووکیان ئەچنەوە پەردەی نەبوون ، ئنجا بە هەڕەشەوە پێیان ئەڵێ (کلا) با پەشیمان بنەوە لەم دوو دڵییو بێبڕواییيە (سیعلمون) لەمەولا تێئەگەن ، واتە لە ڕۆژی دواییدا بە چاوی خۆیان ئەیبینن و حالیی ئەبن (ثم کلا سیعلمون) دووبارە با پەشیمان بنەوە ، لە ڕۆژی دواییدا تێئەگەن کە چییان بەسەردێ ٠**

⊙ ⊙ ⊙

أَلَمْ نَجْعَلِ الأَرْضَ مِهَاداً؟(٦) وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً؟(٧) وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجاً(٨) وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتاً(٩)

---

ئایا زەوییمان بۆ ڕانەخستوون ؟(٦) وە کێوەکانمان نەگێڕاوە بە مێخ ؟!(٧) وە ئێوەمان دروست نەکردووە بە جووت(٨) وە نوستنتانمان نەگێڕاوە بە مایەی حەسانەوە(٩) •

---

ئنجا ئاووڕێك بە مەردوم ئەداتەوە بەلای هێندێك شتی واوە لەم بوونەوەرەدا، کە نیشانەی میهرەبانیی خوان ، لەگەڵ بەندەگانا ، وە نیشانەی دەسەڵاتیین بەسەر ڕەوانە کردنی پێغەمبەرو زیندووکردنەوەی ئادەمییدا ، فەرمووی (الم نجعل الارض مهادا) ئایا ئێمە زەویی‌مان بۆ ڕانەخستوون تا بە سەریا بێنو بڕۆنو هەڵسووڕێن ؟

گێڕانی زەویی بە جۆرێکی وا کە ئادەمیی لەسەری بژیی ، گەورەترین بەڵگەو نیشانەیە ، لەسەر ئەوەی کە لەودیو ئەم بوونەوەرەوە ژیریی‌یەکی تەگبیرکەر «عقلیکی مدبر» هەیە کە تەگبیری ئەم بوونەوەرە ئەکات ، وە ئەییا بەڕێوە •

(والجبال اوتادا) وە کێوەکانمان نەگێڕاوە بە مێخ بۆ زەویی تا توند بیێو نەبزوێ ؟

وەك لە شوێنی خۆی باسکراوە ئەگەر کێوەکان نەبوونایە زەویی لەبەر ئەو کانە بە جۆشو خورۆشانەی ناوی ، هەمییشە لە بزوتنو جووڵە جووڵو تێکچوونا ئەبوو ، وە لەیەك ئەپچڕا ، بەڵام بە داکوتانی کێوەکان وەك گوڵمێخ ، زەویی وەك گۆی بزمارڕێژ توند بۆتەوە ، وە لە پچڕانو لەتبوون دوور کەوتۆتەوە •

لە تەفسیری ئایەتی «وجعلنا فیها رواسي شامخات» لە سوورەی «مرسلات»دا قسەیەکی جوانی زانایانی سروشتیمان نووسییوە لە بابەت بوونی شاخەکان بە لەنگەری زەویی ، بچۆ بیخوێنەرەوە •

(وخلقناکم ازواجا) وە ئایا ئێوەمان دروست نەکردووە بە جووت ؟ واتە ئێوەمان گێڕاوە بە نێرو بە مێ بۆ ڕێکخستنی خێزانو ، پێکهێنانی خۆشیی ژیانو ، بەخێوکردنی منداڵو ، پێ‌گەیاندنو ، ئامۆژگاریی کردنیان •

(وجعلنا نومکم سباتا) وە ئایا نووستنتانمان بۆ نەگێڕاوون بە مایەی حەسانەوە ؟

بەڕاستی نوستن بەهرەیەکی ئێجگار گەورەیە بۆ هەموو گیان‌لەبەرێك ،

وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاساً(١٠) وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشاً(١١) وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً؟!(١٢)

وە شەومان نەگێڕاوە بە کاڵا(١٠) وە ڕۆژمان نەگێـڕاوە بە کاتی ژیان (١١) وە حەوت ئەستێـرەی بەهێزمان‌دروست نەکردووە لە ژوورسەرتانەوە ؟(١٢) •

نەخوازەلا بۆ ئادەمیی کە لە هەموو شەوو ڕۆژێکا مەکینەی لەش‌و مێشکی بەهۆی ئیشکردن‌و لێکدانەوەوە ، ماندوو ئەبێ ، بەڵام بەهۆی نوستنی چەند دەمێکەوە ، هێزو تەوانـایی تێ‌ئەگەڕێتەوە ، وە هۆش‌و بیری ، تیژ ئەبێتەوە ، ئەگـەر ئەم نوستن‌و بێدار بوونەوەیە نەبوایە ، ئەم ژیانە بەم ڕێك‌وپێکی‌یە نەئەبوو •

(وجعلنا الليل لباسا) وە ئایا شەومان نەگێڕاوە بە داپۆشەر وەك کاڵا ، واتە هەروەك بەرگ‌و کاڵا مەردوم دائەپۆشێ‌و ئەی‌پارێزێ لە سەرماو گەرما ، تارییکی شەویش مەردوم‌و هەموو گیان‌لەبەرێکی‌تر ئەپارێزێ لە دوژمن‌و گەلێ شتی خراپ ، وە ئەو گیان‌لەبەرەی کە نە ڕۆژا خۆی شاردبێتەوە ، لە شەوا بە ئاسانیی ئەتوانێ خۆی ڕزگار بکات لە ژێر پەردەی تارییکی‌دا •

(وجعلنا النهار معاشا) وە ئایا ڕۆژی ڕووناکمان نەگێڕاوە بە کاتی ژیان‌و هەڵسووڕان ، واتە بە کاتی ئەوەی کە ئیش‌و کاری تیا بکرێ‌و ڕۆژیی‌و پێ‌بژیوی تیا پەیدا بکرێ •

(وبنينا فوقكم) وە ئایا دروستمان نەکردووە لە ژوور سەرتانەوە (سبعا شدادا) حەوت ئەستێرەی قایمی بەهێز • وەك لە تەفسیری سوورەی ملك‌و ئایەتی (٢٩) لە سوورەی «بقـره»دا باسـمان کـردووە ، مەبەس لـەم حەوتە ئەو حـەوت ئەستێرە گەڕۆکانـەن کە بـە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێنـەوە ، وە ئاسمانن بـۆ زەویی ، وەك «مریخ‌و ، مشتری‌و ، زحل‌و ، ئەورانووس‌و ، نبتۆن‌و ، پلۆتۆو ، ئێکس» کە ئەم حەوتەمیینە لە ساڵی ١٩٥٣م‌دا دۆزراوەتەوە ، بەڵام «عطارد»و «زهره» بەرناکەوون چونکە لە ژوور زەوی‌یـەوە نین بەڵکو لەژێر زەوی‌یەوەن ، بەم ڕەنگە لـە زەویی نزیکترن بە ڕۆژ ، هەر وەك زەوی خۆی بەرناکەوێ •

ئەم ئەستێرە گەڕۆکانە بە هەموویان لەگەڵ ڕۆژو مانگ‌و زەویی‌و عطاردو زهرەدا کۆمەڵەی ڕۆژیی «مجموعەی شمسی» ، وە جیهانی سەرزەویی ئێمە پێك‌دێنن، لەبەرئەوە هەر ئەم ئەستێرانە ناو ئەبات ، ئەگینا هەزاران هەزار ملیۆن کۆمەڵەی ڕۆژیی‌تر هەن بە ئاسمانەوە ، بەڵام لە ماوەی جیهانی ئێمەدا نین •

وَجَعَلْنَا سِرَاجاً وَهَّاجاً(١٣) وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجاً(١٤)
لِنُخْرِجَ بِهِ حَبّاً وَنَبَاتاً(١٥) وَجَنَّاتٍ أَلْفَافاً!؟(١٦)

وە دروستمان نەکردووە چرایەکی درەخشان ( کە ڕۆژە )(١٣) وە ئاوی لێزمەو بەخوڕمان نەناردۆتە خوارەوە لە هەورانی گوشراو(١٤) تا پێی دەربێنین دانەویلەو گیاو(١٥) باخاتی پڕوچڕ(١٦) ٠

ئەمێنێتەوە ئەو ئەستێرە وردە گەڕۆکانەی کە لە ناوەندی «مریخ»و «مشتری»دان ، ئەوانیش بەرناکەوون ، وە بە ووتەی «شدادا» ئەچنە دەرەوە ، چونکە یەك ئەستێرەی توندوتۆڵی قایمی بەهێزنین وەك ئەستێرە گەڕۆکەکانیتر ، بەڵکو ٤٣٠ ئەستێرەی بکۆڵەن ، لەتەنشتیەکەوە ، وە گەڕۆکیشن وەك مریخو مشتری ٠

(وجعلنا سراجا وهاجا) وە ئایا دروستمان نەکردووە چرایەکی درەخشان وەك ڕۆژبێ ؟ جگە لەوەی کە جیهانتان بۆ ڕووناك ئەکاتەوە ، مایەی ژیانی خۆتانو ئاژاڵو دەغلودانو شینایيو باخاتیشتانە ، هەر وەك بە گەرمیی خۆی ، شێو تەڕیی هەڵئەمژێ ، لە دەریاو لە زەویی ، بۆ لای ژووروو ، وە ئەولای ژوورووە ، بەهۆی بای بارانەوە هەور ئەگوشێو بارانی لێئەهێنێتە خوارەوە ، وەکو ئەفەرموێ (وانزلنا من المعصرات) وە ئایا نەمانڕژاندۆتە خوارەوە ، بەهۆی بای باران یا هێزی کارەباوە ، کە هەور ئەگوشن(١) (ماء ثجاجا) بارانی لێزمەو بە خوڕ ؟ (لنخرج به) بۆ ئەوەی پێی دەربێنین لە زەویی (حبا ونباتا) دانەوێڵەو گیا ، بۆ خواردنی خۆتانو ئاژاڵتان (وجنات الفافا) وە باخاتی پڕوچڕو تێکەڵ ٠

واتە خوایەك ئەمەندە میهرەبان بێ لەگەڵ ئادەمیدا ، وە ئەم هەموو چاکەیەی لەگەڵ بکات ، وە ئەم هەموو نازو بەهرانەی بەسەرا بڕێژێ ، وە ئاسمانو زەویی بۆرام ، وە بەم جۆرە ، سەرپەرشتی خۆیو کاروباری بکات ، چۆن هەروا بەرەڵڵای ئەکاتو لێی ناپرسێتەوە ، وە پێغەمبەرێکی بۆ نانێرێ ، کە بانگی بکات بۆ خواشناسيو خواپەرستیی ، وە بۆ بڕواهێنان بە زیندووبوونەوەو ئەو شتانەی کە

(١) کەواتە «معصرات» اسمی فاعلەو بە مەعنا اسمی مفعولە وەك «غرفة مضیئة» کە بە مەعنا «مضاءة»نە ٠ بەڕاستی ئەم تەعبیرە زۆر علميو بەرزە ٠

إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ كَانَ مِيقَاتاً(١٧) يَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجاً(١٨) وَفُتِحَتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ أَبْوَاباً(١٩) وَسُيِّرَتِ الْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَاباً(٢٠)

بەڕاستی ڕۆژی جیاکردنەوە(ی چاك‌و خراپ) دانراوە بەکاتی کۆبوونەوە(١٧) ئەو ڕۆژەی کە فوو ئەکرێ بە کەڕەنادا ئنجا پۆل پۆل دێن (١٨) وە ئاسمان (لەهەموو لایەکەوە) کرایەوەو بوو بە دەرگا (١٩) وە کێوەکان خرانە ڕێ‌و بوون بەڕییگی ڕەوان (٢٠)

بە ژیریی‌و بیبر نازانرێن ، وەکو ئەفەرموێ (ان یوم الفصل) ڕۆژی دوایی کە ڕۆژی بڕیاردان‌و جیاکردنەوەی چاك‌و خراپە (کان میقاتا) دانراوە لە لایەن خواوە بۆ کاتی کۆبوونەوەی ئادەمیی ، تا هەموو کەسێك چاوی بە کردەوەی خۆی بکەوێ ، وە بەری هەوڵ‌و تەقەلای خۆی ببینێ (یوم ینفخ في الصور) ئەو ڕۆژەی کە فوو ئەکرێ بە کەڕەنادا ، وە هەرچی گیان‌لەبەر هەیە لەیەك کاتا زیندوو ئەبنەوە (فتأتون افواجا) ئنجا پۆل پۆل دێن بۆ دەشتی کۆبوونەوە «محشر» •

مەبەست لە فووکردن بە کەڕەنادا ، نیشاندانی گورجیی زیندووکردنەوەی ئادەمیی‌یە لە یەك کاتا ، چونکە بەپێی باوی ناو خۆمان ئەگەر بمانەوێ قوتابیی قوتابخانەیەك ، کوتوپڕ کۆ بکەینەوە ، زەنگیان بۆ لێ‌ئەدەین ، لەجیاتی ئەوەی کە یەکە یەکە بانگیان بکەین ، وە ئەگەر بمانەوێ سەرباز «عسکر»ی زۆرو بلاووپەراگەندەی شوێنێك کوتوپڕ کۆبکەینەوە ، بۆڕیە،یا کەڕەنایان بۆ لێ‌ئەدەین، ئنجا خوا ئەیەوێ بەم ئایەتە گورجیی زیندووکردنەوەی ڕۆژی دوایی‌مان تێ‌بگەیەنێ بە وێنەی شتێکی وا کە لە جیهانا چاومان پێ‌ی‌کەوتبێ ، تا باش بچێتە دڵمانەوە ، پێویستە لە سەرمان بەمە بڕوابکەین ، بەڵام چۆنێتی‌یەکەی تەنیا هەر خوا خۆی ئەیزانێ ، دروست نی‌یە ووردکردنەوەو قووڵ‌کردنەوەی ئەم جۆرە شتانەی کە هەر لە خواوە دیارن •

(وفتحت السماء) وە ئاسمان ئەکرێتەوە (فکانت ابوابا) وە هەمووی ئەبێ بە دەرگاو کوڵان ، واتە لەو ڕۆژەدا دەستوورو سامانی ئاسمان تێك‌ئەچێ ، وە هێزی کێشندە نامێنێ ، وە ئەم ڕێك‌و پێکی‌یەی کە هەیە لە ئەستێرەکانا تێك ئەچێ ، ئنجا ئەو حەلە ، نە ئەرز بە ئەرزیی‌و نە ئاسمان بە بەرزیی ئەمێنێ •

(وسیرت الجبال) وە کێوەکان ئەترازێنرێن لە جێی خۆیان (فکانت سرابا)ئنجا

إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَاداً(٢١) لِلطَّاغِينَ مَآباً(٢٢) لَابِثِينَ فِيهَا أَحْقَاباً(٢٣) لَا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْداً وَلَا شَرَاباً(٢٤) إِلَّا حَمِيماً وَغَسَّاقاً(٢٥) جَزَاءً وِفَاقاً(٢٦) إِنَّهُمْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ حِسَاباً(٢٧) وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كِذَّاباً(٢٨)

**بە ڕاستی دۆزەخ چاوەڕوانی بێبڕوایانە(٢١)وە جێگای یاخیيانە (٢٢)تیا ئەمێننەوە هەزاران ساڵ(٢٣) تیا ناچەژن نە ساردیی و فێنکیی و نەخواردنەوە(٢٤) مەگەر ئاوی کوڵ و کێم و زووخ(٢٥) پاداش ئەدرێنەوە بە پێی کردەوەیان(٢٦) چونکە ئەوان بەتەمای لێپرسینەوە نەبوون(٢٧) وە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ ئەزانی ، چۆن بەدرۆ زانینێك(٢٨)**

**ئەبن بە ڕیگی ڕەوانو ئەچن بە حەوادا ، واتە هەروەك ڕیگی ڕەوان لە دوورەوە وورشەی دێو بە ئاو ئەبینرێ ، کەچی ئاوییش نییە ، چیاکانیش لە دوورەوە وەك چیا ئەبینرێن کەچی بە چیاییش نەماوون ، بەڵکو بوون بە تۆز •**

⊙ ⊙ ⊙

**لەدوای باسی فووکردن بەکەڕەنادا و کۆکردنەوەی ئادەمیی لەدەشتی کۆبوونەوە «محشر»دا ، ئنجا باسی سەرەنجامی خراپان و چاکان ئەکات ئەفەرموێ (ان جهنم کانت مرصادا) دۆزەخ چاوەڕوانی بێبڕوایانە (للطاغين مآبا) جێگای ئەو کەسانەیە کە لە جیهانا سەرکێش و یاخیبوون لە خوا (لابثين فيها احقابا) هەزاران ساڵ تیائەمێننەوە (لايذوقون فيها بردا) تیا ناچەژن نە فێنکیی و حەسانەوە (ولا شرابا) وە نە شتێك کە بخورێتەوەو تینوێتیی بشکێنێ (الا حميما وغساقا) مەگەر ئاوی لە کوڵ و کێم و زووخێك نەبێ کە لە ئەندامی دۆزەخییان ئەتکێ (جزاء وفاقا) تۆڵە ئەدرێنەوە بە تۆڵەیەك کە سەربەسەری کردەوەکانیانە •**

**ئنجا باسی هێندێك لە هۆی چوونە دۆزەخیان ئەکات ئەفەرموێ ئەم سزایانەی کە ئەدرێن ، وە ئەم تۆڵانەی کە لێیان ئەسەندرێ لەبەرئەوەیە کە (انهم کانوا لا يرجون حسابا) ئەوان بە هیوای پرسینەوەی ڕۆژی دوایی نەبوون ، وە هیچ ترسێکی ئەو ڕۆژەیان نەبووە ، لەبەر ئەوە خۆیان لە هیچ گوناحێك نەگێراوەتەوە (وکذبوا بآياتنا کذابا) وە نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ ئەزانی ، چۆن بەدرۆ زانینێك ، واتە ئەو نیشانانەی کە ئەمان نارد لەسەر ڕاستی پێغەمبەرەکەمان ، ئەوان بڕوایان**

وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ كِتَاباً(٢٩) فَذُوقُوا ، فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلاَّ عَذَاباً(٣٠) إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازاً(٣١) حَدَائِقَ وَأَعْنَاباً(٣٢) وَكَوَاعِبَ أَتْرَاباً(٣٣) وَكَأْساً دِهَاقاً(٣٤) لاَيَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلاَ كِذَّاباً(٣٥) جَزَاءً مِنْ رَبِّكَ عَطَاءً حِسَاباً:(٣٦) رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَنِ ،لاَيَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَاباً(٣٧)

**لەکاتێکا کە هەموو شتێکمان هەڵژماردووە (لەسەریان) بە نووسیین(٢٩) ئنجا بچەژن (سزای خۆتان) هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێ(٣٠) بێگومانجێی پیرۆزو بەهرەمەندیی هەیە بۆ پارێزگاران (٣١) (لە) باخاتو هەموو جۆرە ترێیەك(٣٢) وە کچانی مەمك کردووی هاوتەمەن(٣٣) وە پیاڵەی پڕ لە شەراب(٣٤) قسەی بێهوودەو درۆی تیا نابیەن(٣٥)(پاداش ئەدرێنەوە بە)پاداشتێکیتەواو لەلایەن پەروەردگاری تۆوە(٣٦) پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویی‌و ئەوی لە ناویانان بەخشندەو میهرەبانە کەس تەوانای تکا کردنی نییە(٣٧)**

**پێنەئەکرد ، لە کاتێکا کە (وکل شيء أحصيناه كتابا) هەموو شتێکمان هەڵژماردووە بە نووسیین ، بە ڕەنگێکی وا کە هیچ شتێکمان لێ وون نەبێ لە کردەوەی ئەوان ، ئنجا لە ڕووی هەڕەشەوە پێیان ئەووترێ (فذوقوا فلن نزيدكم الا عذابا) سزای خۆتان بچەژن ، ئەمرۆ هیچتان بۆ زیاد ناکەین ئازارو سزا نەبێ •**

⊙ ⊙ ⊙

**لەدوای باسی ئازاری بێبڕوایان ، ئنجا باسی پاداشیچاکان ئەکات،ئەفەرموێ (ان للمتقين مفازا) بێگومان جێی پیرۆزو بەهرەمەندیی هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان ئەپارێزن لەگوناحو خراپە (حدائق واعنابا) لەباخاتو هەموو جۆرە ترێیەك (وكواعب اترابا)و کچانی تازە مەمك‌کردووی هاوتەمەن (وكاسادهاقا)و پیاڵەی پڕ لەشەراب ، بەڵام شەرابێکی وانا کە سەرخۆشیی بدات ، یا ببێ بەمایەی چەقەو ئاژاوەو ناکۆکی ، وەکو ئەفەرموێ (لايسمعون فيها لغوا ولاكذابا) قسەی هیچ‌و پوچ‌و یەکتری بە درۆخستنەوەی تیا نابیەن • پاداشی چاکان ئەدرێتەوە (جزاء من ربك عطاء حسابا) بە پاداشێکی گەورەو تەواو لەلایەن پەروەردگاری تۆوە (رب السماوات والارض ومابينهما)کە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەو شتانەیە کە لە ناویانان (الرحمن) ئەو خوایەی کە بەخشندەو میهرەبانە ، وە لەگەڵ ئەو هەموو میهرەبانیی‌یەشیا (لايملكون منه خطابا) کەس لە دانشتووانی ئاسمانانو**

يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلائِكَةُ صَفًّا ، لا يَتَكَلَّمُونَ إِلاَّ مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمنُ وَقَالَ صَوَاباً(٣٨) ذَلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ ، فَمَنْ شَاءَ اتَّخَذَ إِلَى رَبِّهِ مَآباً(٣٩) إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَاباً قَرِيباً. يَوْمَ يَنْظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ،

---

لە رۆژێکا کە جبریلو فریشــتە بەڕیز ئەوێستن ، کەسیان قسە ناکەن مەگەر ئەوی کە خوا ڕێی بداتو قسەی بەڕێوجێ بکات(٣٨) ئەو رۆژە ڕاستو بێگومانە ئنجا هەرکەسێك ئارەزوو بکــات ڕێگای گەڕانەوە ئەگرێ بۆ لای خوای خۆی(٣٩) ئێمە ئێوەمان ترساند بە سزایەکی نزیك ، لە ڕۆژێــکی وادا کە مەردوم ئەبینێ (پاداشــی) ئەو کردەوانەی کە پێشەکی بەدەستی خۆی ناردوونی

---

زەوی لەو ڕۆژە دایاراو تەواناى هیچ جۆرە تکا «شفاعة»یەکیان نیەیە لای خوا ٠

ئنجا ئەمە دووبارەیات ئەکاتەوە ئەفەرموێ (یوم یقوم الروح والملائكة صفا) لە ڕۆژێکا کە جبریلو فریشتە بەڕیز ڕائەوێستن (لایتكلمون) کەسیان ناتوانن تکا بکەن (الا من اذن له الرحمن) مەگەر کەسێك کە خوا خۆی ڕێی تکای بدات ٠ ڕێی تکاش نادات مەگەر بە یەکێك کە خوا خۆی بزانێ تکاکەی گیرا ئەکرێ ، وەکــوو ئەفەرموێ : (وقال صوابا) وە قسەی بەڕێو جێ بکات ٠

لەپاش ئەوەی کە فەرمووی ڕۆژی دوایی ڕۆژی جیابوونەوەی چاكو خراپە،وە باسی کرد ، کە چۆن جیهانی تیا وێران ئەبێو مردووی تیا زیندوو ئەبێتەوە ، وە پیاوخراپی بێبــڕوایان کۆ ئەکرێنــەوە لە دۆزەخــاو تۆلە ئــەدرێن ، وە چاکانو خاوەن بڕوایان بەهرەمەند ئەبن لە بەهەشتا ، وە یەك بەیەك ناوی بەهرەکانی برد کە لەو ڕۆژەدا پێی ئەگەن ، ئنجا بۆ بەهێزکردنەوەی ئەمــانەو بێگومانیــان ، فەرمووی (ذلك اليوم الحق) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ڕاستو بێگومانە (فمن شاء اتخذ الى ربه مآبا) ئنجــا هەرکەسێك بیەوێ ، ڕێگــای چــاکیی ئەگرێتــە بــەر بۆلای پەروەردگاری خۆی ٠

دووبارە هاتەوە سەر هەڕەشەکردن لەبێ بڕوایان فەرمووی (انا انذرناكم عذابا قريبا) ئێمە ئێوەمان ترساند بە سزایــەکی نزیك کە لە کاتی مردنتــانەوە دەست پێئەکات تا (یوم ينظر المرء ما قدمت يداه)

وَيَقُولُ الْكَافِرُ : يَالَيْتَنِي كُنْتُ تُرَاباً(٤٠)

وه بێبڕوا (لەو ڕۆژەدا) ئەڵێ : خۆزگە گڵ بوومایە (نەك ئادەمیی) (٤٠) •

ڕۆژێك كە مەردومبەچاوی خۆی ئەبینێ ئەو كردەوانەی كە لە جیهانا كردوونی ، وە لە پێش خۆیا ناردوونی ئنجا لەو ڕۆژەدا (ویقول الكافر) بێبڕوا لەبەر ئازارو سزای خۆی ، وە لەبەر ئەو ترسو بیمەی كە لە بەریەتی ئەڵێ : (یا لیتنی كنت ترابا) كاشكێ گڵ بوومایـەو پێیان پیابنامایە ، لەجیاتی ئەوەی كە ئادەمیی بووم‌و ڕۆژم بەم ڕۆژە گەیشت •

# سوورەی « نازعات »ە

مەککی‌یە ، ٤٦ ئایەتە ، ١٧٠ ووتەیە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لە سەرەتای سوورەی «قەلەم»ەوە ، باسمان کرد کە خوا لەزۆرشوێن لەقورئانا سوێند ئەخوات بەگەلێ شت لە دروستکراوانی خۆی ، بۆ ئاگادار کردنەوەی مەردووم لەسەر کەلکی ئەو سوێندپێخوراوانە ، وە لەوێ باسی هێندێك لە فەلسەفەی ئەم سوێندانەمان کرد •

شێخ محمد عبده لە فەلسەفەی ئەم سوێندانەدا ئەفەرموێ : لەپێش ئیسلاما ئایینی وا بووە کە ملتەکەی وای‌زانیوە ، کە ئەم جیهانە ، بەڕووناکیی‌و تارییکیی‌و هەموو شتێکی تریەوە ، جیهانێکی مادی‌یە ، خوا تەنها بۆ ئەوەی دروست کردووە ، کە ببێ بە زیندانی جەستەو ، تەڵەی گیان ، وە هەرکەسێك ڕەزای خوای بوێ ، ئەبێ پشتی تێبکاتو خۆی لێ دوور بخاتەوە ، وە جەستەی خۆی بخاتە ژێر باری ئازارو سزاو ناخۆشیی‌و ریازەتەوە ، وە چاو بقووچێنێ لەم جیهانە پیسەی کە تیایەتی ، وە تەماشای نەکات مەگەر بە چاوێکی پڕ لە خەشم‌و قینەوە ، ئنجا خوا سوێند ئەخوات بە گەلێ شت لەم جیهانە ، بۆ ئەوەی نیشان بدات کە خوا ئەمانەی بەبێ هوودە دروست نەکردووە ، وە ئەیەوێ لە ئادەمیی ، کە هەمیشە بە چاوی ووردبوونەوەو پەند تەماشایان بکەن ، تا لە قازانج‌و سوودیان بەهرەمەند ببن •

ئنجا خوا لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە ، سوێند ئەخوات بە هێندێ لە دروست کراوانی خۆی ، بۆ ئەوەی نیشانمان بدات ، کە ئەمانە زۆر بەکەڵکن ، وە هەریەکە دەستوورو بارێکی تایبەتیی زۆر ڕێکوپێکی هەیە،وە هەموو ڕامی ژێر دەستی‌خوان ، وە لە فەرمانی دەرناچن .

سُورَةَ النّازِعَاتْ

بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحْيم

وَالنَّازِعَاتِ غَرْقاً(١) وَالنَّاشِطَاتِ نشْطاً(٢) وَالسَّابِحَاتِ سَبْحاً(٣) فَالسَّابِقَاتِ سَبْقاً(٤) فَالْمُدَّبِرَاتِ أَمْراً(٥)

## سوورەی « نازعات »ە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بەو (ئەستێر)انەی کە بە گورجیی ئەسووڕێنەوە(١) وە بەوانەی کە لە کەلوویەکەوە ئەچن بۆ کەلوویەکی تر(٢) وە بەوانەی کە(لەحەوادا) مەلە ئەکەن(٣) وە بەوانەی کە (لە چەرخەخواردنا) پێش یەکتریی ئەکەوون(٤) وە بەوانەی کە تەدبیری هێندێ لەکاروباری جیهان ئەکەن (واتە سوێند بەمانە ئەوی بەڵێنتان پێدراوە دێتە دیی)(٥) •

---

وە ئەفەرموێ (والنازعات غرقا) سوێند بەو ئەستێرانەی‌کە بە درێژایی ساڵ دێن‌و ئەڕۆن‌و ئەسووڕێنەوە لەسەر چەمەرەی خۆیان ، وە لەساتێکا هەزاران میل ئەبڕن (والناشطات نشطا) وە بەو ئەستێرانەی کە لە کەلوو «برج»یەکەوە ئەچن بۆ کەلوویەکی‌تر ، وە هەر شەوەی لەلایەکەوە هەڵدێن ، کە مەبەس لەم ئەستێرانە هەر ئەمانەن کە ئەفەرموێ (والسابحات سبحا) وە بەوئەستێرانەی کە لە حەوادا مەلە ئەکەن وەك مانگ‌و ئەستێرە گەڕۆکەکان ، کە مەبەس لەمانەش هەر ئەم ئەستێرانەن کە ئەفەرموێ (فالسابقات سبقا) وە بەو ئەستێرانەی کە لە گەڕانیانا بە دەوری ئەوەی کە ئەگەڕێن ، هێندێکیان پێش هێندێکیان ئەکەوون ، وەك مانگ‌و زەویی کە یەکەمیان بە مانگێك چەرخەیەکی زەوی ئەدات ، وە دووهەمیان بە ساڵێك چەرخەیەکی ڕۆژ ئەدات ، وە ئەم ئەستێرانەی کە لەیەك پێشی ئەکەوون هەر ئەو ئەستێرانەن کە تەدبیری هێندێك لە کاروباری ئەم جیهانە ئەکەن کە ئەفەرموێ (فالمدبرات امرا) وە بەو ئەستێرانەی کە تدبیری هێندێ لە کاروباری جیهان ئەکەن، وەك مانگ کە گەڕان‌و پێشکەوتنی لەسەر زەویی ، مایەی‌پەیدابوونی دوانزە مانگەو هاتن‌و کشانەوە «مد و جزر»ی دەریایە ، وە دەستێکیشی هەیە لە هەورو باران‌و خۆشکردنەوەیانا ، وە مانگەشەوەکەشی زۆر بەکەڵکە بۆ ئادەمیی‌و هەموو گیان‌لەبەرێکی‌تر ، وە هەم وەکو ڕۆژ کە پێشکەوتنی لەکەلووەکانیا ـ وەك

فَأَرَاهُ الْآيَةَ الْكُبْرَى (٢٠) فَكَذَّبَ وَعَصَى (٢١) ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَى (٢٢) فَحَشَرَ فَنَادَى (٢٣) فَقَالَ: أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى (٢٤)

ئنجا نیشانە گەورەکەی نیشاندا(٢٠) کەچی بە درۆی زانیو سەرپێچیی‌کرد(٢١) لەپاشا پشتی هەلکردو رۆی(٢٢) ئنجا (جادووگەرانی) کۆکردەوەو بانگی کردنو(٢٣) ووتی : من خوای هەرە گەورەتانم(٢٤)

کاتێك کە مووسا چوو بۆ لای فیرعەونو ئەم قسانەی پێووت ، وە ئەویش بروای پێنەهێنا (فاراه الآية الكبرى) ئنجا نیشانەی گەورە لەسەر پێغەمبەرێتی خۆی نیشاندا وەك بوونی داردەستەکەی بێ بە هەژدیها( فكذب وعصى) وە ئەویش قسەکانی مووسای بە درۆ زانیو لێی یاخی بوو (ثم أدبر يسعى) لە پاشا پشتی هەلکردو دەستی کرد بە هەوولدان بۆ تێکدانی کاروباری مووسا (فحشر فنادى) ئنجا جادووگەرەکانی کۆکردەوەو راوێستا لە ناویاناو بانگی‌کردنو (فقال انا ربكم الاعلى) ووتی من خوای هەرە بەرزو گەورەی ئێوەم •

ئەم یاخی‌یە گومرایە ، ئەم کەلە پەتر(١)ەی کرد ، بەهۆی نادانییو ناپاکییو بێبروایی گەلەکەیەوە ، هیچ شتێك ئەم یاخی‌یانە ، لەپەت بەرنادات ، نادانیو ناپاکیو بێبروایی گەل نەبێ ، ئەم یاخی‌یانە لەناو هەموو گەلێکا تاقە یەکێکن ، هیچ جۆرە هێزو دەسەلاتێکیان نی‌یە ، هێزو دەسەلاتەکەیان هەر گەلە ناپاکەکەیانە ، پشتی بۆ دائەنەوێنن تا سواریان ئەبێ ، ملی بۆ شۆڕ ئەکەن تا پەتیان ئەکات ، سەری بۆ دائەنەوێنن تا بەرزی ئەکەنەوە ، دەست لەهەموو مافێکی خۆیان هەل‌ئەگرن تا بە تەواوی یاخیو بەلەسەی ئەکەن •

گەل ئەگەر داناو خواناس بێ هەموو یەکێکی ، خۆی بە هاوتای ئەو یاخی‌یە ئەزانێ ، هەرگیز ناگونجێ تاقە یەکێك بەهێزترو بە دەسەلاتتر بێ لە گەلێك • ناگونجێ یەکێك یاخی ببێ لەناو گەلێکی مەردی داناو خوا پەرستا • لەنا گەلێکی خوا ناسی خاوەن بیرو بروادا ، نابێ گەلێك سەردانەوێنێ بۆ یاخی‌یەك کە نە قازانجی بەدەست بێو نە زیان ، کەوابوو هیچ شتێك فیرعەونی یاخی نەکرد ناپاکییو بێبروایی گەلەکەی نەبێ ، وە کەس ئەم کەلە پەترەی پێ نەکرد گەلەکەی خۆی نەبێ •

دوای ئەم کەلەپەترەی کە کردیی ئنجا غیرتی خوا هاتە جۆشو خرۆش ، وەکو

(١) کەلەپەتر : بە قسەیەکی هەلەی زۆر گەورەی ناقۆلا ئەووترێ •

فَأَخَذَهُ اللهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَى (٢٥) إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِمَنْ يَخْشَى (٢٦) أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاءُ؟ بَنَاهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا، وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا (٣٠)

**ئنجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان (٢٥) بەڕاستی لەم داستانەدا پەند هەیە بۆ کەسێك کە لە خوا بترسێ (٢٦) ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە یا ئاسمان ؟ دروستی کرد (٢٧) باڵای بەرزکردەوەو ڕێکی خست (٢٨) وە شەوی ئەوی تارییک کردو دەری خست (رووناکیی) ڕۆژی (٢٩) لەپاشا زەویی ڕاخست(٣٠)**

**ئەفەرموێ (فاخذه الله نكال الاخرة والاولى )ئنجا خوا گرتی ، وە سزای دا بە دوو سزا،یەکەم لە جیهانا بە خنکاندنی لەئاوا ، دووهەم لە ڕۆژی دوایی‌دا بەسووتاندنی لە دۆزەخا (ان في ذلك لعبرة لمن يخشى) لەم باسی فیرعەون‌و مووسـایەدا ، پەندو ئامۆژگاریی هەیە بۆ کەسێك کە لـە خوا بترسێ ، واتە بۆ یەکێك کە ژییـر بێ‌و بییر بکاتەوە لە ئەنجامی کاروبار ، وە پەندو ئامۆژگاریی وەرگرێ ، لە بەسەرهاتی ڕابوردووان ، بەڵام ئەوانەی کە لە خوا ناترسـن‌و تێ‌ناگەن لەم جـۆرە قسـانە ، پەند وەرناگرن تا لووت‌و بزووت تووش نەبن ٠**

**دوای باسی یاخی بوونی فیرعەون ، ئنجا ئەگـەڕێتەوە سەر بێ بـڕواکانی عرەب کە بە دەسەڵاتی خۆیان ئەنازن ، پێ‌یان ئەفەرموێ (أأنتم أشد خلقا أم السماء) ئایا دروست کردنی ئێوە گرانترە ، یا دروست کردنی ئاسمان ، ئنجا باسی دروست کردنی ئاسمانمان بۆ ئەکات ئەفەرموێ (بناها) دروستی کرد ، بـەم ڕەنگە (رفـع سمكها) باڵای بەرزکردەوە (فسواها) ئنجا ڕێکی خست ، بەم جۆرە کە هەر یەکەی لەسەر چەمەرە «مدار»ی خۆی ڕاگرت بەهۆی هێزی کێشندەوە ، وە هەر یەکـەی خستە گەڕ بەجۆرێکی تایبەتی (واغطش ليلها) وە شەوی ئاسمانی تارییك کرد بە ئاوابوونی ڕۆژی (واخرج ضحاها) وە ڕووناکیی ڕۆژی دەرخست بە هەڵاتنی خۆری، واتە شەوی تاریك کردو ڕۆژی ڕووناك کرد ٠**

**بەم هاتووچۆی شەوو ڕۆژە بە هەزاران ساڵ لەسەریەك ، ئنجا زەویی وای لێ‌هات کە مـەردوم‌و گیانلەبەر لەسـەری بژیـێن بۆیە فەرمـووی (والارض بعد ذلك دحاها) لەپـاش دروست‌کردنی ئاسـمان بە هەزاران هەزار ساڵ ئنجـا زەویی**

وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ ، وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى(٤٠) فَإِنَّ الجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى(٤١) يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ : أَيَّانَ مُرْسَاهَا؟(٤٢) فِيمَ أَنْتَ مِنْ ذِكْرَاهَا!(٤٣) إِلَى رَبِّكَ مُنْتَهَاهَا(٤٤) إِنَّمَا أَنْتَ مُنْذِرُ مَنْ يَخْشَاهَا(٤٥)

---

وە ئەو کەسەی کە ترسابێ لەگەورەیی پەروەردگاریو، جڵەوگیریی نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزووی خراپە(٤٠) بێگومان بەهەشت جێگایەتی (٤١) پرسیارت لێئەکەن لە ڕۆژی دوایی ، کەی ئەبێ ؟(٤٢) تۆ چییت داوە لە بیر لێکردنەوەی !(٤٣) زانینی ئەوە هەرلای خوایە(٤٤) تۆهەر ترسێنەری کەسێکییت کە (لەباریابێ) لەوڕۆژە بترسێ(٤٥)

---

دۆزەخ جێگایـەتی (وأما من خاف مقام ربه) وە ئەو کەسەی کە ترسـابێ لە پایەو شکۆهی پەروەردگاری خۆی (ونهي النفس عن الهوى) وە جڵەوگیریی نەفسی خۆی کردبێ لە ئارەزووی خراپە (فان الجنة هي المأوى) بێگومان بەهەشت جێگایەتی •

بەڕاستی ئارەزوو سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە ، هەروەك ترس لە خوا ، سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە ، جا لەبەر ئەوە ئەم دوانەی لێرەدا کۆکردەوە لەتاقە یەك ئایەتا •

⊙ ⊙ ⊙

هەرچەند پێغەمبـەر ئایەتێکی بخوێنـدایەتەوە ، لە بـاسی ڕۆژی دواییدا ، بێبڕواکان لێیـان ئەپرسیی : ئەم ڕۆژە کەی ئەبێ ؟ پێغەمبەریش بـە دڵ ئاواتی ئەخواست کە بییزانیایەو پێی بووتنایە ، وەکو ئەفەرموێ (يسألونك عن الساعة) پرسیارت لێئـەکەن لە ڕۆژی دوایی (ايان مرساها) کەی پەیدا ئەبێ ؟ ئنجـا خوا جڵەوگیریی پێغەمبەر ئەکات لە ئاوات خواستن بۆ شتێك کە ئاوات بۆ خواستنی بێکەڵكبێ ، ئەفەرموێ (فيم انت من ذكراها) تۆ چییتداوە لە زانینی ئەوڕۆژە ؟ (الى ربك منتهاها) هەر بۆلای پەروەردگاری تۆیە سەرەنجامی ئەو ڕۆژە ، واتە هەر خوا خۆی ئەزانێ ئەو ڕۆژە کەی ئەبێ ، وە ئەمە ئیشی تۆ نییە ، بەڵکو ئیشی تۆ هەر ئامۆژگاریی مەردومە ، وەکو ئەفەرموێ (انما انت منذر من يخشاها) تۆ هەر ئامۆژگارو ترسێنەری کەسێکی ، کە لەباریا بێ لەو ڕۆژە بترسێ ، وە کاری تۆ هەر

كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا(٤٦)

**بێبڕواكان كە ئەو ڕۆژە ئەبینن وا ئەزانن كە نەماونەتەوە ئێوارێیەك یا چێشتەنگاوێكی نەبێ(٤٦) .**

**ئاگادار كردنەوەی مەردومە بۆ خۆئامادە كردن بۆ ئەو ڕۆژە ، بەڵام ئەم بێبڕوایانە تێناگەن ، وە قسەی تۆ ناچێتە دڵیانەوە ، كەوابوو دەست بەرداریان بە تا ڕۆژی خۆی ، ئنجا كە دوو چاری ئەو ڕۆژە بوون ، چ لەبەر پەرێشانی خۆیانو ، چ لەبەر ئەوەی كە لە ناكـاو تووشی ئەو ڕۆژە ئەبن ، هەموو شتێكیان بیر ئەچێتـەوە ، وە وا ئەزانن لەو ڕۆژەوە كە هاتوونەتە جیهانەوە تا ئەو ساتەی كە زیندووكراونەتەوە چەند سەعاتێكە ، وەكوو ئەفەرموێ (كانهم یوم یرونها) بێبڕواكان لەكاتێكا كە ڕۆژی دوایی ئەبینـن ، وائەزانن كە (لم یلبثوا) نەماونەتەوە لـە ڕۆژی لەدایك بوونیانەوە تا ئەو ڕۆژی زیندووبوونەوەیان (الاعشیة او ضحاها) مەگەر ئێوارێیەك یا چێشتەنگاوێكی .**

كَلَّا ! إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ(١١) فَمَنْ شَاءَ ذَكَرَهُ(١٢)

وامەکە ! بێگومـان ئەو ڕێنموونی‌یانـە (ی کە بـۆت هاتـووە) بێـدارکەرەوە (ی ئادەمی)یە(١١) ئنجـا ئەو کەسەی ئارەزوو بکات یادی خوا ئـەکات(١٢)

بەڵام ئەو دەوڵەمەنـدە دەستدارانە کە خۆیان بێ‌نیـاز ئەگرن ، زۆریـان بێ‌بڕواو کەودەنن ، چاویان هەر لەقازانجو سوودی دنیای خۆیانە ، پێویست نی‌یە، ئەوەندە هەوڵیان لەگەڵ بدەیتو خۆتیان پێوە خەریک بکەیت •

واتە ئەی پێغەمبەر ! هەرگیـز دیمەن پەرست مەبە ، ئەنـدازە «مقیاس»ی ئادەمـێتی لـەلات زیـرەکیو وریـاییو تێـگەیشتن بێ ، نـەک دەستداریـیو دەوڵەمەندیی ، کەوابوو هەرچەند ئاوڕت دایەوە ، هەر ئاوڕ لە دڵی زیندووی ئاگادار بدەرەوە ، نەکـەیت دەست لەمانە هەڵگرییتو خـۆت خەریکبکـەیت بە دەوڵەمەندیخاوەن پایەو ناوەوە ، چونکە ئەوان وریاو زیندوون ، بەڵام ئەمان کەودەنو دڵمردوون ، کەوابوو لەم کردەوەی پێشووت ، پەشیمان بەرەوە ، وە بۆ ئەوەی بێ‌بڕوایەکی کەودەن مسڵمان بکەیت دەست لە مسڵمانێکی زیرەکی وریا ، هەڵمەگرە ، وەکو ئەفەرموێ (کـلا) جارێکی تر وا مەکە ، وە ئەوەنـدە لەگـەڵ دەوڵەمەندی یاخی‌دا خۆت خەریک مەکە ، چونکە دەستووری ئیسلامو بڕواکردن بە خوا لەگەڵ هەموو سروشتێکا تێکەڵە ، وەرێکی ، هەموو ژیرییو بیرێکی پاکە ، هیچی ناوێ ، تەنها ئامۆژگارییو بیر خستنەوەیەک نەبێ ، ئنجا هەرکەسێک بڕوای پێ‌نەکات ، وەک بڕوا بە سروشتی خۆی نەکاتو گوێ بۆ دەنگی دڵو دەروونی خۆی نەگرێ وایـە ، کەوابوو تۆ هەر ئەمەنـدەت لەسەرە کە فەرمانی خوا بـە مەردوم بگەیەنییتو هیچی‌تر ، بەڵام ئەگەر بتەوێ ، زۆردارو ستەمکار بپچڕییتەوە لە زۆرو ستەمیان ، وە بە زۆر ، بڕوا بخەیتە دڵیانەوە ، وە بیان‌هێنییتە سەر ڕێی ڕاست ، ئەوە بـە دەست تۆ نی‌یە ، وەکـو ئەفەرموێ (انهـا) بێگومان ئـەو ڕێنموونییو ئامۆژگاری‌یانەی کە لە نامەی پێغەمبەرانا هەیە ، کە لە هەموویان گەورەتر قورئانە (تذکرة) بیرخەرەوەی شتێکە کە لە سروشتی ئادەمیی‌دا هەیە ، لەبەرئەوەی کە لەناو ئەو ئامۆژگاری‌یانەدا ، بڕواکردن بە خوا ، بنیاتو بناغەی هەموو ڕێنموونی‌یەکە، بۆیە بەتایبەتیی فەرمووی (فمن شاء ذکره) ئنجا هەرکەسێک ئارەزوو ئەکات با ناوی خوا بیاتو بیناسێ •

ئنجا ئەفەرموێ ئەو ڕێنموونییو ئامۆژگاری‌یەی کە لە نامەی پێغەمبەرانا

فِي صُحُفٍ مُكَرَّمَةٍ(١٣) مَرْفُوعَةٍ مُطَهَّرَةٍ(١٤) بِأَيْدِي سَفَرَةٍ(١٥)
كِرَامٍ بَرَرَةٍ(١٦) قُتِلَ ٱلْإِنسَانُ ، مَا أَكْفَرَهُ!(١٧) مِنْ أَيِّ شَيْءٍ
خَلَقَهُ؟(١٨) مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ(١٩)

---

(کە ئەو ڕێنموونی‌یانەش نووسراونەتەوە) لە چەند پەڕەیەکی بەنرخی(١٣) پایە بڵندی پاك(١٤) کە بەدەست نوێنەرانی(١٥) گەورەی خێرخواوەن(١٦) بە کوشت چێ ئادەمیی ، چەند سپڵەیە !(١٧) (بیر ناکاتەوە بزانێ کە) خوا لە چی دروستی کردووە ؟(١٨) لە دڵۆپێك ئاو دروستی کردووەو ڕێکی‌خستووە(١٩)

---

هەیە ــ کە جوانترو گەورەترییەیان قورئانە ــ نووسراونەتەوە (في صحف) لە چەند پەڕەیەکی (مکرمة) گەورەی (مرفوعة) بڵند پایەی (مطهرة) پاك لە هەموو خراپیی‌و ناتەواویی (بایدي سفرة) بە دەست چەند نوێنەرو ڕەوانەکراوێکەوەن ــ وەك پێغەمبەران بێ ــ کە (کرام بررة) گەورەو خێرخواهن بۆ ئادەمیی ، وە هەمیشە فەرمووده‌و فەرمایشی خوایان پێ‌ئەگەیەنن ٠

لەدوای گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە پچووکە لە سەری سوورەتەکەوە ، وە دەرهێنانی ئەو دەستوورە گرنگە لێی ، ئنجا بەم ئادەمی‌یە دڵڕەقە ئەفەرموێ ــ کە وا بە دارایی ئەنازێ ، وە خۆی بێ‌نیاز ئەگرێ لە ئایینی خوا ــ : (قتل الانسان) بە کوشتچێ ئادەمیی‌و نەژیی (ما اکفره) چەند نا سوپاس‌و پێ‌نەزانە ، لەگەڵ ئەم هەموو چاکەیەی کە خوا لەگەڵیا ئەکات ، لە ڕۆژی هاتنە جیهانی‌یەوە تا ڕۆژی مردن‌و زیندووبوونەوەی ، وە ئەم هەموو بەخششەی کە بەسەریا ئەڕێژێ ، کەچی پێی نازانێ‌و سوپاسی ناکا ، بەڵکو هەر ناشی‌ناسێ ، وە ئەگەر جارێك باسی خوای بۆ بکرێ‌و بیری بخرێتەوە ، گوێی ناداتێ ، نابێ نەختێك لە سروشتی خۆی وورد ببێتەوەو بیری لێ‌بکاتەوە تا بزانێ (من اي شيء خلقه) خوا لە چی دروستی کردووە؟ ئنجا ئەفەرموێ (من نطفة خلقه) لە دڵۆپێك ئاو دروستی کردووە (فقدره) ئنجا بە ئەندازە ئامادەو ڕێکی خستووە ، بەم ڕەنگە بناغەی داڕشتووە لەو دڵۆپە ئاوە ، لە ماوەیەکی تایبەتی‌دا ، وە هەر ئەندامەی ، هێزێکی تایبەتی خۆی داوەتێ ، بە ڕەنگێکی وا کە بتوانێ ئەو ئەندامەی پێ‌هەڵسووڕێنێ ، لەو کاروبارەی کە بۆی دروستکراوە ، لەپاشا ئنجا ژیریی‌و بیری داوەتێ کە ببێ بە جڵەوکێشی ئەو هێزو تەوانایی‌یە ، وە ڕێگای چاك‌و خراپی بۆ ڕووناك ، وە لەیەك بۆی جیاکردۆتەوە ،

يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ (٣٤) وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ (٣٥) وَصَاحِبَتِهِ ، وَبَنِيهِ (٣٦) لِكُلِّ امْرِءٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ : (٣٧) وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ (٣٨) ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ (٣٩) وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ (٤٠) تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ (٤١)

---

ئەو ڕۆژەی کە مەردوم گوریز ئەکات لە برای(٣٤) و دایکی و باوکی(٣٥) و ژنی و کوڕانی(٣٦) هەموو یەکێك لەوان لەو ڕۆژەدا کارێکی وای هەیە، کە سەر کەسی تری نەپەرژێ :(٣٧) زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا ڕۆشنن(٣٨) دەم بە پێکەنین و شادمانن(٣٩) وە زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا ، تەپوتۆزیان بەسەرەوەیە(٤٠) لە داماوییدا ڕەش داگیرساوون(٤١)

---

لەبەر ئەوە خوا ناوی ڕۆژی دوایی برد بە «صاخة» واتە کاتێك کە ڕۆژی دوایی هات ، وە دەستووری جیهان تێکچوو ، وە ڕۆژو مانگ و ئەستێرەو زەویی هەڵوەرین ، وە شەوو ڕۆژ نەما ، ئەو حەلە کەس ئاگای لەکەس نامێنێ ، وە هەموو کەسێك هەر هەوڵی خۆی ئەدات ، وە داوای ڕزگاربوونی خۆی ئەکات ، وە خۆی ئەشارێتەوە ، لەو کەس و کارو خزم و خوێشانەی کە لە جیهانا سەرو ماڵی خۆی بەخت ئەکرد لە ڕێگایانا ، وەکو ئەفەرموێ (یوم یفر المرء من اخیه) ئەو ڕۆژەی کە هەموو کەسێك ڕەو ئەکات لە برا (وامه) و دایکی (وابیه) و باوکی (وصاحبته) و ژنی (وبنیه) و کوڕانی ، واتە کە ئەو ڕۆژە هات ، کەس سەر کەسی ناپەرژێ ، وەك دەرئەکەوێ لە ئایەتی (لکل امرء منهم یومئذ شان یغنیه) واتە هەموو یەکێك لەوان لەو ڕۆژەدا بە جۆرێکی وا خەریك دائەمێنێ ، کە سەر کەسی تری نەپەرژێ •

ئەمە حاڵی مەردومە لەو ڕۆژەدا بەتێکڕایی ، ئنجا باسی حاڵی بڕوادارو بێبڕوا ئەکات ، لەو ڕۆژەدا ئەفەرموێ (وجوه یومئذ) زۆر دەموچاو لەو ڕۆژەدا (مسفرة) ڕۆشن (ضاحکة) و دەم بەپێکەنین (مستبشرة) و شادمانن ، چونکە بەری بڕواو کردەوەی جوانی خۆیان ئەبینن (ووجوه یومئذ علیها غبرة) وە زۆر دەموچاویش لەو ڕۆژەدا تەپوتۆزی خەم و خەفەتیان بەسەرەوەیە (ترهقها قترة) ڕەشیی دایپۆشیون ، واتە : لە داماوییدا ڕەش داگیرساوون ، چونکە بەری کردەوەی

أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ (٤٢)

ئەوانە ئەوانەن کە بێبڕوای بەدکردارن(٤٢) ٠

پیسی خۆیان ئەبینن (اولئك هم الکفرة الفجرة) ئەوانە ، ئەوانەن کە لە جیهانا بێبڕوابوون ، وە لە فەرمانو فەرموودەی خواو پێغەمبەر ، دەرچوون ، وە هەموو جۆرە گوناهێکیان کردووە ٠

سُورَةُ التَّكوِيرْ

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ

إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ(١) وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ(٢)

## سوورەی ( تکویر )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**کاتێك کە ڕۆژ پێچرایەوە(١) وە دەمێك کە ئەستێرەکان تارییك بوون(٢)**



## سوورەی ( تکویر )ە



**مەککی‌یە ، ٢٩ ئایەتە ، ١٠٤ ووتەیە**

بسم الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**خوا لەسەرەتای ئەم سوورەتەوە باسی هێندێك لەو بەسەرهاتانەمان بۆ ئەکات، کە لە سەرەتای ڕۆژی دوایی‌یەوە ڕووئەدەن ، تا کاتی لێ‌پرسینەوە ، بۆ ئەوەی نموونەیەکمان لە سامو ترسی ئەوڕۆژە نیشان بدات ، کە هەموو کەسێك چاکەو خراپەی خۆی تیا دێتەوە ڕێ ، وە پەردە هەڵئەگیرێ لەسەر فروفێڵی فێڵبازان ، ئەفەرموێ :**

**(اذا الشمس کورت) کاتێك کە ڕۆژ پێچرایەوە ، واتە لەبەر نەمانی هێزی کێشنلە ، لە شوێنی خۆی ترازا ، یا کووژایەوەو سارد بووەوە ٠**

**(واذا النجوم انکدرت) وە دەمێك کە ئەستێرەکان هەڵوەرییێنو کەوتنە خوارەوە ٠**

**هەر خوا خۆی ئەزانێ ئەو ئەستێرانەی کە هەڵئەوەرێن کامەن ، ئایا ئەستێرەکانی کۆمەڵەی ڕۆژیی ئێمەن ، یا ئەستێرەکانی کاکەشانی ئێمەن ، کە بە سەدها ملیۆن ئەستێرەن ، یا هەموو ئەستێرەکانی ئاسمانن ، کە هەر خوا ئەزانێ چەندن ٠**

وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ(٣) وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ(٤) وَإِذَا الْوُحُوشُ
حُشِرَتْ(٥) وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ(٦)

---

وە حەڵێـك کە کێـوەکان (وەك تۆز) چـوون بەحـەوادا(٣) وە سـاتێك کە هەورەکان لە بارین خران(٤) وە کاتێك کە جانەوەران کۆکرانەوە(٥) وە دەمێك کە دەریاکان هەڵگیرسێنران(٦) ٠

---

(واذا الجبـال سيرت) وە ساتێك کە کێوەکان لەبەر تـرازانی زەویی لەسەر چەمەرەی خۆی ، بوون بە تۆزو چوون بە ئاسمانا ٠

(واذا العشار عطلت) وە حەڵێك هەورەکان لە بارین خران ، بەهۆی نەمانی دەستوورو باوی جاران ، کە بارانیان ئەباراند(١) ٠

(واذا الوحوش حشرت) وە دەمێك کە جانەوەرانو باڵندە ، کۆکرانەوە ، واتە لە ترسی ئەو ڕۆژە ، هەموو لە بێشەو هێلانەی خۆیان هاتنە دەرێ ، وە دوژمنایەتی ناو خۆیان لەبیرچووەوەو ترسیان لە یەکتریی نەما ، هەروەك بیمیان لە ئادەمییش ناسێنێ ، وە خۆیان ئەکەن بە ئاوەدانیدا ٠

(واذا البحار سجرت) وە کاتێك کە دەریاکان هەڵگیرسێنران ٠

هەڵگیرساندنی دەریا بە دوو جۆر ئەبێ :

١ ـ یا بەهۆی ئاگری ناو زەوییەوە ئەبێ ، کە لە ڕۆژی دواییدا لەتلەت ئەبێو ئاگرەکەی دەرئەکەوێ ، وە هەرچی ئاوی دەریا هەیە گری تێبەرئەبێو ئەبێ بە هەڵمو ئەچێ بەحەوادا ، ئەمەش کە ناوزەویی هەمووی ئاگرە ، ئەمڕۆ بەتەواویی ئاشکرا بووە ، وە گەورەترین نیشانە لەسەر ئەوە ، گڕەو کڵپەی کێوانی ئاگرین «براکین»ە ، کـە زۆر جار ، وە لـە زۆر شوێن بڵێســەی سەندووەو شـاخو کێوی لەتکردووە ٠

٢ ـ یا بە تەقینی هەرچی زەڕەی دەریاکان هەیە ، ئەبێ ، وەك ئەم تەقینی زەرەیەی کە ئێستا هەیە ، بەڵام ئەم لەکوێو ئەو لەکوێ ؟!ئەم بە تەقاندنی چەند زەرەیەك تینو تەووژمی ١٠٠ ملیون تەن پەیدا ببێ ، ئەگەر هەرچی زەڕەی ئاوی

---

(١) ئەم مەعنایەم لەتەفسیری فتح‌القدیری شوکانیو تەفسیری احمد مظهر العظمەو تفسیر القران الکریم کە لەلایەن لیژنەیەکەوە نووسراوە ــ وەرگرتووە .

وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ(٧) وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ:(٨) بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ؟(٩)

**وە حەڵێك كە هەموو گیانێك جووتكرایەوە (لەگەڵ جەستەیا)(٧) وە كاتێك كە پرسیار كرا لە كچانی زیندە بەچاڵ :(٨) كە بە چ گوناحێك كوژران ؟(٩) •**

**دەریاكان هەیە ، هەمووی بەجارێك بتەقێ ، ئەبێ چی پەیدا ببێ؟ ، وە ژیریی‌و بیری ئادەمیی ، لەكوێ تێ‌ی بگات ؟!!! وە چۆن لەمێشكیا جێ‌ی‌بێتەوە ؟**

**لەپاش باسی ئەو شتانەی كە لەسەرەتای ڕۆژی دوایی ، وە لە پێش زیندوو بوونەوەدا ئەبێ ، ئنجا دەستی كرد بەباسی زیندووبوونەوەو ئەوانەی كە لە دوای ئەو ئەبن ، فەرمووی (واذا النفوس زوجت) ساتێك كە گیان جووت كرایەوە لەگەڵ جەستەدا ، واتە گیان كرانەوە بە بەر جەستەكانیانا ، لەمەوە دەرئەكەوێ كە گیان لەڕۆژی جیابوونەوەی لە لەش ، تا ڕۆژی زیندووبوونەوە هەر ئەمێنێ •**

**لەپاش زیندووبوونەوە ، ئنجا نۆرەی پرسینەوە «محاسبة»ی بەندەگانە ، وەكو ئەفەرموێ (واذا المؤودة سئلت بای ذنب قتلت) حەلێك كە پرسیار كرا لەو كچانەی كە زیندەبەچاڵ كراوون : بە چ گوناحێك كوژراون ؟**

**لەپێش ئیسلاما باوبووە لەناو عەرەبا ،زیندەبەچاڵكردنی كچ لەبەر هەژاریی‌و نەبوونی ، یا لەبەر نەنگ‌و بەدناویی ، ئنجا بەم بۆنەیەوە هەر ژنێكی ئاووس بهاتایەتە ، سەر مناڵ بوون ، بیرێكیان لەلاوە هەڵ ئەكەند ، ئنجا ئەگەر كچی ببوایە ئەوا ئەیان خستە بیرەكەوەو دایان ئەپۆشی ، هێندێ جاریش دەست‌و برد ، نەیان ئەكوشت تا ئەبوو بە شەش حەوت ساڵە ، ئەو حەلە ، بیرێكیان لەدەشت بۆ هەڵئەكەندو چاویان ئەڕشت‌و كاڵای جوانیان لەبەر ئەكردو بەناوی سەیرانەوە ئەیان برد بۆ سەر بیرەكەو لەناكاو تێ‌یان ئەخست ، وە گڵیان ئەكرد بەسەرا، تا زیندەبەچاڵیان ئەكرد ، هەروەك قورئان ئەم باوە پیسەمان بۆ ئەگێڕێتەوە لە سوورەی «نحل»دا ئەفەرموێ «واذا ابشر احدهم بالانثى ظل وجهه مسودا وهو كظيم • يوارى من القوم من سوء مابشر به • ايمسكه على هون ام يدسه في التراب ؟ الاساء ما يحكمون»(١) ، كاتێك كە ئیسلام هات ، ئەم باوە پیسەی هەڵگرت ، وە ئەم**

١ ــ واتە كاتێك كە مژدەی كچ بدرایە بە یەكێك لەوان ، قینی هەڵئەستاو ڕووی ڕەش دائەگیرسا • خۆی لە خەڵق ئەشاردەوە ، لەبەر نەنگیی ئەو مژدە ناخۆشەی كە پێ‌ی ئەدرا ،(وە بیری لێ‌ئەكردەوە) ئایا بی‌هێڵێتەوە ، لەسەر نەنگ‌و ڕیسوایی ، یا بیكا بەژێر خاكەوە ، بزانن ئەو بڕیارەی كە ئەوان ئەیدەن شتێكی زۆرخراپە •

وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ(١٠) وَإِذَا السَّمَاءُ كُشِطَتْ(١١)

وە کاتێك کە نامە(ی کردەوە) کرانەوە (١٠) وە دەمێك کە ئاسمان پێچرایەوە(١١)

بێڕەحمیو دڵڕەقی‌یەی گۆڕیی بە ڕەحمو دڵنەرمیی بەرانبەر بە کچ ، بەڕاستی ئیسلام بەمە خزمەتێکی زۆر گەورەی ئادەمیی کرد نەخوازەلا مێیینە •

(واذا الصحف نشرت) دەمێك کە نامەی کردەوە بڵاوکرایەوە ، وە هەرچی گوفتارو کرداری پیسیو ناشیرینی بەندەگان هەیە ئاشکراکرا، کە ئەمانە ناخۆشترین شتە لای مەردوم ، چونکە زۆر گوناهی وا هەیە مەردوم بە بیرکەوتنەوەی تەریق ئەبێتەوەو ئەتوێتەوە،ئنجا وەرە ئەو گوناهانە وایان لێ‌بێ هەموو کەسێك بیانزانێ•

پێویستە لەسەر هەموو مسڵمانێك بڕوای ببێ کە شتێك هەیە پێی ئەووترێ نامە ، وە هەرچی کردەوەی بەندەگان هەیە تێ‌یدا نوسراوە ، وە لە ڕۆژی دوایی‌دا، کە کرایەوە ، یەك بەیەك ئەو کردەوانە نیشان ئەدات ، بەڵام ئەمە کە بزانین ئەو نامەیە چۆنەو لەچی‌یە ، ئەوە کەس نایزانێ خوا نەبێ •

(واذا السماء كشطت) کاتێك کە ئاسمان داماڵێنراو پێچرایەوە ، واتە بەرەو ژوورو بەرەوخوار نەما •

شێخ محمد عبده ئەفەرموێ مەبەس لەئاسمان پێچانەوە ، نەمانی پەردەی بێ‌ئاگایی‌یە ، لەسەرچاوان ، وەك لەسوورەی «ق»دا ئەفەرموێ «لقد كنت ، في غفلة من هذا فكشفنا عنك غطائك فبصرك اليوم حديد» واتە ئەو پەردەی بێ‌ئاگایی‌یەی کە لە جیهانا بەسەرچاوتانەوە بووە ، وە لەبەر ئەوە ، ڕێی ڕاستتان نەئەدیی ، وە بڕواتان بەم ڕۆژە نەئەکرد ، ئەمڕۆ ئەو پەردەیە لەسەر چاوتان لائەبرێ،وە هەرچی شتێك کە بڕواتان پێ نەئەکرد ــ ئەمڕۆ چونکە بەچاوی خۆتان ئەی‌بینن ــ بڕوای پێ‌ئەکەن ، لەپاشا ئەفەرموێ ئەم ئایەتی ئێرەیە ، بەرانبەری ئەو ئایەتی سوورەی (ق)ەیە ، وە معنایان یەکە •

شێخ ئەفەرموێ ئەگەر وانەبێ ئەبوایە باسی پێچەوانەی ئاسمانی بخستایەتە دوای باسی هەڵوەرینی ڕۆژو ئەستێرەکانەوە کە سەرەتای ڕۆژی دوایی‌یە ، نەك بیخستایەتە دوای باسی زیندووبوونەوەو پرسینەوە •

وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ(١٢) وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ(١٣) عَلِمَتْ نَفْسٌ
مَا أَحْضَرَتْ(١٤) فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ(١٥) الْجَوَارِ الْكُنَّسِ(١٦)

وە حەلێك كە دۆزەخ هەلگیرسێنرا(١٢)وە ساتێك كە بەهەشت نزیيك خرايەوە(١٣) (ئەو حەلە) هەموو كەسێك ئەزانێ كەچی ئامادە كردووە (بۆ خۆی لەچاكەو خراپە)(١٤) سوێند ناخۆم بەو (ئەستێرە گەڕۆكا)نەی كە ئەگەڕێنەوە(١٥) ڕەووندەكانی خۆشارەوەكان(١٦)

(واذ الجحيم سعرت) وە ساتێك كە ئاگری دۆزەخ هەلگیرسێنرا •

پێویستە لەسەر هەموو مسلمانێك بڕوای ببێ كە شوێنێك هەیە ئامادەكراوە بۆ سـزای گوناهباران ، وە پێی ئەلێن دۆزەخ ، وە ئەو شوێنە ئاگر ئەكـرێ بە ئاگرێك ، كە گەلێ لەئاگری جیهان تیژترو گەرمترە ، وە تینو ئازاری بۆ جەستە زۆرترە ، بەلام ئاگرەكە چی‌یەو چۆنە؟ ئایا بە دارە ، یا بە نەوتە ، یا بە خەلووزی كانە ، یا بەشتێكی ترە ، وە لە ئاگری جیهان ئـەچێ یانا ؟ ئەوە هەر خـوا خۆی ئەزانێ •

(واذا الجنة ازلفت) وە حەلێك كە بەهەشت نزیيك خرایەوە لە چاكان ، واتە لە ڕۆژێكا كە ئەم كارە گەروە گەورانە ڕوویاندا،ئەو حەلە (علمت نفس ماحضرت) هەموو كەسێك ئەزانێ كە چی ئامادە كردووە ، وە لەپێش خۆیا چی ناردووە بۆ ڕۆژی دوایی لە چاكە ، یا لەخراپە •

⊙ ⊙ ⊙

وەك لە سوورەی «الحاقة»دا باسمان كرد ، باوبووە لەناو عەرەبا ئەگەر یەكێك بی‌ویستایە سوێند بخوات لەسەر شتێكی ئاشكرا ، ئەیووت : «لا اقسم» واتە سوێند ناخۆم كە ئەم شتە وایە ، واتە ئەوەندە ئاشـكرایە پێویست بەسوێند ناكات ، كە ئەمە بەڕاستی بەقـەد سوێندێك پشـتیوانیی قسەكە ئـەكات ، وەك لـە سوورەی «واقعة»دا ئەفەرموێ « فلا أقسم بمواقع النجوم • وانه لقسم لو تعلمون عظيم ، انه لقرآن كريم»(١) ئنجا خواش لێرەدا لەسەر ئەو دەستوورو باوە ئەفەرموێ (فلا اقسم بالخنس • الجوار الكنس) سوێند ناخۆم بەو ئەستێرانەی كە هەروەك شەو ڕۆژیی

(١) واتە سـوێند ناخۆم بە شوێنی ئەستێرەكان ، وە ئەمە سوێنـدێكی گەورەیە ئەگەر بـزانن ، ئەوە (ی بە سـرووش بۆ محمد دێتە خـوارەوە) قورئانێكی گەورەیە •

وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ (١٧) وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ (١٨) إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ (١٩)

وە بە شەو کە پشت هەڵئەکات(١٧) وە بە بەیانیی کە هەناسە ئەدات(١٨) بێگومان ئەو قورئانە گوفتاری ڕەوانەکراوێکی پایە بەرزە (کە فریشتەی سرووشە)(١٩)

جارێك بەدییمەن لەگەڵ ڕۆژا چەرخەیەکی زەویی ئەکەن ، شەو بەشەویش ئەگەڕێنەوە بۆ لای ڕۆژهەڵات تا لە ڕووناکیی ڕۆژا وون ئەبن ، وەك حەوتەوانەی گەڕۆك ٠

(والليل اذا عسعس) وە بە شەو لەکاتێکا کە پشت هەڵئەکات ٠

(والصبح اذا تنفس) وە بە بەیانی لەکاتێکا کە شەبەق ئەداو جیهان ڕوون ئەبێتەوەو پێئەکەنێ بەدەم هەموو شتێکەوە ٠

تەعبیرێکی چەند جوانو دڵفرێنە ؟ ئەڵێیت لەناو ڕووناکیی بەرەبەیانایتو گوێت لە جرییوەی چۆلەکەو قاسپەی کەوو دەنگی بلبلو خوێندنی کەڵەشێرە ٠

بە سوێندی یەکەم دوو شت ئەگەیەنێ ، یەکەم کە ئەستێرەکان بەبێ سوود مەزانن ، وە بە چاوی ووردبوونەوە تەماشایان بکەن ، وە لە هەڵاتنو ئاوابوونو گەڕانەوەو خۆشاردنەوەیانا گەورەییو دەسەڵاتی خوا ببینن ٠ دووهەم کە ئەم ئەستێرانە بە خوا مەزانن ئەگینا ئاوا نەئەبوونو خۆیان نەئەشاردەوە ٠

بە سوێندی دووهەمو سێهەم ئەگەیەنێ کە ئەمانە بەبێ کەڵك مەزانن ، چونکە لە شەوا کە پشت هەڵئەکاتو ئەڕوات ، لاچوونی ئەو تاریکییەی تیایە کە بەسەر جیهانا هاتووە ، وە هەموو کەسێکی خەریك کردووە لە ئیشو کار ، وە لە دەمە دەمی بەیانا کە شەبەق ئەدات ، مزگێنی تیایە بە ڕۆژێکی ڕووناك کە مایەی ژیانێکی نوێو جووڵانەوەو ئیشوکاری تازەیە ، وە مایەی تەواوکردنی کاروباری ناتەواوی پێشووە ٠

چونکە فریشتەی سرووش ئەم قورئانەی هێناوەتە خوارێ بۆ پێغەمبەر ، وە ئەو ئایەت بەئایەت بۆی خوێندۆتەوە ، وە پێغەمبەریش لە دەمی ئەوی وەرگرتووە ، بۆیە ئەفەرموێ : سوێند بەمانە (انه لقول رسول كريم) ئەم قورئانە وە ئەم باسی

ذِي قُوَّةٍ ، عِنْدَ ذِي الْعَرْشِ مَكِينٍ(٢٠) مُطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ(٢١) وَمَا صَاحِبُكُمْ بِمَجْنُونٍ(٢٢) وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ(٢٣) وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِضَنِينٍ(٢٤)وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَانٍ الرَّجِيمِ(٢٥)

---

بەهێـزە ، لای خوای گەورە ، خاوەن پایەیە(٢٠) قسە ڕەوایـە لەناو فریشـتەدا دەست پـاکە(٢١) هاوڕێـکەتان (کە محمـدە) شێت نی‌یـە (وەك ئێـوە ئەڵێن)(٢٢) بێ‌گومان (فریشـتەی سرووشی) دیبوە لە ئاسـۆی نمایانەوە(٢٣) وە ئەو ، چرووك نی‌یە لەگەیاندنی سرووشا(٢٤) وە ئەو (قورئانە) قسەی شەیتانی دەرکراو نی‌یە (وەك پێی ئەڵێن)(٢٥)

---

ڕۆژی دوایی‌یەی کە لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە ووترا ، ووتەی ڕەوانە کراوێکی گەورەیە ، کە فریشتەی سرووشە ، کە لە خواوە بە خەڵات بۆ پێغەمبەری هێناوە (ذي قوة) بەهێزە لەژیری‌و بیرا (عند ذی العرش مكين) لای خوای گەورە خاوەن پایەیە (مطاع ثم) قسە ڕەوایە لەناو کۆمـەڵی ژووررووی فریشتەدا (أمين) دەست پاکە لە سرووش بردنا بۆ پێغەمبەران ٠

ئەمە تا ئێرە ، سیفەتی ئەو نوێنەرە بوو ـ کە جبرییلە ـ کە سرووشی هێنا ٠ ئنجا باسی ئەو نوێنەرە ئەکات ، کە سرووشی بۆ دێ کە پێغەمبەرە ، ئەفەرموێ (وما صاحبكم بمجنون) هاوڕێکەتان شێت نی‌یە ، واتە ئەو محمدەی کە لە مناڵی‌یەوە لە ناوتانایەو هاوڕێتـانە ، وە تا ئێستا هیچتان لێ‌نەدیوە ، ژیـریی‌و بیری بەرزو ڕاستیی‌و هێمنی‌و لەسەرخۆیی نەبێ ، ئێستا لەتەمەنی چل ساڵیدا کە ئەڵێ پێغەمبەرم وە باسی ڕۆژی دوایی‌و هێندێ شتی‌تری واتان بۆ ئەکات ، کە نەتانبیستووە ، چۆن ئەڵێن شـێتە ؟ وە چۆن ئەڵێن ئەم قورئانە شەیتان پێی ئەڵێ ، واتـە شێت نی‌یە ، بەڵکو پێغەمبەرێکی بەڕاسـتی‌یە وەك پێغەمبەرەکانی پێش خـۆی ، وە فریشـتەی سرووشی ئەبینێ‌و سرووشی لێ وەرئەگرێ ، وەکو ئەفەرموێ (ولقـد رآه بالافق المبين) بەڕاستی محمد «جبرييل»ی دیبوە لەئاسۆی رووناکو نمایانەوە(وماهو علی الغيب بضنين) وە محمد چرووك نی‌یە لەگەیاندنی سرووشی خوادا ، وە هەر سرووشێکی بۆ بێ بە تەواوی ئەی‌گەیەنێ بێ‌ئەوەی شتێکی لێ‌بشارێتەوە ، نابینیت ئەم هەموو سـەرکۆنانەی کە هاتوونەتە سـەری لەقورئانا یـەکێکی وون نەکـردووە ، وەك سەرکۆنەی سوورەی «عبس»ە ، لەم جزمەدا ٠ (وما هو بقول شيطان رجيم) وە ئەوی

فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ(٢٦) إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ(٢٧) لِمَنْ شَاءَ مِنْكُمْ أَنْ يَسْتَقِيمَ ،(٢٨)

---

ئەوە بۆکوێ ئەڕۆن؟(٢٦) ئەو قورئانە هەر ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو جیهانیان(٢٧) بۆ ئەو کەسانەی کە حەز ئەکەن بەڕێی ڕاستا برۆن لە ئێوە(٢٨)

---

کە قسەی لێ‌ئەکات ، لە باسی ڕۆژی دوایی‌و بەهەشتو دۆزەخ ، هیچی قسەی شەیتانی دەرکراو نی‌یە ، وەکو ئێوە پێی ئەڵێن ، (فاین تذهبون) ئەوە بۆ کوێ ئەڕۆن ، واتە پێغەمبەر لەکوێ‌و ئەم بیرە ناقۆڵایانە لەکوێ : تا کەی بەلای ڕاستەکدا ناچن کە محمد پێغەمبەرە ، وە ئەم قورئانەی کە بەسەرتانا ئەخوێنێتەوە فەرموودەی خوایە ، وە ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو ئادەمیی ، وەکو ئەفەرموێ (ان هو الا ذکر للعالمین) ئەم قورئانە ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو جیهانیان ، وە بیرخەرەوەی شتێکە کە لەسروشتیانا هەیە وەك ئارەزووی چاکە بێ ، بەلام هەوەس‌و ئارەزوو ، یا نەخۆشیی کۆمەڵایەتی لەبیری بردوونەتەوە •

لەم ئایەتەوە دەرئەکەوێ کە قورئان لە مەککە ، وە لەسەرەتای ئیسلامەتی‌دا کە پێغەمبەرو مسڵمانان لەژێر ئەشکەنجەی بێ‌بڕواکانا بوون ، تا لە پاشا ناچاربوون بەهەڵاتن‌و کۆچکردن بۆ«مەدینە»ـ بانگ‌کردنێکی جیهانیی بووە بۆهەموو جیهانیان، نەك وەك دوژمنەکانی پێغەمبەرو ئیسلام ئەڵێن : کە پێغەمبەر تا لە مەککە بووە ، هەر ادعای پێغەمبەریەتی ، عەرەبی کردووە ، لەپاشا کە هاتە مەدینەو بەهێزبوو ، ئنجا ادعای پێغەمبەریەتی هەموو جیهانی کردووە ، ئەمە ئەگەر وا بووایە ، ئەم جۆرە ئایەتانە هەر لە سوورەتە «مەدەنی»یەکانا ئەبوون ، کەچی هەر لە سوورەتە مەککی‌یەکانا هەن کە لەسەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە هاتوونەتە خوارێ ، وەك ئەم سوورەتەو سوورەتی «یوسف»و (ص) و«قەڵەم» نەخوازەڵا سوورەی قەڵەم کە لەبەرە بەیانی ئیسلامەتی‌دا هاتۆتە خوارەوە ، وە ئەفەرموێ «وما هو الا ذکر للعالمین» •

ئنجا وەك ووترا ئەم قورئانە ئامۆژگاری‌یە بۆ هەموو کەسێك ، کام کەس ؟ (لمن شاء منکم ان یستقیم) بۆ ئەوانەی کە حەز بەچاکەو ڕێگای ڕاست ئەکەن لە ئێوە ، واتە قورئان ئامۆژگارو بیرخەرەوەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێ ، ڕێی ڕاست بگرن ، بەلام ئەوانەی کە نایانەوێ بە ڕێی چاکا برۆن ، وە هەمیشە ئارەزووی ڕێی خراپیان هەیە ، قورئان کاریان تێ‌ناکات ، وە لە خەوی بێ‌هۆشیی

وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ(٢٩)

ئێوە ئارەزوو (ی ڕێی ڕاست) ناکەن مەگەر کاتێك کە پەروەردگاری هەموان ئارەزوو بکات (وە ناچارتان بکات پێی)(٢٩) •

بێداریان ناکاتەوە ، کەوابوو ڕێ نموونیی هەموو کەسێك بەستراوە بە ئارەزووی خۆیەوە ، وە هەموو کەسێکیش پێویستە لەسەری کە بەشوێن ڕێی ڕاستا بگەڕێ ، وە دوای چاکە بکەوێ ، بەلام ئەم بێ بڕوایانە پەردە بەسەر چاوو دڵیانا هاتووە ، وە ئارەزوی هیچ ناکەن گومرایی نەبێ ، وەکو ئەفەرموێ (وما تشاءون) ئێوە ـ ئەی بێبڕواینە ـ ئارەزووی ڕێی ڕاست ناکەن (الا ان یشاء الله رب العالمین) مەگەر ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە ، حەز بکات ، واتە بەزۆر ناچارتان بکات بۆ بڕواهێنان ، بەم ڕەنگە لە ئاسمان بنوسێ بۆتان بە پیتی ڕووناکی درشت ، کە فلان ، پێغەمبەری خوایە ، وە ئایینەکەی ڕاستەو پەیڕەوی بکەن ، وە ئەو نووسینە سالەهای سال بمێنێتەوە ، کە ئەمەش باوی خوا نییە ، چونکە ئەگەر وابووایە ، ئەو حەلە ، هەموو کەسێك بە ناچاریی بڕوای ئەهێنا ، وە لە بڕواهێنانا هیچ سەربەخۆیییەکی ئادەمێتی تیا نەئەما ، لەگەل ئەمیشە کە پاداشو تۆلە ، لە ڕۆژی دواییدا بەری ئەو کردەوانەیە ، کە ئادەمیی بە ئارەزووی خۆی بیکات لە چاکە یا لە خراپە •

لە تەفسیری ئایەتی «وما یذکرون الا ان یشاءالله» لە سوورەی «مدثر»دا شتێکی جوانمان نووسیوە بڕۆ بیخوێنەرەوە •

سُورَةَ الإنفِطَارْ

بسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ

إذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ(١) وَإذَا الكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ(٢) وَإذَا البِحَارُ فُجِّرَتْ(٣)

## سوورەی ( انفطار )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

کاتێك کە ئاسمان لەت بوو(١) وە دەمێك کە ئەستێرەکان پەرش‌وبڵاوبوون(٢) وە ساتێك کە دەریاکان تێکەڵکران(٣) •

## سوورەی ( انفطار )ە

**مەککی‌یە ، ١٩ ئایەتە ، ٨٠ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

ئەم سوورەتە وەك سوورەتی پێشوو باسی ئەو شتانە ئەکات ، کە لەسەرەتای ڕۆژی دوایی‌یەوە ڕوونەدەن ، بەڵام بە کورت‌تر لەو ، ئەفەرموێ (اذا السماء انفطرت) کاتێك کە ئاسمان لەت‌بوو ، بەم ڕەنگە هێزی کێشندە نەما ، وە دەستوورو باوی لای ژووروو تێکچوو ، دیارە ئەو حەلە ئەستێرەکان بەشوێنی خۆیانەوە نامێنن ، بۆیە فەرمووی (واذا الکواکب انتثرت) حەلێك کە ئەستێرەکان کەوتنە خوارەوەو بڵاوبوونەوە ، دیارە ئەو دەمە زەویش ئەکەوێتە جوولەجوول ، وە دەریاکان ئەکەونە شەپۆڵدان‌و تەکان خواردن ، بەڕەنگێکی وا کە هەموو بەجارێك تێکەڵ‌بین ، وە ئاوی شیرین‌و تاڵ بچن بەسەر یەکا ، بەڵکو ئاوی دەریاکان بۆ چەند دەمێك ، هەرچی زەویی هەیە دای‌پۆشێ ، وەکو ئەفەرموێ (واذا البحار فجرت)

وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ(٤) عَلِمَتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ(٥)
يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ، مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ(٦) أَلَّذِي خَلَقَكَ؟
فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ(٧)

وه حەلێك كه گۆڕەكان یەكالا كرانەوە(٤) (ئەو دەمە) هەموو كەسێك ئەزانێ كەچی لە پێشەوە ناردووەو (چیشی) دواخستووە(٥) ئەی ئادەمیی چی تۆی تەفرەداوە، بە پەروەردگاری گەورەت ؟(٦) ئەو (پەروەردگار)ەی كە دروستی كردوویت و ڕێكی خستوویتو جیای كردوویتەوە (لەگیانلەبەرانی تر)(٧)

ساتێك كە دەریاكان تێكەڵ كران بەسەریەكا ، دیارە ئەو حەلە زەویی تێك ئەچێ ، وە لە هەموو لایەكەوە لەت ئەبێ ، وە هەرچی لەناویابێ دەرئەكەوێ ، وە لەمیانەی ئەوانەشا گۆڕی مردووەكانیش یەكالا ئەبنەوە ، وەكو ئەفەرموێ (واذا القبور بعثرت) كاتێك كە گۆڕی مردووەكان یەكالا كرانەوە ، واتە دوای ئەمانە ، ئیتر وەختی زیندووبوونەوەی مردووان دێ ، وە هەموو كەسێك كردەوەی خۆی دێتەوە ڕێ ، وەكو ئەفەرموێ (علمت نفس ماقدمت واخرت) ئەو حەلە هەموو كەسێك تێ ئەگات كە چ كردەوەیەكی لەپێش خۆیا ناردووە لە چاكەو لە خراپە ، وە چیشی دوای خۆی خستووە كە بەشوێنیا بچێ .

⊙ ⊙ ⊙

لە دوای باسی ڕۆژی دوایی كە دەستووری جیهانی تیا تێك ئەچێ ، وە هەموو كەسێك بە بەری كردەوەی خۆی ئەگات لە چاكەو خراپە ، ئنجا بانگی ئادەمیی ئەكاتو پرسیاری لێ ئەكات لە هۆی بێ فەرمانیی بۆ خوا ، ئەفەرموێ (یا ایها الانسان) ئەی ئادەمیی ژیری خاوەن بیری بەرز ، كە بە ژیریی‌و بیری خۆت ئاسمانو زەوییت رامی ژێر دەستی خۆت كردووە ، وە بوویت بەجێ نیشینی خوا لەسەر زەوی (ما غرك بربك الكریم) چی فریبی داوییتو یاخی كردوویت بە پەروەردگاری گەورەو میهرەبانی خۆت ، بە ڕەنگێك كە سستیی ئەكەیت لە بەجێ هێنانی فەرمانیاو سەرپێچی ئەكەیت لەگەڵیا (الذی خلقك) ئەو پەروەردگارەی كە دروستی كردوویت (فسواك) وەڕێكی خستوویت (فعدلك) وەتەحرو وێنەی تۆی لەتەحری

فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ؟(٨) كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ (٩)
وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ(١٠) كِرَامًا كَاتِبِينَ(١١) يَعْلَمُونَ مَا
تَفْعَلُونَ(١٢)

لەهەر وێنەیەکا کە خۆیویستبێتی یەکیخستوویت(٨) وانی‌یە (کە تێیگەیشتوویت) بەڵکو بێبڕوایی ئەکەیت بە (ڕۆژی) پاداش(٩) بێگومان چەند ئاگادارێکتان بەسەرەوەیە(١٠) کە بەڕێزو نووسەرن(١١)هەرچی بکەن ئەیزانن(١٢)

هەموو گیان‌لەبەرێکی‌تر جیاکردۆتەوە (في صورة ماشاء ركبك) لە جوانترین‌و ڕێك‌وپێك‌ترین شێوەیەك کە خۆی پەسەندی کردووە ، یەکیخستوویت ، بەڕەنگێکی وا کە ئاسمان‌و زەویی شەرمت لێ‌ئەکات ، واتە خوایەك ، کە ئەمەندە چاکەی لەگەڵا کردبێت ، وە هەرچی پێویستت‌بێ دابێتێ ، چۆن هەروا بەرەڵلات ئەکات‌و لێت ناپرسێتەوە ، وە چۆن پاداشی چاکەت بە چاکە ناداتەوە ، وە تۆڵەت لێ‌ناسێنێ لەسەر خراپە •

ئنجا هۆی ئەم یاخی‌بوونەمان ، بۆ باس ئەکات ، کە بێ‌بڕوایی‌یە بە ڕۆژی دوایی ، ئەفەرموێ (كلا) هیچ شتێکی وانی‌یە کە ببێ بە مایەی فریوخواردن‌و یاخی‌بوونت ، ئەگەر ئەم هەموو میهرەبانی‌یەش ئەڵێیت کە لەگەڵیا کردوویت ، ئەبوایە ببوایە بە جڵەوکێشت بۆ بڕواکردن بە ڕۆژی دوایی ، کە ڕۆژی پاداشە ، کەچی ئەوی لێ‌ی نەترسییت‌و بیرت نەکەوێتەوە ، ئەو ڕۆژەیە ، کە ئەمەش مەعنای بڕوا نەکردنە بەو ڕۆژە ، وەکو ئەفەرموێ (بل تكذبون بالدين) بەڵکو بێ‌بڕوایی ئەنوێنن بە تۆڵەو سزای دوارۆژ ، واتە هەر بە سەرکێشیی‌و ئارەزوو ، لائەدەن لە سروشتی خۆتان ، وە لەوەی کە بە سروشت بۆی ئەچن لە بوونی خواو ڕۆژی پرسینەوەو سزا ، ئەگینا جارێك دڵتان دائەچڵەکیی ، وە لە ترسی ئەو ڕۆژە خۆتان لە شتی خراپ ئەگێڕایەوە ، لەگەڵ ئەمیشە وا مەزانن کە هەرچی بکەن ئەڕواو وون ئەبێ(وان عليكم لحافظين)بێ‌گومان چەند فریشتەیەکی ئاگادارتان بەسەرەوەیە (كراما) پاکن لە هەموو ڕق‌و قین‌و شت لەبیرچوونەوەیەك (كاتبين) نووسەری گوفتارو کردارتانن (يعلمون ما تفعلون) هەرچی بکەن لەچاکەو خراپە ئەوان

إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ(١٣) وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ(١٤)
يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ(١٥) وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ(١٦)

بەڕاستی چاکان لەناو بەهرەمەندیدان(١٣)و بەدکاران لە دۆزەخان(١٤) لە ڕۆژی پاداشدا ئەچنە ناوێوە(١٥) وە ئەوان لێی دەرناچن(١٦)

ئەیزانن‌و ئاگایان لێیە •

پێویستە لەسەر هەموو مسلمانێك بەڵکو لەسەر هەموو بڕواداریّك ، بڕوای بێ بەمە ، کە هەرچی گوفتارو کرداری بەندەگان هەیـە ، لەخوا وون نابێ ، وە هەمووی ئەنوسرێ‌و هەڵئەگیرێ ، بۆ ڕۆژی خۆی ، تا کەس نەتوانێ حاشا بکات لەهیچ کردەوەیەکی ، بەڵام پێویست نی‌یە بزانین ئەم نووسینە چۆن چۆنی‌یە ، ئایا بە قەڵەم‌و کاغەزە ، وەك لای خۆمان ــ کە ئەمە دوورە ــ یاخو گوفتارو کردار نەقش ئەبەستێ لە عالەمی ئەرواح‌و پـەردەی غەیباو ئەمێنێتەوە ، وەك مانەوەی نووسین لەسەر کاغەز ، یا دەنگ لەسەر شریتی تەسجیل‌و دیمەن لەسەر لەوحەی فتغراف‌و شریتی سینەما ، ئەگەر ڕاسـتت ئەوێ ئەمە هەر خوا خـۆی ئەیزانێ ، بەڵام ئەمە ئەبێ بزانین کە هیچ شتێکمان لای خوا وون نابێ ، بە ڕەنگێکی وا کە لە ڕۆژی خۆیا کەس نەتوانێ حاشای لێ بکات •

لەپاش ئەوەی گەیاندی کە نەترسان لەڕۆژی دوایی هیچ هۆیەکی نی‌یە ، تەنیا بێ‌بڕوایی نەبێ ، ئنجا باسێکی ئەوڕۆژە ئەکات،ئەفەرموێ (ان الابرار لفی نعیم) بێ‌گومان چاکان لەناو بەهرەمەندیی‌دان (وان الفجار لفی جحیم)و بەدکاران لـە دۆزەخان (یصلونها یوم الدین) لەڕۆژی پاداشدا ئەچنە ناوێوە (وماهم عنها بغائبین) وە ئەوان لەو دۆزەخە دوور ناکەونەوە ، واتە ئەی ئادەمیی هیچ شتێکی وا نی‌یە لەلایەن خواوە کە ببێ بەمایەی فریب خواردن‌و یاخی‌بوونت ، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەمە ڕۆژێکی واتان لەپێشەوەیە کە لێی بترسن •

⊙ ⊙ ⊙

لەپاش باسی ڕۆژی دوایی‌و ئەو ئازارو سزایانەی کە تووشی یاخی‌یان ئەبێ ،

وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ؟(١٧) ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ؟(١٨)
يَوْمَ لاَ تَمْلِكُ نَفْسٌ لِنَفْسٍ شَيْئاً ، وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ (١٩)

تۆ چووزانییت کە ڕۆژی پاداش چی‌یە ؟(١٧) دووبارە چووزانییت کە ڕۆژی پاداش چی‌یە ؟(١٨) ڕۆژێکەکە هیچ کەس هیچی بەدەست نی‌یە بۆ هیچ کەس ، وە فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ خوایە(١٩)

ئنجا باسی توندو تیژیی‌و سامی ئەو ڕۆژە ئەکات ، ئەفەرموێ (وما ادراك ما یوم الدین) تۆ چووزانییت کە ڕۆژی پاداش چی‌یە ؟ (ثم ما ادراك ما یوم‌الدین) دووبارە چووزانییت کە ئەو ڕۆژە چی‌یە ؟ واتە ئەمە زۆر سەیرە ، کە بێ‌موبالاتیی بکەیت ، وەکو تێی گەیشتبیت‌و ڕێی ڕزگارییت بۆ دۆزیی‌بێتەوە وایە ، لەگەڵ ئەمیشە کە تێی نەگەیشتوویت ، وە نازانییت کە ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکی ڕەش‌و کاتێکی تەنگ‌و چەڵەمەیە (یوم لاتملك نفس لنفس شیئا) ئەو ڕۆژەی کە هیچ کەسێك دەسەڵاتی هیچ شتێکی نی‌یە کە بۆ هیچ کەسێکی بکات ، واتە نەئەتوانێ گوناهێکی لەباتی هەڵبگرێ ، وە نە ئەتوانێ بی‌پارێزێ لەسزاو ناخۆشی‌یەك (والامر یومئذ لله) وە هەرچی هەیە لەو ڕۆژەدا هەمووی هەر بە دەست خوایە ٠

سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

بسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ

وَيلٌ لِلمُطَفِّفِينَ(١) الَّذِينَ إِذا اكتالُوا عَلَى

---

## سوورەی ( مطففين )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**وای بۆ ترازووبازان !(١) ئەوانەی کە پێوانە بکەن لە**

---

## سوورەی ( مطففين )ە

**مەککیيە ، ٣٦ ئایەتە ، ١٩٩ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**دەستووری قورئانە ، ئەو سوورەتانەی کە مەککین هەر هەوڵ ئەدەن بۆ دامەزراندنی بیروباوەڕی مەردومو جێگیرکردنی بنیاتی ئیسلامەتی ، بەڵام باسی مەسەلەی شەرعی ، یا ڕەووشتو خوویی ، لەو سوورەتانەدا ئەکرێن کە لە مدینە دێنە خوارەوە ، کە دەوڵەتی ئیسلام پێکدێ ، وە ژیانێکی کۆمەڵایەتیی دەست پێ‌ئەکات بە پێی دەستووری ئیسلام ، وە لەژێر سێبەری ئەوا ، لەبەر ئەوە باسی ترازووبازیی ئەم سوورەتە مەککیيەدا جێی ووردبوونەوەیە ۰**

**را دەرئەکەوێ کە ترازووبازیی زۆر باوبووە لە مەککەدا ، لەکاتی هاتنی ئایینی ئیسلام‌دا ، وە گەل زۆر ناڵاندوویەتی بەدەست ئەم دەردەوە ، نەخوازەلا کە کلیلی دەرگای بازرگانیی‌و کڕینو فرۆشتنیش هەر بەدەست دەوڵەمەندو خاوەن پلەو پایەکانی مەککەوە بووە ، کە هەموو ساڵێك کاروانیان لەهاویناندا چووە بۆ شامو لە زستانانا چووە بۆ یەمەن ، وە هەرچی پێویست بووبێ هێناویانە بۆ مەککە ، وە بە ئارەزووی خۆیان فرۆشتوویانە ، وە هەر بە زۆرو کەڵەگایی ، کەمیان داوە لە باتی زۆرو ، زۆریان وەرگرتووە لەبەرانبەری کەما،وەك ئەفەرموێ (ويل للمطففين الذين) وای بۆ ئەو ترازووبازانەی (اذا اكتالوا على**

النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ(٢) وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ(٣)
أَلاَ يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ؟(٤) لِيَوْمٍ عَظِيمٍ(٥) يَوْمَ يَقُومُ
النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ؟(٦)

---

سەر (ماڵی) مەردوم بەتەواویی وەری‌ئەگرن(٢) وە کاتێکیش بۆیان پێوانە یا کێشانە بکەن کەمیان ئەدەنێ(٣) ئایا ئەوانە نـازانن کە زیندوو ئەکرێنەوە(٤) لە ڕۆژێکی گەورەدا(٥) ڕۆژێك کە مەردوم لەبەر بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا ئەوێستن(٦)

---

الناس یستوفون) کاتێك کە لە ماڵی مەردوم شتێك پێوانە بکەن بۆ خۆیان بە زیادەوە ، پێـوانەی ئەکەن ، وە بە زۆر ئەیبەن ، وەك ووتــەی «علی» ئەیگەیەنێ (واذا کالوهم او وزنوهم) وە کاتێکیش‌کە لەماڵی خۆیان بۆیان پێوانە ، یا کێشانە بکــەن (یخسرون) کەمیان ئــەدەنێ ،بێ‌ئەوەی یەکێك بتوانێ قسە بکات ، چوونکە ناچار بوون بە وەرگرتنی •

بەڵێ ئیسلامــەتی ئەم زۆرو ستەمو دەستدرێژی‌یەی زۆر پێ‌گــران بوو ، هەرچەند هێشتا دەستە جڵەوی ژیانی کۆمەڵایـەتیشی وەرنەگرتبوو ، تا ڕێکی بخات بە پێی شەریعەتی خۆی ، وە بە هێزی قانونو یاسای دەوڵەت بەراووردی بکات ، بەڵام بــەم سوورەتە گەلی ، بێدار کــردەوە ، وە گەورەکانی مەککــەی ، پێشەکیی داچڵەکاند ، وە پێی فەرموون (الا یظن اولئك) ئایا گومان نابەن ئەو ترازووبازانە (انهم مبعوثون لیوم عظیم) کە زیندوو ئەکرێنەوە لە ڕۆژێکی گەورەی بەساما ، (یوم یقوم الناس لرب العالمین) ڕۆژێك کە هەرچی مەردوم هەیە تیا ئەوێستن ، وە هەموو بەترس‌و لەرزەوە چاوەچاوی فەرمانی پەروەردگاری هەموان ئەکەن ، واتە یەکێك ترازووبازیی ئەکات ، کە بڕوای بە ڕۆژی زیندووبوونەوەو لێ‌پرسینەوە نەبێ ، ئەگینا هەرکەسێك چ جای بڕوا «یقین» بەڵکو هەر گومانێکیشی ببێ بەو ڕۆژە ، دزیی ناکات لە مەردوم لە پێوانەو کێشانەدا •

لە جێ‌یەك ئەمە تۆڵەی ترازووبازانبێ ــ کە نە شتێکی زۆر ، کەمێك ئەدزن ــ ئەبێ تۆڵەی ئەو کەسانە چۆن‌بێ کە بە زۆرو ستەم ماڵی مەردوم داگیرئەکەن ، وە

كَلاَّ ! إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ(٧) وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِجِّينٌ؟(٨) كِتَابٌ مَرْقُومٌ(٩) وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ(١٠) الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ(١١)

---

نەکەن ! بەڕاستی نامەی بەدکاران لەناو دەفتەرێکی پەستی ڕەشایە(٧) تۆ چووزانییت ئەو دەفتەرە چی‌یە ؟(٨) دەفتەرێکی نووسراوە(٩) وای لەو ڕۆژەدا بۆ بێ‌بڕوایان !(١٠) ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بە ڕۆژی پاداش‌دانەوە(١١)

---

بە سەروبەرەوە ئەیخۆن •

⊙ ⊙ ⊙

تائێستا ناوی ئەمانەی برد بە ترازووباز ، ئنجا ناویان ئەبات بە بەدکردار ئەفەرموێ (کلا) با پەشیمان‌بنەوە لە ترازوو بازیی ، ئەگینا لە بەدکاران ئەژمێررێن، کە (ان کتاب الفجار) بەڕاستی نامەی بەدکارانیش (لفی سجین) لەناو دەفتەرێکی پەستی ڕەشی ناشرین‌دایە کە تەرخان‌کراوە بۆ گوناهباران (وما ادراك ما سجین) تۆ چووزانییت ئەو دەفتەرە چ دەفتەرێکی ڕەش‌و ناشرینە ؟ ناوی هەرکەسێکی تیا دانرا ، نیشانەی بەدبەختی‌یەتی ، ئنجا بسی ئەو دەفتەرە ئەکات ئەفەرموێ (کتاب مرقوم) دەفتەرێکی نووسراوی نیشانەکراوە بە نیشانەی تۆڵەو سزا •

ئەم تەعبیرە وەك تەعبیری ئەمڕۆ وایە کە ئەڵێن : ناوی فلان چووە ناو دەفتەری ڕەشەوە •

لەدوای هەڕەشەکردن لە ترازووبازان ، بە ئایەتی «ویل للمطففین» ئنجا دووبارە هەڕەشەیان لێ‌ئەکاتەوە ، بە جۆرێکی گەورەترو فراوان‌تر لەوانیش‌و لە گوناهبارانی‌تریش ، ئەفەرموێ (ویل یومئذ للمکذبین) دۆزەخ لەو ڕۆژەدا بۆ بێ‌بڕوایان (الذین یکذبون بیوم الدین) ئەوانەی کە بڕوا ناکەن بە ڕۆژی پاداش ، کە ڕۆژی دوایی‌یە ، ئنجا ئەم بڕوانەکردنەیان بە ئینکاری ئەو ڕۆژەبێ ، بە ئاشکرا، یا بەبێ موبالاتی‌یان‌بێ دەربارەی •

ئەمە ئاشکرایە لە هەموو کەسێکەوە ، یەکێك ئەگەر بە ڕاستی بڕوای ببێ بە ڕۆژی دوایی‌و پرسینەوە ، هەرگیز گوناه ناکات ، وە ئەگەر کردی زۆر زوو

وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلاَّ كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ(١٢) إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ: أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ(١٣)

کەس ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێ مەگەر هەموو ستەمکارێکی گوناهبار(١٢)کاتێك کە ئایەتانی ئێمەی بەسەرا بخوێنرێتەوە ئەڵێ : (ئەمانە) قسەی پڕوپووچی پێشینانن(١٣)

پەشیمان ئەبێتەوە ، کەوابوو هەرکەسێك ، کە بەبێ پەروا گوناه بکاتو درێژەی پێبدات ، ئەوە مەعنای وایە کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی نی‌یە ، لەبەرئەوە خوا گوناه کردنو زۆرو ستەمو دەستدرێژیی ، گێڕا ، بەنیشانەی بێ‌بڕوایی ، فەرمووی (وما یکذب به) هیچ کەسێك ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێ (الاکل معتد اثیم) مەگەر ئەوانەی کە دەستدرێژیی ئەکەن بۆ ماف «حق»ی مەردوم ، وە خوویان گرتووە بە گوناهو دەستدرێژی‌یەوە ، واتە ئەوانەی کە دادپەرستن ، وە لە ڕێی ڕاست لانادەن ، وە لەو سنورەی کە خوا داینـاوە بۆیان ، ناچنە دەرەوە ، بۆ ئەوانە ئاسانە بڕواکردن بە ڕۆژی دوایی ، بەڵکو بەهرەی لێوەرئەگرن ، وە یارمەتی‌یان ئەدات بۆ ئەو ڕەووشتو خووەی کە لە سەرینی ، بەڵام ئەو کەسەی کە پەردەی ڕەش بەسەر چاوو دڵیا هاتبێ ، وە خووی گرتبێ بە زۆرو ستەمو دەستدرێژی‌یەوە ، بۆ ئەو کەسە زۆر گرانە بڕواکردن بە ڕۆژی دوایی ، بەڵکو هەر ناگونجێ ، چونکە نایەوێ لەم ڕووەوە بیـر بکاتەوەو تێبگات ، چونکە ئەگەر بڕوای بەو ڕۆژە ببێ ، ئەبێ گوناه نەکاتو زۆروستەمی نەمێنێ ، یا ئەگەر بشی‌مێنێ ئەبێ بە زۆرو ستەمی بزانێ ، وە خۆی بە زۆردارو ستەمکار بزانێ ، کە ئەمانە هیچی بۆ ئەو دەست نادات ، ئنجا لەبەرئەمانە هەرچەند باسی ڕۆژی دوایی بۆ بکرێ ، پێی پێوە ئەنێ ، وە نایەوێ بڕوای پێبکات ، وە ئەگەر جارێك ئایەتێکی قورئانی بۆ بخوێنرێتەوە کە باسی ڕۆژی دوایی‌و ئـازارو سزای ئەو ڕۆژە بـکات ، ئەبێ بڵێ ئەمانـە ، باسە نووسراوە پڕوپووچەکانی پێشینانن ، وەکو ئەفەرموێ (اذا تتلی علیه آیاتنا) کاتێك کە ئایەتانی قورئانیان بەسەرا بخوێنرێتەوە ، لە باسی ڕۆژی دوایی‌و ئازارو سزای ئەو ڕۆژەدا (قال : أساطیر الاولین) ئەڵێ : ئەمە داستانی پڕوپووچی پێشینانە ، لەم گوێ وەرئەگیـرێو لەوگوێ فەراموش ئەکرێ ، وە ئەڵێ کێ گوێ ئەداتـە ئەم

كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ(١٤) كَلاَّ

نەء وانی‌یە : بەڵكو ئەوەی كە ئەیانكرد (لەخراپە) پەردەی هێناوەبەسەر دڵیانا(١٤)
نەء بەڕاستی

جۆرە قسانە ؟ ، ئـەی ئەوە فلانو فلان بـۆ گوێی نـادەنێ ، تا ئێمـەش چاویان لێبكەین ، دیارە ئەوانیش لەدڵا بەلایانەوە وایـە ، كە قورئان قسەی پڕوپووچە ، با بەزبانیش نەیڵێن ، نابینیت هەرچی خواو پێغەمبەر پێی ناخۆش‌بێ ئەوە ئەكەن ، وە لە هیچ ناگـەڕێنەوە (كلا) نـەء ، وانی‌یە ، بەڵـكو قورئان نامەیـەكی ڕاستو دروستە ، سەرچاوەی هەموو خۆشبەختی‌یەكە ، دەرمانی هەموو دەردێكی ڕەووشتو خووی‌یە ، هەرچی بە پێی ئەو ڕەفتار بكات مرۆڤی تەواوە ، وە هەرچیش لێی لابدات ، لە ڕێی مەردایەتی دوورئەكەوێتەوە ، بەلام ئەم بێبڕوایانە بەهۆی باوی ناشرینو ڕەووشتو خووی خراپو هاودەمیی خراپەوە ، پەردەی ڕەش هاتووە بەسەر دڵو دەروونیانا ، وەكو ئەفەرموێ (بل ران قلوبهم ماكانوا يكسبون) بەڵكو ئەو كردەوە خراپانەی كە ئەیانكەن پەردەی هێناوە بەسەر دڵیانا ، وە نایەڵێ تێبگەن •

هەموو مرۆڤێك ، بە سروشت چاكو خراپ لەیەك جیائەكاتەوە ، وە هەموو خراپەیەك ، لەپێشەوە سامێكی هەیە ، یەكەمجار مەردوم كە ڕووی تێئەكات ، سڵی لێئەكاتو ئەسڵەمێتەوە ، بەلام لەپاش چەند جارێك بەرە بەرە چرای دڵودەروونی ئەكووژێتەوە ، وە سامـەكەی كەم ئەبێتەوە ، وە ئارەزووی خراپە كـردنی زۆرتر ئەبێ ، تا وای‌لێدێ ئیتر ناتوانێ دەستی لێهەڵگرێ ، بەڵكو هەر نایەوێ شتێكی‌وا ببیەت كە ئەو جۆرە ڕابواردنەی لێتێك‌بدات ، بەلام لەگەڵ ئەمیشە لەدڵا هەر بڕوای بە چاكەو خراپە هەیە ، وەلێ ئەم ئەیەوێ لە بیر خۆی بباتەوە ، لەبەر ئەوە نایەوێ هەرگیز قسەیەكی باش ببیەت ، یا پیاوێكی مسلمان ، یا زانایەكی قسەزان ببینێت، چونكە لـە چاوپێكەوتنی ئەمانە ، دڵی دائەچڵەكێ ، وە بـڕواو ڕەووشتو خووی بەرزی ، بیرئەكەوێتەوە ، ئەو حەڵە لە دەروونا دڵتەنگ ئەبێ •

ئنجـا ئاخۆ ، ئەم بێبڕوایانـە بـەم جۆرە ڕزگـاریان ببێ (كـلا) نەخێـر ڕزگاربوونیان نی‌یە ، وە هەموو لەڕۆژی دوایی‌دا ، لەشوێنی پەستو ناخۆشی وادا

إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ(١٥) ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا
الْجَحِيمِ(١٦) ثُمَّ يُقَالُ: هَذَا الَّذِي كُنْتُمْ بِهِ تكَذِّبُونَ(١٧) كَلَّا
إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ(١٨) وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ (١٩)

ئەوان لەو ڕۆژەدا ، دوورخراوەن لەبینینی پەروەردگاریان(١٥) لەپاشا ئەوان ئەچنە دۆزەخەوە(١٦) ئنجا پێیان ئەووترێ ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ‌نەئەکرد(١٧) بەڕاستی نامەی (کرداری) چاکان لەناو دەفتەرێکی بەرزایە (١٨) تۆ چووزانییت ئەو دەفتەرە چی‌یە؟(١٩)

ئەبن ، کە لەمیهرەبانیی خوا بێ‌بەش بن ، وەکو ئەفەرموێ (انهم عن ربهم يومئذ لمحجوبون) ئەو گوناهبارانی دڵڕەشانە لەو ڕۆژەدا بێ‌بەشن لەبینینی پەروەردگاریان، چونکە لەجیهانا هەرگیز خوایان بیرنەکەوتۆتەوە ، وە یادیان نەکردووە ، کەواتە لەڕۆژی دواییشا ، لەهەموو جۆرە میهرەبانی‌یەکی ئەو بێ‌بەش ئەبن ، وە لەدوای دەرکردنیان لەقاپی میهرەبانیی خوا ، ئنجا بەجارێك فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە ، وەکو ئەفەرموێ (ثم انهم لصالوا الجحيم) لەپاش نائومێدی‌یەکی ئێجگاریی ئنجا ئەچن بۆ دۆزەخ (ثم يقال) لەپاش چوونە ناوی ، پێیان ئەووترێ (هذا الذي كنتم به تكذبون) ئەمەیە ئەو ئاگری دۆزەخەی کە لە جیهانا بڕواتان پێ‌نەئەکرد •

چەند ناخۆشە بۆ مەردوم دوای ئەوەی کە تووشی تۆڵەیەك بوو ، گوناهەکانی بدرێتەوە بە چاوا وەك لێرەدا •

⊙ ⊙ ⊙

لەدوای باسی ڕووپەڕەی خراپان ئنجا باسی ڕووپەڕەی چاکان ئەکات ئەفەرموێ (كلا ان كتاب الابرار) بەڕاستی(١) نامەی کرداری چاکان (لفي عليين) لە ناو دەفتەرێکی گەورەی بەرزایە ، کە تەرخان کراوە بۆیان (وما ادراك ماعليون) تۆ چووزانییت ئەو دەفتەرە چ دەفتەرێکی پاکو تەمییزو بە فەڕە ؟ناوی هەرکەسێکی تیا دانرا ، ئەوە نیشانەی هاتو خۆشبەختی‌یەتی ، ئنجا باسی ئەو دەفتەرە ئەکات

(١) ئەم تەفسیرە نیشان ئەدات کە «کلا» لەم ئایەتەدا بە معنا «حقا»ە وەك لە تەفسیری قاسمی‌دا ئەفەرموێ •

کِتَابٌ مَرْقُومٌ(٢٠) يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ(٢١) إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ(٢٢) عَلَى الْأَرَائِكِ يَنْظُرُونَ(٢٣) تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ(٢٤) يُسْقَوْنَ مِنْ رَحِيقٍ مَخْتُومٍ(٢٥) خِتَامُهُ مِسْكٌ ، وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ(٢٦)

---

دەفتـەرێکی نوسراو(ی ئەمەندە بەفەڕ)ە(٢٠)نزیکانی بارەگا ، تەماشای ئەکەن(٢١) بێگومان چاکان لە (نازو) بەهرەمەندییدان(٢٢) لەسەر تەختو بارەگاوە تەماشا ئەکەن (٢٣)ئەبینیت لەڕوخساریانا پاراویی خۆش گوزەرانیی(٢٤) شەرابی پاکی سەر بەمۆریان دەرخوارد ئەدرێ(٢٥)کە دواقومی بۆنی میسکە ، بۆ ئەوە با پێش دەستی بکەن پێشدەستیکەران (٢٦)

---

ئەفەرموێ (کتاب مرقوم) دەفتەرێکی نووسراوی نیشانەکراوە بە نیشانەی پاداشو میهرەبانیی (یشهده المقربون) دەستە دەستە فریشتەو نزیکانی بارەگا تەماشـای ئەکەن ٠

لەدوای ئەوەی کە فەرمووی هەرچی کردەوەی چاکان هەیە دائەنرێ لـەناو دەفتەرێکی جوانی بەرزی بە فەڕا ، ئنجا باسی ئەو شتانە ئەکات ، کە دەستچاکان ئەکەوێ لەڕۆژی دواییدا ، ئەفەرموێ (ان الابرار لفی نعیم) چاکان لەناو نازو خۆشییو بەهرەمەندییدان ،ئنجا باسی هێندێك لەو خۆشییو بەهرەمەندییە ئەکات، ئەفەرموێ (علی الارائك ینظرون) لەسەر تەختو بارەگاوە پاڵ ئەدەنەوەو تەماشـای ئەوخۆشییو بەهرانە ئەکەن کە خـوا پێیی داوون (تعرف في وجوههم) ئەبینیت لـە ڕوخساریانا (نضرة النعیم) پاراویی خۆشگـوزەرانیی (یسقون من رحیق مختوم) شەرابی پاکی خۆشی سەر بە مۆریان دەرخوارد ئەدرێ (ختامه مسك) کە دوا قومی بۆنی میسك ئەدات،واتە وەك شەرابی دنیا بۆگەنو تییژو ناخۆش نییە ،(وفي ذلك) بۆ ئەم خۆشییو نازو میهرەبانییە (فلیتنافس المتنافسون) با دەست پێشکەریی بکەن دەست پێشکەران بە کردەوەی پاكو ئیشی چاك ، واتە هەوولدانو دەست پێشکەریی ئەبێ بەچاکییو پاکییو خواپەرستیبێ بۆڕەزامەندیی خواو گەیشتن بەنازو بەهرەی بەهەشت ، نـەك بە دزییو ترازو بازییو زۆرو سـتەمو خوێن مـژییبێ ، بـۆ

وَمِزَاجُهُ مِنْ تَسْنِيمٍ (٢٧) عَيْناً يَشْرَبُ بِهَا الْمُقَرَّبُونَ (٢٨) إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ (٢٩)

تێکەڵکراوی ، لـە (ئاوی) تەسنیمە(٢٧) کانی‌یـەك کە نزیکان (ی بـارەگا) لێی ئەخۆنەوە(٢٨) بێ‌گومان ئەوانەی کە بەدکاربوون پێ‌ئەکەنن بەوانەی کە بروایان هێنابوو(٢٩)

دەوڵەمەندیی‌و ڕەزامەندیی ماڵ‌ومناڵ •

زۆر سەیرە دەست پێشکەریی لەکاروباری ڕۆژی دوایی‌دا گیان بەرزو ڕووناك، وە سەر زەوی پاك‌و ئاوەدان ئەکاتەوە،بەڵام دەست‌پێشکەریی لەکاروباری جیهانی‌دا، گیان پەست‌و تاریك ، وە سەر زەویی پیس‌و وێران ئەکات ، وە جیهان ئەکا بە گۆمێکی بۆگەنی پڕ لەکرم‌و مار کە هەمیشە یەکتریی بخۆن •

لەپاش بـاسی شەرابی بەهەشت‌و بۆنی خۆشی ، ئنجا باسی ئەو ئـاوە ئەکات کە تێکەڵی ئەکرێ لەکاتی خواردنەوەیا ، ئەفەرموێ (ومزاجه من تسنیم) ئەوی کە لەگەڵ ئـەو شەرابەدا تێکەڵ ئەکرێ ئاوێکە کە سەرچاوەکەی نـاوی «تەسنیمە» وە لەشوێنی بەرزو بڵنـدەوە دێتە خوارەوە ، واتە ئەگەر یـەکێك بی‌ەوێ شـەرابی بەهەشت بە ڕوونی بخواتەوە ، لەو ئاوەی تێکەڵ ئەکات ، چ سەرچاوەیەك ! (عینا یشرب بها المقربون) سەرچاوەیەك کە هەر چاکان لێی ئەخۆنەوە •

ئەم نازو میهرەبانیانەی کە باس کرا هەموو کەسێك لەدنیادا ئـارەزوویان ئەکات‌و هەوڵیان بۆ ئەدات ، بۆیە خواش ناو بەناو باسـیان ئەکات ، تا هەمـوو مسڵمانێك بە تەمایان بێ‌و هەوڵیان بۆ بدات ، بە کردەوەی چاك ، ئەمە لەکاتێکا کە نازو بەهرەی بەهەشت لەهی دنیا بچێ ، ئنجا وەرە ئەگەر هەزاران جار باشترو چاکترو خۆشتر بێ ئەبێ مەردوم چۆن هەووڵی بۆ بداتو کۆششی بۆ بکات •

⊙ ⊙ ⊙

دوای ئەوەی کە باسی چاکان‌و خراپانی کرد لەگەڵ باسی پاداش‌و تۆڵەیان لە ڕۆژی دوایی‌دا، ئنجا باسی کردەوەی خراپان ئەکات لەگەڵ چاکان لەجیهاناو کردەوەی چاکان لەگەڵ خراپان لەڕۆژی دوایی‌دا ، ئەفەرموێ (ان الذین اجرموا) ئەوانەی کە بەدکردار بوون ، وە دڵیان لە عاستی دین‌داران ڕەش‌و گوێ‌یان لەبیستنی قسەیان کەڕبوو (کانوا من الذین آمنوا یضحکون) کاتێـك بوو ، پێ‌ئەکەنین بەوانەی کە

وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ(٣٠) وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ(٣١) وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا : إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ(٣٢)

وە کاتێك کە بە لایانا بڕۆیشتنایە چاویان لێدائەگرتن(٣٠) وە کاتێکیش بگەڕانایەتەوە بۆ لای کەس‌وکاریـان ، بەشادمانیی ئەگەڕانەوە(٣١)وە حەلێکیش کە بیاندینایە ئەیانووت : ئەمانە گومران(٣٢)

بڕوایان هێنابوو ، بۆچی ؟ چونکە کاتێك کە پێغەمبەری ئیسلام هـات ، گەورەو بچووك گومڕاو سەرگەردان بوو ، کەس نەبوو بانگی حـەق بدات بە گوێچکـەی مەردوما پێغەمبەر خۆی نەبێ ، لەپاشا چەند مسڵمانێکی ڕەش‌و ڕووت پەیدابوون کە بە پەنهانیی بڕوایان هێنابوو ، بەڵام لەتـرسی گەورەو دەست‌دارەکان ، نەیان ئەوێرا بڕواکەیان ئاشکرا بکـەن ، یا ڕێنموونییەکی ئەو بێ بـڕوایانە بکەن ، مەگەر بە نهێنی ، گەورەو زۆرداریش ــ لەبەرئەوەی کە یاخیی‌یە بەهۆی زۆرداریی‌و دەست‌داریی خۆیەوە ــ هەمیشە پێکەنینی دێ بەو هەژارە بێدەسەڵاتانەی کە لەسەر بیرو بـاوەڕی ئەوان نین ، نەخوازەلا کە بانگیشیان بکەن بۆ سـەر بیروباوەڕی خۆیان ، ئنجـا هەروەك بێبڕواکان پێ‌ئەکەنیـن بە مسڵمانەکان (واذا مـروا بهم یتغامزون) وە کاتێکیش کە بەلایانا بڕۆیشتنایە چاووبرۆیان لێدائەگرتن بەگاڵتەوە (واذا انقلبوا الی اهلهم) وە حەلێکیش بێبڕواکان بگەڕانایەتەوە بۆ ناو ماڵ‌ومناڵیان (انقلبوا فکهـین) ئەگەڕانەوە بە پێکەنیـن‌و گاڵتەکردنــەوە ، وە ئەیـانووت ئەم مسڵمانانە زۆر سـەیرن ئەڵێن هــەر هاوار لە خوا بـکەن ، وە ئەو شـتانەی کە لە تەوانای ئادەمیی‌دا نین هەر داوا لە خوا بکەن ، ئەی بتەکان ، ئەی پیرو گۆڕەکان بۆ کوێ چــوون ، یا گەورەکان‌و تکاکــەرەکان چی‌یان لێ‌هات؟ کە هــەزاران جار بەدەنگمانەوە هاتوون ، وە هەزاران کاری گرنگ‌و گەورەیان بۆ کردووین ، ئەگەر بە قسەی ئەمانەبێ ئەبێ بێجگە لە خوا هیچ شتێکی‌تر کەڵکی نەبێ (واذا راوهم) وە حەلێکیش کە چاویان بە مسڵمانەکان بکەوتایە (قالوا ان هؤلاء لضالون) ئەیانووت ئەمانە گومــران ، چونکە لە ڕێی باووباپیری خۆیان لایانداوە ، وە لەســەر دینی خۆیان نەماوون ٠

وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ(٣٣)

لەکاتێکا کە (ئەوان) بە چاودێر نەنێرراوون بۆ سەر مسلمانەکان (تا ئەم قسەیە بکەن)(٣٣)

بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی بێحەیایییە ، کە بێبڕوا بە بڕوادار بڵێ گومڕا • قورئان لێرەدا دەمقالێی «مناقشە» ناکات لەسەر مسلمانەکان ، چونکە قسەکەیان هیچ نرخێکی نییە ، بەڵام گاڵتەیەکیان پێئەکات کە لووتیان بچووزێتەوە ، ئەفەرموێ (وما ارسلوا علیهم حافظین) ئەم بێبڕوایانە نەنێرراونەتە سەر مسلمانەکان بە چاودێرو ئامۆژگار ، واتە ئەوان حەقی ئەم قسەیان نییە ، چونکە نە کەس بانگی کردوون بۆ ئەم قسەیە ، وە نە ئەمەش کاری ئەوانە ، تا خۆیانی تێهەڵقورتێنن •

لە هەموو کاتێکا ، وە لە هەموو شوێنێکا ، ئەم پیاو خراپانە هەن ، کەبەیانیانو ئێواران سەر ڕێ بە مەردوم ئەگرن ، وە هەرکەسێك بە بەردەمیانا بڕوا تەوانجی تێئەگرنو کۆڕی پێئەگرن ، بەڕاستی ئەم ئایەتانە ئەڵێی بۆ ئەمڕۆ هاتوونەتە خوارەوە •

بەڵێ هەروابووە ، کە دین کزبوو ، ڕەووشتو خوو نەما ، ڕێی ڕاست کوێر بووەوە ، بێشەرمیو بێحەیایی بڵاو بووەوە ، دۆستایەتیو برایەتی وون بوو ، گەورەو بچووکیی باریکرد ، ڕاستگۆو درۆزن تێکەڵ بوون ، چاوو ڕاو دەستی پێکرد ، وە هەموو کەسێك ویستی نەنگو ناتەواویی خۆی بە غەیبەتی گەورەتر لە خۆی داپۆشێ ، کاتێك کە مەردوم گەیشتە ئەم ڕادەیە ، ئیتر دەنگی حەق لەناوا کز ئەبێ ، منداڵی دەمڕووتی بێژیریو بیبر ، گاڵتە بە پیری خاوەن بیرو ، نەخوێندەوار بە خوێندەوارو ، بێدین بەدیندارو ، سەرسەریی بە پێشەوای زانا ، ئەکات ، ئنجا ئەمە ئەوپەڕی خراپیو بێشەرمییە ،وە سەرەتای لەناوچوونی گەلە ، ئەگەر چاکانو تێگەیشتوان تێنەکۆشن ، وە چاکی ، ئامۆژگاریی نەکەن بەلادا ، ئەو گەلە ئەمرێو ئەبێ بە واتەی ڕۆژگار •

فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ(٣٤) عَلَى الْأَرَائِكِ يَنْظُرُونَ(٣٥) هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ؟(٣٦) •

---

ئەمڕۆ (کە ڕۆژی دوایی‌یە) ئەوانەی کە بڕواداربوون ، بەبێبڕواکان پێ‌ئەکەنن(٣٤) لەسەر تەختو بارەگاوە تەماشا ئەکەن(٣٥) (تا بزانن) ئایا تۆڵەی ئەو بێبڕوایانە دراوەتەوە ، لەسەر ئەو کردەوانەی کە ئەیانکرد (لە جیهانا)(٣٦) •

---

ئەمە کردەوەی بێبڕواکان بوو لەگەڵ مسلمانەکان لەجیهانا ـ کە پێیان پێ‌ئەکەنینو چاویان لێ‌دائەگرتن ، ئنجا تەماشای کردەوەی مسلمانەکان بکەن ، لەگەڵ بێبڕواکان لەڕۆژی دوایی‌دا ، ئەفەرموێ (فاليوم الذين آمنوا) ئەمڕۆ ـ کە ڕۆژی دوایی‌یە ـ بڕوادارەکان (من الكفار يضحكون) بەبێبڕواکـان پێ‌ئەکەنن ، چونکە هەمـوو هیواو ئامانجێکیـان هاتۆتە دیـی ، وە بە بەری کردەوەی باشـو خواپەرستیی خۆیان گـەیشتوون ، وە دوژمنەکانیشـیان ئەبینین بە کەسـاسیی‌و ڕیسوایی کە سزا ئەدرێن (على الارائك ينظرون) لەسەر تەختو بارەگاوە تەماشایان ئەکەن تا بە چاوی خۆیان ببینن (هل ثـوب الكفار ما كانوا يفعلون) ئایـا تۆڵەی بێبڕواکان دراوەتەوە لەسەر ئەو کردەوە ناشیرینانەی کە لەگـەڵ بڕوادارەکانا ئەیانکرد ؟

سُورَةَ الإنشِقاق

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم

إذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ(١) وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ(٢)

# سوورەی ( انشقاق )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**کاتێك کەئاسمان لەت بوو(١) وە ملکەچیی کرد بۆ پەروەردگاری خۆیو شایستە (ی فەرمانبەریی) بوو(٢) .**

---

# سوورەی ( انشقاق )ە

**مەککی‌یە ، ٢٥ ئایەتە ، ١٠٧ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئەم سوورەتەش وەك سوورەتی «تکویر»و «انفطار» دەستپێ‌ئەکات بەباسی وێران بوونی جیهانو تێکچوونی ئاسمانو زەویی لەسەرەتای ڕۆژی دوایی‌یەوە ، ئەفەرموێ (اذا السماء انشقت) کاتێك کە ئاسمان لەت بوو ، وە ئەم دەستووری ئاسمانو زەوی‌یە تێکچوو ، بەم ڕەنگە دوو ئەستێرە بە تەنشت یەکا بڕۆن ، وە بە هێزی کێشندە یەکتری ڕاکێشنو بەیەکا هەڵتەقێن (واذنت لربها) وە گوێی گرتو ملکەچیی کرد بۆ فەرمانی خوای خۆی لەم لەتبوونەدا ، وەك گوێ‌گرتنی یەکێك کە فەرمانبەریی گەورەی خۆی بکات (وحقت) وە شایستە بوو بۆ فەرمانبەریی ئەو خوایەی کە دروستی کردووەو هەزاران ملیون ساڵ ڕایگرتووە ، ئێستاش کەوا نۆرەی ڕووخانو تێکچوونی هاتووە ، ئەیرووخێنیو تێکی ئەدات ، بێ‌ئەوەی کە بتوانێ سەرپێچی بکات ، دیارە لەو دەمەدا کە ئاسمان تێکچوو ، وە ئەستێرەکان**

وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ(٣) وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ(٤) وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا
وَحُقَّتْ(٥) يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ! إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحاً
فَمُلَاقِيهِ :(٦)

---

وە ساتێك کە زەوی پانکرایەوە(٣) وە ئەوەی تیابوو فڕێی داو وازی لێهێنا(٤) وە ملکەچیی کرد بۆ پەروەردگاریی‌و شایستەکرا(٥) ئەی ئادەمیی تۆ بێگومان تێکۆشەرییت بەرەوڕووی پەروەردگارت بە تێکۆشان ! ئەوسا پێی ئەگەیت:(٦) •

---

هەڵوەریین ، زەوییش لەجێگای خۆی ئەترازێ ، وە هێزی کێشندەی نامێنێ ، وە هەرچی شاخ‌و کێوی هەیە هەمووی داشەڕووخێ‌و لەیەك بەرئەبێ ، وەك چەرمێك کە ڕایکێشییت لەهەموو لایەکەوە ، پان ئەبێتەوەو قەبارەی گەورەتر ئەبێ ، وەکو ئەفەرموێ (واذا الارض مدت) ساتێك کە زەویی ڕاکێشراو پانکرایەوە •

دیارە لەو حەڵەدا ، هەرچی لەناو زەوییدابێ دەرئەپەڕێ ، وەکو ئەفەرموێ (والقت مافیها وتخلت) هەرچی تیابوو لە کان‌و غەزنە ، فڕێیدایە دەرێ ، وە ناوی خاڵیبوو • زەویی لەو دەمەدا لەژێر فەرمانی خوای گەورە ناتوانێ بچێتە دەرەوە ، وە ملکەچ‌و فەرمانبەرە ، وەکو ئەفەرموێ (واذنت لربها) وە گوێی گرت‌و ملکەچیی کرد بۆ پەروەردگاری خۆی لەمانادا (وحقت) وە شایستە بوو بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوا •

مەبەس لە گوێگرتنی ئاسمان‌و زەویی‌و ملکەچییان بۆ خوا ئەمەیە کە هەرگیز لە فەرمانی ناتوانن بچنە دەرەوە ، وە هەر ساتێك ئارەزوو بکات تێکیان ئەدات ، هەروەك لە پێشەوە دروستی کردوون ، واتە هەر ساتێك ئەمانەی پێشوو ڕوویدا ، ئادەمیی بە خزمەت خوای خۆی ئەگات ، وە بەری کردەوەی خۆی ئەبینێ ، وەکو ئەفەرموێ (یا أیها الانسان) ئەی ئادەمیی (انك کادح الی ربك کدحا فملاقیه) تۆ بێگومان تێکۆشەرییت ، وە لە هەوڵ‌و تەقەلادایت لە چاکە یا لە خراپە ، وە بەرە بەرە ڕووەو مردن ئەڕۆیت ، وە بەرەو ڕووی پەروەردگاری خۆت ئەبییتەوە ، واتە وانەزانییت ، کە لە جیهانا بە ئێجگاریی ئەمێنییتەوە ، وە هەر دەست درێژیی‌و زۆرو ستەمێکی تیا بکەیت ، هەروا وون ئەبێ ، نەء ، وانییە ، بەڵکو تۆ بە هەموو

فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ (٧) فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً (٨)

**ئنجا ئەو کەسەی کە نامەی (کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی(٧) ئەوسا پرسینەوەیەکی سووکو ئاسانی لەگەڵ ئەکرێ(٨)**

هەناسەیەك ، خشتێك لە بناغەی عمری خۆت دەردێنییت لەبن ، وە بە هەموو هەنگاوێك ، کە لەکردەوەی خۆتا ئەی‌نێیت هەنگاوێك بەمردن نزییك ئەکەویتەوە ، تا ئەو ڕۆژەی بە ئێجگاریی لنگی لێ‌ڕائەکێشیت ، وە بەچاوی خۆت ڕۆژی دوایی ئەبینیت ، وە ئەوشتانەی کە بڕوات پێ‌نەئەکردن دێنەڕێت •

⊙ ⊙ ⊙

ئەمە لەهەموو کەسێکەوە ئاشکراو نمایانە ، یەکێك ئەگەر نامەیەکی مزگێنی بدرێتێ ، وە بزانێ کە مزگێنی تیایە ، خێرا ئەچێ بە پیرێوە ، وە بە هەموو هۆش‌و گۆشێکەوە ، ڕووی‌تێ‌ئەکات ، وە بە گەرم‌و گوڕیی وەری ئەگرێ بەدەستی ڕاستی ، تا نامەکەی لەدەست نەکەوێتە خوارەوە ، چونکە دەستی ڕاست بەهێزترە لەدەستی چەپ بۆ گرتنی شت ، بەڵام ئەگەر کاغەزێکی ناخۆشیی بدرێتێ ئەو حەلە نایەوێ کاغەزەکە وەربگرێ ، وە ئەگەر هەر وەریشی گرت بە ساردیەکەوە ، وە بە دەستی چەپی وەری ئەگرێ ، بەڵکو لەدەستی بکەوێتە خوارەوە ، خۆ ئەگەر لەکاتی وەرگرتنا ، تەنشت یا پشتیشی تێ‌کرد ، ئەوە ئیتر مەعنای وایە کە هەر زۆر وەرسە لەوەرگرتنی •

کەوابوو نامە وەرگرتن بەدەستی ڕاست ، یا بەدەستی چەپ ، یا لەپشتەوە نمایشی چۆنێتی‌و تمثیلی حاڵی کەسێکە کە لەو ڕۆژەدا ئاگاداربێ بە کردەوەی پاك، یا پیسی خۆی ، ئنجا هی وا هەیە لەو ڕۆژەدا کە کردەوەی خۆی بۆ دەرئەکەوێ ، کەیف خۆش ئەبێ‌و ئەگەشێتەوە ، کە ئەمە ناوبراوە بە وەرگرتنی نامە بەدەستی ڕاست ، وە هی واش هەیە گرژ ئەبێ‌و ناوچەوان ئەدا بە یەکا ، وە ڕووی لێ‌وەرئەگێڕێ‌و پشتی تێ‌ئەکات ، وە لەخوای ئەوێت کە هەرگیز چاوی پێ‌نەکەوێت، کە ئەمەش ناوبراوە بە وەرگرتنی نامە بە دەستی چەپ ، یا لەپشتەوە ، وەکو ئەفەرموێ (فاما من اوتی کتابه بیمینه) ئنجا هەرکەسێك لەڕۆژی دواییدا نامەی کردەوەی درایە دەستی ڕاستی (فسوف یحاسب حسابا یسیرا) ئەوسا پرسینەوەیەکی

وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُوراً(٩) وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ(١٠) فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُوراً(١١) وَيَصْلَى سَعِيراً(١٢) إِنَّهُ كَانَ فِي أَهْلِهِ مَسْرُوراً(١٣) إِنَّهُ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ(١٤) بَلَى إِنَّ رَبَّهُ كَانَ بِهِ بَصِيراً(١٥)

---

**وە بە شادمانیی ئەگەڕێتەوە بۆ لای کەس‌وکاری(٩) وە ئەو کەسەی کە نامەی لەپشتەوە درایە (١٠) ئەوسا داوای مردنی خۆی ئەکات(١١) وە ئەچێتە دۆزەخەوە(١٢) (چونکە)ئەو لەناو کەس‌وکاریا شادمان بووە(١٣) وە ئەو وای گومان بردووە ، کە هەرگیز ناگەڕێتەوە (لای خوا)(١٤) نەخێر وانی‌یە چونکە پەروەردگاری ئەو ئاگاداربووە پەو(١٥) .**

---

**سووک‌و ئاسانی لەگەڵا ئەکرێ (وینقلب الی اهله مسرورا) وە بە کەیف‌و خۆشیی ئەگەڕێتەوە بۆ لای کەس‌و کارو ئاشناو ڕۆشنای ، لەپیاوچاکان‌و خواپەرستان ، لەوانەی کە لەپێش ئەما چوون بۆ بەهەشت ،واتە کێ لەجیهانا زۆر خۆش‌ویستووە لەچاکان ، ئەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوان بە خۆشیی (واما من اوتی کتابه وراء ظهره) وە ئەو کەسەی کە نامەی دراێی لەپشتەوە (فسوف یدعوا ثبورا) ئەوسا ئەڵێ : هاوار بۆ خۆم ، واتە ئاوات بەمردنی خۆی ئەخوازێ (ویصلی سعیرا) وە ئەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەبەر دوو شت :**

**یەکەم (انه کان في اهله مسرورا) چونکە ئەو ، لەجیهانا لەناو کەس‌وکارو ئاشناو ڕۆشنایا ، زۆر کەیف خۆش‌و سەرو دڵ خۆش،وە بێ‌ئاگا بووە لەپاشە ڕۆژی، وە هەرچی ئارەزووی کردبێ ، کردوویەتی ، بێ‌ئەوەی ترسابێ لەڕۆژی دوایی ، بەڵام ئەمڕۆ بە پێچەوانەی دنیا ، خەمبارو خەفەتبارە ، وە دەردو زووخاو ئەچەژێ .**

**دووهەم ( انه ظن ان لن یحور ) ئەو وای ئەزانی کە زیندو نابێتەوەو ناچێتەوە بەردەمی خوا بۆیە خۆی بۆ ئامادە نەئەکرد (بلی) نەخێر وا نی‌یە کە تێی گەیشتووە ، بەڵکو لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەچێتەوە لای خوا ، وە پرسیاری هەموو کردەوەیەکی لێ‌ئەکات ، وە پاداشی چاکەی بە چاکەو خراپەی بە خراپە ئەداتەوە (ان ربه کان به بصیرا) چونکە بێ‌گومان پەروەردگاری ئەو ئاگادار**

فَلاَ أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ(١٦) وَ اللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ(١٧)

سوێند ناخۆم بە سووریی ئاسمان(١٦) وە بە شەوو ئەو شتانەی کە کۆیان ئەکاتەوە(١٧)

بووە بەو ، واتە ئەو خوایەی کە ئادەمیی دروست کردووە بەم هەموو ژیریی‌و بییرە بەرزەوە ، کە پەی ببا بە نهێنی ئاسمان‌و زەویی ، وە هەرچی هەیە لە جیهانا، رامی ژێر دەستی خۆی بکات ، هەر بۆ ئەوەی دروست نەکردووە ، کە لەگەل گیان‌لەبەرانی‌ترا جیاوازیی نەبێ ، وە هەردوولایان لە دوای چەند ڕۆژێك ژیان ، بچنەوە پەردەی نەبوون ، بەڵکو فەلسەفەو دادی خوا لە دروست کردنی ئادەمیی‌دا ، بەم پلەو پایە بەرزەوە ، وا داوا ئەکات ، کە لە دوای ئەم ژیانی جیهانە ، ژیانێکی تری ببێ ، تا بەبەری کردەوەی خۆی بگات ، وە بە ترازووی داد بۆی بکێشرێ ، بەڕاستی ئەگەر خوا ئەم هەموو ژیریی‌و بییرو زانین‌و زانیاری‌یەی دابێ بەئادەمیی، لەپاشا هەروا بەرەڵڵای بکات‌و لێی نەپرسێتەوە ، وە لەگیاندارانی‌تر جیای‌ناکاتەوە، ئیشەکەی زۆر ، بێ جێ‌و بێ ڕێ ، وە بێ فەلسەفە ئەبێ ، بەڵکو هەرچی داد بێ تیا نابێ ، کە ئەمەش لە خواوە دوورە •

⊙ ⊙ ⊙

ئنجا بۆ بەهێزکردنەوەی ئەمانە ، خوا سوێند ئەخوات بە چەند شتێکی وا کە نیشانەی تاك‌و تەنیایی‌و گەورەیی خوان ، وە بۆ ئادەمیش زۆر بەکەڵکن ، ئەفەرموێ (فلا اقسم بالشفق)(١) سوێند ناخۆم بە دەمەدەمی ئێوارێ کە هەموو کەسێکی تیا ئەکەوێتە پەلەپەل‌و دەستوبرد بۆ خۆکۆکردنەوەو ئیش‌وکار تەواوکردن ، وە هەموو کەسێکی تیا ئەکەوێتە خۆ ئامادە کردن بۆ ئەو شەوە تاریکەی کە ڕووی تێ‌ئەکات ، وە نازانێ چی تیا ڕوو ئەدات ( والليل وما وسق ) وە بە شەوو ئەو شتانەی کە کۆیان ئەکاتەوە •

ئاشکراو نمایانە ، ئەوی لە ڕۆژا بلاوەی لێ‌ئەکات ، لە شەوا کۆئەبێتەوە ،

(١) لە سوورەی (حاقە) و (تکویر)دا تەفسیری (فلا اقسم)مان کرد ، وە ووتمان کە ئەمە جۆرێکە لە سوێند •

وَالْقَمَرِ إِذَا اتَّسَقَ(١٨) لَتَرْكَبُنَّ طَبَقاً عَنْ طَبَقٍ(١٩) فَمَا لَهُمْ
لاَ يُؤْمِنُونَ؟(٢٠) وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لاَ يَسْجُدُونَ؟(٢١)

**وە بەمانگ لەکاتێکا کە پڕ ئەبێتەوە(١٨) (ئێوە) تێئەپەڕن بە پلە لەدوای پلە(١٩) ئیتر بۆچی بڕوا ناهێنن؟(٢٠) وە کاتێك کە قورئانیان بەسەرا بخوێنرێتەوە ملکەچیی ناکەن؟(٢١)**

ئاژاڵ لە پەچـەو مۆڵگەو ، باڵندە لە هێلانەو کولانەو گیانداریتر لە بێشـەو لانی خۆیانا کۆئەبنەوە ، تەنانەت ئەو پەڵەو باڵانەی کە لە ڕۆژا ئەکرێنەوەو ئەجووڵێنەوە، لە شـەوا کۆئەبنەوەو ، لە جووڵە ئەکەوون بۆ حەسانەوە (والقمـر اذا اتسق) وە سوێند بە مـانگ لەکاتێکا بە تەواویی ڕوونـاك ئەبێتەوە ، وەك شـەوی سیانزەو چواردەو پانزە بێ •

کاتی ڕۆژئاوا کاتێکی زۆر بەسامە کەوا پاشای ئاسمان ــ کە ڕۆژە ــ پەردەی ڕەشی بەسـەرا دائەدرێتەوە ، دوای ئاوابوونی ڕۆژیش مەردوم هەست ئـەکات بە تارییکی‌یەکی ، تێکـڕای کش‌ومات ، وە بە بێ‌دەنگی‌یەکی ئێجگار قـووڵ ، لەگەڵ ترسێکی پەنهانیی‌و بیمێکی نهانیی لە دووتوێی دەروونا •

شەوی مانگە شەویش کاتێکی هێواش‌و لەسەرخۆیە ، تارای زیبوینی بەسەر هەموو شوێنێکەوە ترییفەی دێ ، کەس نی‌یە لەو شەوانەدا ، مانگ نەچرپێنی بە گوێچکەیاو ، خوای بیر نەخاتەوە بە خۆی‌و هەموو دەسەڵاتێکی‌یەوە ، واتە سوێند بەمانە (لترکبن طبقا عن طبق) ئێوە تێئەپەڕن بە پلە ، لە دوای پلە ، وەك ژیانی یەکەم‌و مردن‌و زیندووبوونەوە بێ ، واتە پلە بە پلە ئەم ڕێگایانە ئەبڕن تا ئەچنەوە لای خوا •

⊙ ⊙ ⊙

کاتێك کە خوا ئادەمیی دروست کرد بۆ ئەوەی دوو ژیانی ببێ ، وە شێوەی دروست کردنەکەی کرد بە بەڵگە لەسەری ، لەپاشا سوێندیشی لەسەر خوارد (فما لهم لا یؤمنون) ئیتر بۆچی بڕوا ناهێنن بە خوا ؟ (واذا قریء علیهم القرآن لا یسجدون) وە کاتێـك کە قورئانیـان بەسەرا بخوێنـرێتەوە ملی بۆ کەچ نـاکەن‌و سـەری بۆ

بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا يُكَذِّبُونَ(٢٢) وَاللهُ أَعْلَمُ بِمَا يُوعُونَ(٢٣)
فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ(٢٤) إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ،
لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ(٢٥) ٠

**بەڵام ئەوانەی کە بێبڕوان بەدرۆی ئەزانن(٢٢) وەخوا ئاگادارترە بەوەی کە لەدڵی ئەگرن(٢٣) ئنجا مژدەیان بدەرێ بەسزای سەخت(٢٤) بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردووە ، بۆ ئەوان هەیە پاداشی بێبڕانەوە(٢٥) ٠**

**دانانەوێنن ؟ کە لەناو نامەی هەموو پێغەمبەرەکانا ، هەر قورئانە کە قسە لەگەڵ سروشتی ئادەمییدا بکات ، وە هەر دەمەی ، بە چەشمەندازێکی بوونەوەر ، خوا بیری مەردوم بخاتەوە ، وا مەزانن کە سووچ لە قورئانەوەیە ، وە دەنگی ئەم ئاگاتە کونو قوژبنی دڵیان ، وە دەرگای دڵو دەروونیان ناشکێنێ ، بەڵێ ئەم کاری خۆی ئەکات (بل الذين كفروا يكذبون) بەڵام ئەوانـەی کە بێبڕوان ، لەبەر لاسارییو سەهندەیی خۆیـان بەدرۆی ئەزانن ، کە وابوو مایەی بڕوا نەهێنانیـان ، کەموو کووڕیی قورئـان نییە ، بەڵکو سووچی ئادەمییەکانە ، کە بە دەنـگی قورئانەوە ناچن ، کە بێدارکەرەوەیە بۆ بیستنی دەنگی سروشتو قسەی دەروون (والله اعلم بما يوعون) وە خوا ئاگادارترە لەخۆیان بەوەی کە لە دڵیانا کۆیئەکەنەوە ، واتە خوا ئاگای لێیە کـە قورئان ، دایانئەچڵـەکێنێ ، بـەڵام بـڕوا ، کە ناهێنـن لەبەر لاسارییانە (فبشرهم بعذاب اليم) کەوابوو مزگێنییان بدەرێ بە سزاو تۆڵەی بە ئێشوئازار (الا الذين آمنوا) بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە (وعملوا الصالحات) وە کـردەوە باشەکانیان کـردووە (لهم اجر غـير ممنون) بۆ ئەوان هەیـە پاداشی بێبڕانەوە ٠**

سُورَةَ الْبُرُوج

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ

وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ (١)

## سوورەی ( بروج )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند به ئاسمانی خاوەن کەلو «برج»وەکان(١)**

## سوورەی ( بروج )ە

**مەککی‌یە ، ٢٢ ئایەتە ، ١٠٩ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئەم سوورەتە کورتە ، لەپاش چەند سوێندێك نموونەیەکمان نیشان ئەدات ، لە بیروباوەڕو کرداری بڕواداران ، بۆ ئەوەی ببێ بە سەرمەشق بۆ هەموو بڕوادارێك لە جیهانا ، بە ڕەنگێکیوا کە دەست لە ژیانو جیهان هەڵگرن لە پێناوی بیروباوەڕا ، ئەفەرموێ : (والسماء ذات البروج) سوێند بە ئاسمان کە خاوەنی دوانزە کەلوو «برج» وە ، شەشیان وەك «حمل»و «ثور»و «جوزا»و «سرطان»و «اسد»و «سنبلە» بێ ، لە سەروو «شمال»ی هێل «خط»ی استواوەن ، شەشەکەیتریان وەك «میزان»و «عقرب»و «قوس»و «جدی»و «دلو»و «حوت» بێ لە خواروو «جنوب»یەوەن ، لەساڵێکا ڕۆژ ــ وەك دێتە بەرچاو ــ بە هەر دوانزە کەلووەکەدا ئەڕوا ، لە یەکەم ڕۆژی بەهارا ئەچێتە کەلووی «حمل»ەوە ، بە سێ مانگەی بەهار سێ کەلووی «حمل ٠ ثور ٠ جوزا» ئەبڕێ ؛ لە یەکەم ڕۆژی هاوینا ئەچێتە کەلووی «سرطان»ەوە ، بە سێ مانگەی هاوین سێ کەلووی «سرطان ٠ اسد ٠ سنبلە» ئەبڕێ،**

وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ (٢) وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ (٣)

وە بەو ڕۆژەی کە بەڵێنی پێدراوە(٢) وە بە هەموو بینەرو بینراوێك(٣) •

لە یەکەم ڕۆژی پایزا ئەچێتە کەلووی «میزان»ەوە ، بە سێ مانگەی پایز سێ کەلووی «میزان • عقرب • قوس» ئەبڕێ ، لە یەکەم ڕۆژی زستانا ئەچێتە کەلووی «جدی»یەوە ، بە سێ مانگەی زستان سێ کەلووی «جدی • دلو • حوت» ئەبڕێ ، کەوابوو لە شەش مانگەی بەهارو هاوینا ڕۆژ لە شەش کەلووی لای سەرەوەدایە ، وە لە شەش مانگەی پایزو زستانا لە شەش کەلووی لای خوارەوەدایە •

ئەم کەلووانە بەم ناوانە ناو براوون چونکە هەر یەکێکیان لە کۆبوونەوەی چەند ئەستێرەیەك پەیدا بووە کە لە وێنەی یەکێك لەمانەی پێشوودایە •

(والیوم الموعود) وە بەو ڕۆژەی کە خوا بەڵێنی پێداوە ، وەك ڕۆژی دوایی بێ ، کە هەرچی کردەوە هەیە ، تیا دەرئەکەوێ بەبێ پەردە ، وە هەرچی بەندەگان هەیە ، ڕائەنوێنرێن بە جۆرێك کە هەموو چاکەو خراپەیەکیان دەربکەوێ ، وە هەموو کەسێك هەموو شتێك ببینێ ، وەکو ئەفەرموێ (وشاهد) وە بەوانەی کە هەموو شتێك ئەبینن لە دەشتی کۆبوونەوەدا (ومشهود) وە بەو شتانەی کە ئەبینرێن •

خوا لێرەدا بە سێ شت سوێند ئەخوات ، یەکەمیان بە ئاسمانی خاوەن کەلوو ، کە هێندێ شتی لێمانەوە دیارە ، وەك ڕووناکیی ئەستێرەکانو هەڵاتنو ئاوابوونیان بێ ، وە هێندێ شتیشی لێمانەوە وونە وەك ئەو شتانەی کە لە ناویانان •

دووهەمیان بە ڕۆژی دوایی کە بە تەواویی لێمانەوە نادیارە بە خۆیو ئەو شتانەی کە تیا ڕووئەدات لە زیندووبوونەوەو پرسینەوەو تۆڵەو پاداش کە ئەمانە هیچیان لەجیهانا نایانبینین •

سێهەمیان بە شتێکە کە ئاشکراو نمایانە وە بەچاو ئەبینرێ •

بەم سوێند پێخوراوانە نیشانمان ئەدات کە هەموو شتێك نرخێکی خۆی هەیە نابێ بە چاوی سووك تەماشا بکرێ ، بەڵکو ئەبێ وورد ببینەوە لەو شتانەی کە

قُتِلَ أَصْحَابُ الْأُخْدُودِ :(٤) النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ(٥) إِذْهُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ(٦)

**نەفرین کرا لەخاوەن لەغەمەکان :(٤) ئەو ئاگرەی خاوەن سووتەمەنی (وبڵێسە)یە کاتێك کە ئەوان دانیشتبوون بەسەریانەوە(٦)**

لێمانەوە دیارن ، تا بەهرەیان لێوەرگرین ، وە هەووڵ بدەین بۆ زانینی ئەو شتانەی کە لێمانەوە نادیارن ، وە خۆمان ئامادە بکەین بۆ ئەو شتانەش کە لەمەولا تووشمان ئەبێ •

واتە سوێند بەمانەی پێشوو ، لە پێش ئێوەدا ، کۆمەڵێکی خوا ناسی خاوەن بڕوا بوون ، لە گاورە بڕوادارەکانی «نجران» لەکاتێکا کە دینەکەیان دینی تاکو تەنیایی «توحید» بوو ـ تووشی دوشمنێکی دڵ ڕەقی ، زۆرداری ، بێ دینی ، خوا نەناس بوون ، هەمیشە سزاو دەردی سەریان ئەدان ، بۆ ئەوەی پەشیمانیان بکەنەوە لە دینەکەیان ، وە دەستیان پێهەڵگرن لە بیروباوەڕەکەیان ، بەڵام کە زانییان هەوڵو تەقەلاکەیان بێسوودە، بڕیاریاندا کە بیانسووتێنن، هاتن لەغمێکی گەورەی درێژیان بۆ هەڵکەندنو ئاگریان تیاکردەوە ، یەکە یەکە بڕوادارەکانیان ئەهێناو ئەیانخستنە ناو ئاگرەکەوە ، خۆشیان سەیریان ئەکردن ، بێئەوەی بەزەییان پێیانا بێتەوە، یادڵیان بۆیان داچڵەکێ ، وە بێئەوەی کە بڕوادارەکانیش، لە بڕواکەی خۆیان پەشیمان بنەوە ، یا ترسێکیان لێبنیشێ ، بەڵکو ، مەردانە باوكو دایكو خوشكو برا ، لەبەرچاوی یەکتریی ئەهاتنو خۆیان فڕێئەدایە ناو ئاگرەکەوە •

واتە سوێند بەمانەی پێشوو بڕوادارەکان دانیان گرت بە خۆیانا ، وە بێبڕواکانیش تۆڵەیان لێسەندرا ، بە تۆڵەی خوایی ، وە ئەگەر ئێوەش ـ ئەی مسڵمانەکان ـ دان بەخۆتانا بگرن ، خوا هەم پاداشتان ئەداتەوە ، وە هەم تۆڵەتان بۆ ئەسێنێ لە دوشمنەکانتان ، وەکو ئەفەرموێ (قتل اصحاب الاخدود : النار ذات الوقود) نەفرین کرا لە خاوەن ئاگری لەغمەکان : ئەو ئاگرەی خاوەن بڵێسەو سووتەمەنیی ، واتە تووشی تۆڵەو سزای خۆیان بوون (اذ هم علیها قعود) لەکاتێکا

وَهُمْ عَلَى مَا يَفْعَلُونَ بِالْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ(٧) وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ(٨) الَّذِى لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاللهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ(٩) إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ـ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا ـ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ،

---

**وە ئەوان سەیری ئەوەیان ئەکرد کە ئەیانکرد بە بڕوادارەکان(٧) وەئەم سزایەشیان نەئەدان ، تەنیا لەبەر ئەوە نەبێ ، کە بڕوایان هێنابوو بە خوای بەدەسەڵاتی سوپاسکراو(٨) ئەوەی کە پاشایەتیی‌ئاسمانانو زەویی بۆ ئەوە ، وە خوا ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکا(٩) بەڕاستیی ئەوانەی کە سزای پیاوو ژنە بڕوادەرەکانیانداو لە پاشیشا پەشیمان نەبوونەوە ، بـۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ ،**

---

**کە دانیشتبوون بە دیار لەغمەکانەوە (وهم علی ما یفعلون بالمؤمنین شهود) وە ئەوان سەیری ئەوەیان ئەکرد کە ئەیانکرد بە بڕوادارەکان ، وە تەماشای زیندووەکانیان ئەکرد کە لەناو ئاگرەکەدا چۆن ئەسووتانو هەڵئەقـرچان (وما نقموا منهم الا ان یؤمنوا بـالله العزیز الحمید) ئەم سزایەشـیان کە ئەدان هەر لەبەر ئـەوە بوو کە بڕوایان هێنابوو ، بە خوای گەورەو بە دەسەڵاتی سوپاسکراو ، کە هەرچی ئیشو کاری هەیە ، هەمووی جوانو پەسەندە ، تەنانەت ئەگەر بڕوادارێك دووچاری سزاو ناخۆشی‌یەك بکات لە جیهانا ، ئەوە بۆ ئەوەیە کە قاڵی بکاو فێری خۆڕاگرتنو دان بەخۆداگرتنی بکات ، یا بۆ ئەوەیە کە پاداشی بداتەوە بە چاکە •**

**ئنجا بۆ ئەوەی نیشان بدات کە هیچ زۆردارێکی ستەمکار ، ناتوانێ دەرچێ لە دەست خوا ، وە خوا ئاگادارە بە هەموو کردەوەیەکیان ، فەرمووی (الذی له ملك السماوات والارض) ئەو خوایەی کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەویی‌یە ، وە هەرچی‌یان تیایە لەژێر چنگی دەرناچێ (والله علی کل شیء شهید) وە خوا ئاگادارە بە هەموو شتێك ، وە هیـچی لێ وون نـابێ ، وە پاداشی چاکە بـە چاکەو خراپە بـە خراپە ئەداتەوە (ان الذین فتنوا المؤمنین والمؤمنات) بێ‌گومان ئەو بێ‌بڕوایانەی کە پیاوو ژنە خاوەن بڕواکانیان سووتان بۆ ئەوەی کە پەشیمانیان بکەنەوە لە بڕواکەیان (ثم لم یتوبـوا) لەپاشیشا تۆبەیان نەکرد (فلهـم عذاب جهنم) هەیە بۆ ئـەوان سزای**

وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ (١٠) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ
جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ، ذَلِكَ الْفَوْزُ الْكَبِيرُ (١١) إِنَّ
بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ (١٢) إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ (١٣)

---

وە سزای (ئاگری) سووتێنەر (١٠) ئەوانەی کە بڕوایان هێناوکردەوە باشەکانیان کرد ، بۆ ئەوان هەیە چەند بەهەشتێك کە جۆگە ئاوی زۆر ئەڕوا بەژێریانا ، ئا ئەوەیە بەهرەمەندیی گەورە (١١) بەڕاستی دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە (١٢) هەر ئەوە کە لە سەرەتاوە (مەردوم) دروست ئەکاتو (دوایی) زیندووی ئەکاتەوە (١٣)

---

دۆزەخ (ولهم عذاب الحریق) وە هەیە بۆ ئەوان سزای ئاگری سووتێنەری بەتین •

نموونەی ئەم بڕواداران و بێبڕوایانە لە هەموو کاتێکا ، وە لە هەموو شوێنێکا هەن ، کە بە زۆرو ستەمی خۆیان ، بەرهەڵستی چاکان ئەوێستن ، وە هەزاران درۆودەلەسەیان بۆ هەڵئەبەستن ، وە دەردی سەرییان ئەدەن ، وە بە هەموو جۆرێك هەوڵ ئەدەن بۆ ساردکردنەوەو پەشیمان کردنەوەیان •

لەپاش باسی ئازارو سزای زۆردارو ستەمکارەکان ، ئنجا باسی پاداشی بڕوادارەکان ئەکات ، ئەفەرموێ (ان الذین آمنوا وعملوا الصالحات) ئەوانەی کە بڕوایان هێناو کردەوە چاکەکانیان کرد (لهم جنات تجري من تحتها الانهار) بۆ ئەوان هەیە لە بەهەشتا چەند باخو باخاتێك کە هەر یەکە چەند جۆگە ئاو ئەڕوا بە بنیانا (ذلك الفوز الکبیر) هەر ئەو چوونە ناو بەهەشتەیە گەیشتن بە ئاواتی گەورە•

⊙ ⊙ ⊙

ئنجا بۆ هەڕەشە کردن لە هۆزی «قورەیش»و دوشمنەکانی پێغەمبەر ، وە بۆ دڵخۆشییدانەوەی پێغەمبەرو ئۆمەتەکەی، فەرمووی (ان بطش ربك لشدید) بێگومان دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆ ، زۆر سەختو گرانە ، واتە خوای تۆ کە زۆردارێکی ستەمکاری گرت ، زۆر خراپ ئەیگرێ ، وە ڕزگار بوونی نییە ، ئنجا هاتە سەر باسی دەسەڵاتی خوا ، فەرمووی (انه هو یبدیء ویعید) بەڕاستی هەر

وَهُوَ الْغَفُورُ الْوَدُودُ(١٤) ذُوالْعَرْشِ الْمَجِيدُ(١٥) فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ(١٦) هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْجُنُودِ :(١٧) فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ؟(١٨)

**وە هەرئەوە لێخۆشبووی میهرەبان(١٤) خاوەنی تەختو بارەگای گەورە(١٥) هەرچی ویست ئەیکات(١٦) ئایاپێتگەیشتووە داستانی لەشکرەکانی(١٧) فیرعەونو ثمود؟(١٨)**

خوایە کە لە سەرەتاوە مەردوم دروست ئەکاتو دوای مردن زیندووی ئەکاتەوە ، هەروەك هەموو ڕۆژێك بە چاوی خۆمان ئەبینین کە زۆر لە گیانلەبەرانو سەوزایی دروست ئەکاو ئەیانهێنێتە جیهانەوە ، لەپاش لەناوچوونیان ، دووبارەو سێبارە ئەیانهێنێتەوە ڕووی‌کار (وهو الغفور) وە هەرخوایە لێخۆشبوو لەگوناهی پەشیمانان (الودود) وەهەرئەوە کەچاکانی خۆش‌ئەوێ، وەلەهەردو جیهانا ئاگاداری‌یان ئەکات، بە گەورەیی‌و دەسەلاتی خۆی (ذو العرش المجید) خاوەنی تەختو بارەگای گەورەیە (فعال لما یرید) هەرچی‌یەکی ویست ئەیکات لەیارمەتیی چاکانو لەناوبردنی خراپان، واتە ئەی گەورەکانی قورەیش ئێوە لەکوێو زۆردارو ستەمکارەکانی پێش ئێـوە لەکوێ ، لەگەڵ ئەو هەموو دەسەلاتەی کە ئەوان بوویان ، چونکە لایاندا لەڕێی ڕاست ، خوا لەنـاوی بردن ، وەکو ئەفەرموێ (هل اتاك حدیث الجنود) ئایـا پێت گەیشتووە داستانی ئەو لەشکرو پاڵەوانانەی کە زۆر کەس لەبەریـان ئەلەرزیی (فرعون وثمود) وەك فیرعەونو گەلەکەی‌و ثمودو پاڵەوانەکانی بێ ، کە گەلێ لە ئێوە بەهێزترو بە دەسەلاتتر بوون ، لەگەڵ ئەمییشە خواگرتنی‌و لەناوی بردن ، چونکە زۆردارو ستەمکار بوون ، وە لەفەرموودەی خواو پێغەمبەرەکەیان دەرچوون٠

فیرعەون : پاشـای میسـر بـوو کە بە خـۆی‌و لەشکرەکەیـەوە یاخی‌بوون لەمووسا پێغەمبەر ، تا خوا خنکاندنی لەدەریادا وە گەلی جوولەکەی ڕزگار کرد لە دەستیان ٠

ثمود : تیرەیـەکی زۆرداری دەست‌داربوون لە عەرەب ، خـوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن ناوی صالح بوو ، هەرچەند بانگی کردن بۆ بڕواهێنان بە خواو ڕۆژی دوایی ، بڕوایان پێ‌نەهێناو بەقسەیان نەکرد ، تا خوا لەناوی بردنو کردنی بـە

بَلْ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي تَكْذِيبٍ(١٩) وَاللَّهُ مِنْ وَرَائِهِمْ مُحِيطٌ(٢٠)
بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ(٢١) فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ(٢٢)

بەڵکو ئەوانەی کە بێبڕوان هەمیشە لەبەدرۆزانیین (ی قورئان)دان(١٩) وە خواش بە هەموو شتێکیان ئاگادارە(٢٠) بەڵکو ئەوە(ی کە بە درۆی ئەزانن) قورئانێکی گەورەیە(٢١) لە لەوحێکی پارێزراوایە(٢٢) ٠

واتەی ڕۆژگار ، وە صالح پێغەمبەری ڕزگارکرد لەگەڵ چەند کەسێك لەگەڵیا کە بڕوایان پێهێنابوو ٠

خوا باسی ئەم دوو تیرەیەی کرد ، بۆ ئەوەی ، ژیری خاوەن بیر ، وورد ببێتەوە لەدەستوورو یاوی خوا لەناو گەلانا ـ تابێبڕوایان ئامۆژگاریی لێوەرگرن، وە ئاووڕێك بدەنەوە ، بەلای پێغەمبەرو ئایینەکەیا ، ئەگەر چاك بوو ، وە سەرچاوەی ڕەووشتو خووی جوان بوو ، ئەوا وەریگرن ، وە لە فەرموودەکانی دەرنەچن ، وە ئەگەر واش نەبوو ، ئەوا پشت گوێی بخەن ، بەلام وایان نەکرد ، بەڵکو هەرچێکیان لەپێغەمبەر ئەبیست بەدرۆیان ئەزانی،وەکو ئەفەرموێ (بل الذین کفروا في تکذیب) بەڵکو ئەوانەی کەبێبڕوان هەمیشە لەبەدرۆزانینی قورئانان واتە بە درۆی ئەزانن ، بێئەوەی لێی ووردببنەوە ، وە ئەو بێبڕوایانە هەر وان تا خوا لەناکاو ئەیانگرێ ، بێئەوەی بتوانن دەرچن ، وەکو ئەفەرموێ (والله من ورائهم محیط) خوا لەپشتیانەوە ، ئاگادارە بە کردەوەیان ، واتە هەرگیز لەدەستی دەرناچن، کەوابوو مەڵێن ئەم قورئانە ، سەرگوروشتەی هیچوپووچی پێشینانە، چونکە وانییە (بل هو قرآن مجید) بەڵکو قورئانێکی پیرۆزو گەورەیە ، پڕە لەپەندو ئامۆژگاریی هەردو جیهان ، وە لەسەرگوروشتەو داستانی مردنو زیندووبوونەوەی گەلانی ڕابوردوو ، و ەلە دەستوورو یاوی خوا لەجیهانا (في لوح محفوظ) هەڵگیراوە لە لەوحێکی پارێزراو لەدەستکاریی ٠

«لەوحی محفوظ» شتێکە خوا ئەفەرموێ کە قورئانی تیایە ، بەلام نافەرموێ ئەو لەوحە چییەو چۆنە ، پێویستە بڕوامان ببێ کە خوا قورئانی خۆی تیا داناوە ،

وە لەمە زیاتر هەرچێکی تر بووترێ زیادە ، چونکە لەدەم پێغەمبەر وەرنەگیراوە، وە هەرچییش لەدەم پێغەمبەر ، وەرنەگیرێ نابێ تێکەڵ بە بیروباوەڕی مسلمانان بکري •

شێخ محمد عبده ئەفەرموێ : چەند جوانە ئەگەر بمانەوێ تاویلی بکەین بڵێین: لەوحی محفوظ لەوحەی جیهانە ، واتە دەستووری قورئانو فەرموودەکانی ـ چونکە ڕێکی دەستوورو باوی جیهانە ، وە تا جیهان جیهان بێ ناگۆڕێ ، هەروەك لەسەر ڕووپەڕەی جــیهان نووسرابێتەوە ، وە لەسەر لەوحەی بوونــەوەر هەڵکەندرابێ وایە •

سُورَةُ الطارِق
بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم
وَالسمَاءِ وَالطارِقِ(١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطارِقُ؟(٢)

---

## سوورەی ( طارق )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند بە ئاسمان و ئەوەی کە لە شەوا دەرئەکەوێ(١) تۆ چوزانییت دەرکەوتوو ( ی شەو ) چیە ؟ :(٢) ٠**

---

## سوورەی ( طارق )ە

**مەککیە ، ١٧ ئایەتە ، ٧٢ ووتەیە**

بسم الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**خوا لەم سوورەتەدا باسی سێ پایەی گەورەمان بۆ ئەکات ، لە پایەی بیرو باوەڕ «عقائد»ی ئیسلام ، یەکەم جێگیرکردن «اثبات»ی خوا، دووهەم جێگیرکردنی زیندووبوونەوە ، سێهەم جێگیرکردنی پێغەمبەریەتیی پێغەمبەر ، لەبەرئەوەی کە یەکەمیان لە دوانەکەی‌تر گرنگترە ، وە لەدوای ئەو جێگیربوونی ئەمانی‌تر ئاسانە، بۆیە سوێندی لەسەر ئەخوات ئەفەرموێ (والسماء) سوێند بە ئاسمان ٠**

**ئاسمان بە هەموو لای ژووروو ئەڵێن کە بە هەزاران هەزار ملیۆن ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەی تیایە ، ئنجا خوا لەناو ئەو هەموو شتانەدا ، یەکێکیان تەرخان ئەکات بە باس‌و ئەفەرموێ (والطارق) وە بەو شتەی کە لە شەوا دەرئەکەوێ ، جا لەبەر ئەوەی کە ووتەی «طارق» تێکرا «عام»یە لەهەموو شتێکی وا کە لەشەوا پەیدا بێ ، وە مەبەسیش شتێکی تایبەتی‌یە ، ویستی ناونووس «تعیین»ی بکات بەڕەنگێکی وا کە گەورەیی‌و گرنگیی ئەو شتەش نیشان بدات ، فەرمووی (وما ادراك ماالطارق)**

أَلنجْمُ الثاقِبُ(٣) إن كُلُّ نَفْسٍ لَما عَلَيْهَا حَافِظٌ(٤)

ئەستێرەی درەخشــانی تاریکیی کونکــەرە(٣) (ئنجـا سوێند بەمانە) کـەس نىیە کە ئاگادارێکی بەسەرەوە نەبێ(٤) •

تۆ چووزانییت کە دەرکەوتووی شەو چیىیە واتە شتێکی ئەوەندە سەیرە لەوانە نیىیە ، کە ژیریی‌و بیبر دەرەقەتی بێ ، وە بە تەواویی تێیبگات •

ئەم جۆرە پرسیارانە لە عەرەبىدا زۆرە ، کە گەورەیی‌و گرنگیی ئەو شتانە ئەگەیەنێ ، کە پرسیارەکەیان لێئەکرێ ، واتە ئەوەندە شتێکی سەیرو گرنگە ، هەرگیز بە تەواویی نازانرێن ، وە لەوانەن کە دەربارەیان بووترێ : تۆ ئەمە لەکوێ ئەزانییت ؟ ئنجا خوا خۆی باسی ئەکات ئەفەرموێ (النجم الثاقب) ئەو ئەستێرانەن کە بە ڕووناکیی خۆیان تاریکیی شەو کون ئەکەن ، وە گەورەترین بەڵگەن لەسەر تاك‌و تەنیایی خوا ، بۆ ئەو کەسانەی کە لێیان وورد ببنەوە •

ئەم ئەستێرانەی کە لە کۆمەڵەی ڕۆژیی ئێمە نین ، وە بەشەو ئەیانبینین ، هەرە نزیکەکەیان ، ڕووناکیىیەکەی بە چوار ساڵی تیشك ئەگاتە زەویی ، ڕووناکیی «گەلاوێژ» بـە هەشت ساڵ‌و ، ڕووناکیی «نسری واقع» بە ٢٦ ســاڵ‌و ، ڕووناکیی «سماکی رامح» بە ٤١ ساڵ‌و ، «عیوق» بە ٥٢ ساڵ‌و ، «سماکی أعزل» بە ٢٣٠ ساڵی تیشك ئەمانگاتێ ، هەروەك ئەستێرەی وا هەیە کە بە ملاین ساڵی تیشك تاریکیی ئەبرێ تا ڕووناکیىیەکەیمان ئەگاتێ ، وە بە چاو ئەیبینین ، کەواتە ووتەی : «النجم الثاقب» جوانترین جڵەوکێشی تەماشایە لەم شوێنەدا •

خوا سوێندی خوارد بە ئەستێرەی ئاسمان بۆ ئەوەی کە ئاوورێکمان پێبداتەوە بەلایانەوە ، تا تــۆزێ وورد ببینــەوە لە خۆیــان‌و دەستوورو باویــان‌و قازانج‌و سوودیان ، وە بیانکەین بە بەڵگەو نیشانە لەسەر دۆزینەوەی خوا بە تاك‌و تەنیا ، واتە سوێنــد بەمانە (ان كـل نفس لما عليهـا حافظ) هەموو کەســێك ئاگادارێکی بەسەرەوەیە ، ئاگاداریی ئەکات لە هەموو ڕووپەڕەیەکی ژیانیا ، کە ئەو ئاگادارەش خوایە ، واتە ئەو خوایەی کە ئاگادارە بەسەر هەزاران هەزار ملیۆن ئەستێرەوە ،

فَلْيَنْظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ؟ (٥) خُلِقَ مِنْ مَاءٍ دَافِقٍ (٦)

**با ئادەمیی تەماشا بکات کە لە چی دروست کراوە ؟!(٥) دروست کراوە لە ئاوێکی هەڵڕژاو بە تەکان(٦) .**

وە هەر یەکەی لە جێی خۆی ڕاگرتووە بەهۆی شتێکەوە کە پێی‌ئەڵێن هێزی کێشندە ، کە ئەویش هەر خوا خۆی ئەزانێ چی‌یە ، واتە ئەو خوایەی ، کە ئەو ئاگاداری‌یە ئەکات ، هەر ئەو خوایەش ئاگادارییی مەردوم ئەکات ، وە کەس نی‌یە کە لەم چاودێری‌یە بێ‌بەش بێ ، ئنجا ئەگەر بەمە باوەڕ ناکات (فلینظر الانسان مم خلق ؟) با ئادەمیی ووردببێتەوە بزانێ کە خۆی لە چی دروست کراوە ، ئنجا ئەگەر نازانێ با بزانێ : کە (خلق من ماء دافق) دروست‌کراوە لە ئاوێکی هەڵڕژاو بە تەکان ، کە ئەو ئاوەش لە خواردەمەنی پەیدا ئەبێ ، وە خواردەمەنیش لە خاك ، کەوابوو هەموو ئادەمی‌یەك لەچەند تۆزێك خاك دروست ئەبێ ، بەهۆی خواردەمەنی‌یەوە کە هەریەکەی لەلایەکەوە دێ .

ئنجا کەوابوو ئەو خوایەی کە ئادەمیی بەم جۆرە دروست بکات لە تۆزێ خاکی بێ‌گیان ، ئەش‌توانێ جارێکی‌تر دروستی بکاتەوەو بی‌هێنێتەوە ڕووی‌کار ، وەك لەمەولا ئەفەرموێ «انه علی رجعه لقادر» .

لە علمی «فیزیا»دا ئەڵێ ئاو ، وە هەموو شتێکی شل کاتێك بە تەکان دەرئەچێ کە هێزێك لە پشتەوە پاڵی پێوەبنێ ، وە ڕێگاکەشی تەنگ‌بێ ، وەك فیچقە ، ئەم قەڵەمباز بردنی ئاوی پیاوە بە تەکان ، شتێکی زۆر گرنگ‌و پێویستە بۆسك‌پڕبوونی ژن ، ئەگەر وانەبوایە ئەو ئاوە نەئەگەیشتە دەرگای مناڵدان‌و سك‌پڕ نەئەبوو ، وە لە ماوەی سەدساڵا ئادەمیی بنەبڕ ئەبوو ، زۆر پیاوی وا هەیە کە مناڵی نابێ لەبەر ئەوەیە کە ئاوەکەی سستەو بە تەکان دەرناچێ ، وە ناگاتە جێی خۆی ، کەوابوو ئەم قەڵەمبازبردنی ئاوی پیاوە ، شتێکی زۆر گرنگە ، نازانرێ چۆن پەیدا ئەبێ بەبێ زانینی علمی «فیزیۆلۆجیا» کە جووڵانەوەی ئەندام‌و مایەی ئەو جووڵانەوەیە نیشان ئەدات لە کاتی پیشە «وەظیفە» بینینا ، ئنجا بۆیە بەتایبەتی خوا باسی‌کرد .

يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرائِبِ(٧)

کە دەرئەچێ لە ناوەندی پشت (ی پیاو)و دانەی (پەراسووی) سنگ (ی ژن)ەوە(٧) •

لەپاش باسی گرنگترین سیفەتی ئاوی ئادەمیی ، ئنجا باسی سەرچاوەی ئەو ئاوە ئەکات ، ئەفەرموێ (یخرج من بین الصلب والترائب) هەڵئەقوڵێ لە ناوەندی پشتی پیاوو دانەی سنگی ژنەوە •

ئەم ئایەتە نیشانئەدات کە ئاوی پیاو پەیوەندیی هەیە لەگەڵ پشتیا ، وە ئاوی ژن پەیوەندیی هەیە لەگەڵ دانەی سنگیا ، کە ئەمەش وایە ، چونکە تازە دۆزراوەتەوە کە لەناو موورەغەی پشتا مۆخێك هەیە پێی ئەڵێن مۆخی دڕکیی «نخاعی شوکی» لە بەشێکی ئەم مۆخەدا ــ کە پێی‌ئەڵێن «قطاعی قطنی» ــ شوێنێك هەیە ، چاودێریی ئەندامی زاووزێ ئەکات ، کە ئەو شوێنەش ، هێز لە بەشی بەرەوژووروتری مۆخ وەرئەگرێ ، بەبێ ئەو شوێنە ئاوی پیاو پەیدا نابێ •

ئاوی پیاو نرخی نی‌یە بۆ زاووزێ بەبێ گیانلەبەرانی تۆویی «حیواناتی منوی» کە لە گونا پەیدا ئەبێ ، هەروەك ئاوی ژن نرخی نی‌یە بەبێ گەرا «بویضة» ، ئنجا لە گیانلەبەرانی تۆویی پیاوو گەرای ژن ، مناڵ پەیدا ئەبێ لە مناڵدانا •

هەموو ژنێك مناڵدانێکی هەیە لەگەڵ دوو گەرادانا ، گەرادانێکیان کەوتۆتە لای ڕاستی مناڵدانو ئەویتریان کەوتۆتە لای چەپی ، لە ناوەندی گەرادانو مناڵدانا لوولەیەك هەیە ، لەهەر گەرادانێکیشا چەند کیسۆلکەیەکی بچکۆلانە هەیە کە پێی ئەڵێن «حویصلات» ، ئنجا هەموو سەری مانگێك یەکێك لەم کیسۆلکانە دەست ئەکات بە گەورەبوون تا دوایی مانگ ، وە بەرە بەرە لەگەڵ گەورەبوونیا دوورئەکەوێتەوە لەو گەرادانەی کە تیایەتی ، لە دوایی مانگ کە بە تەواویی گەورە بوو ، ئنجا لەسەر لێواری گەردانەکە لەت ئەبێ ، وە گەرایەکی لێ‌دەرئەچێ ، وە ئەچێتە ناو لوولەکەوە ، وە لەوێوە ئەچێتە ناو مناڵدانەوە ، وە ڕوو ئەکاتە ئەو شوێنەی کە ئاوی پیاو ئەیگاتێ ، ئنجا گیاندارانی تۆویی پیاو ــ کە بە هەزاران هەزار لەناو

ئاوەکەیا هەن ـ ئەگەڕێن بەشوێن ئەو گەرایەدا ، ئنجا کامیان لە هەموان ئازاترو خێراتر بوو ئەگاتە گەراکەو سەر ئەکا بە ناویا ، وە کلکی لە دەرەوە ئەمێنێ ، ئەم کلکەش ، هەر بۆ ئەوەیە کە بەهێزی ئەوەوە بگەڕێ بە شوێن گەرای ژنا ، بەم ڕەنگە متوربە «تلقیح» تەواو ئەبێ ، وە بناغەی منال لە منالدانا دائەمەزرێ ، لە پاشا کلکەکە بەرە بەرە نامێنێ بەلام ئەگەر یەکێک لەم گیاندارانی تۆوییە نەگەیشت بە گەرا ، سك پڕ نابێ ، بەڵکو خوێنی حەیز پەیدا ئەبێ •

ئنجا بابچینەوە سەر ئەو کیسۆلکەیەی کە وەختێ خۆی لەناو گەرادانا لەتبووەو گەرای لێ دەرچووە ، ئەم کیسۆلکەیە کە لەتبوو پڕ ئەبێ لە خوێن ، لەپاشا لە جیاتی خوێنەکە شتێکی زەردی لێ پەیدا ئەبێ کە پێی‌ئەڵێن : «الجسم الاصفر» وە ئەم شتە زەردە ـ کە لە «هورمۆن»اتی گەرادانە ـ پەیوەستی‌یەکی بەهێز پەیدا ئەکات لە ناوەندی گەراو مەمکی ژنا ، کە مەمك وا بەسەر دانەی پەراسووەڕە ، هەر وا ئەم شتە زەردە خۆشی هورمۆنێك دەرئەدات(١) •

ئەم هورمونە بە تەواویی بەستراوەتەوە بە ئەنجامی گەراوە ـ کە هەردوکیان لەناو سکی کیسۆلکە دەرچوون ـ بەم ڕەنگە ئەگەر گەرا تووشی گیاندارانی تۆویی نەبوو متوربەی بکات ئەوا خۆشیی‌و گیاندارانی تۆوییش ئەمرن ، وە ئاوە زەردەکەش وەك گەراکە نامێنێ ، وە هیچ شتێك پەیدا نابێ ، حەیز نەبێ •

بەلام ئەگەر گەرا گەیشت بە گیانداری تۆویی‌و متوربە بوو ، وە سك پڕبوو ، ئەو حەلە ئەم ئاوە زەردە لەگەڵ هورمۆنەکەی خۆی سێ ئیشی زۆر گرنگ ئەکات :

١ ـ نایەڵێ کیسۆلکەی‌تر پێ‌بگات‌و گەورە ببێ ، تا لە ماوەی ئەم سکەدا جارێکی‌تر سك‌پڕنەبێتەوە ، وە گەرایەکی‌تر متوربە نەبێ ،

٢ ـ منالدان ئامادە ئەکات بۆ مانەوەی بێچووەلەکە ، وە بۆ ئاگاداریی‌و گەورە

---

(١) هورمون : مادەیەکی کیمیاوی‌یە پەیدا ئەبێ لە ئەندامێکا ، کاتێك کە ئەو هورمۆنە بە بۆنەی خوێنەوە لەو ئەندامەوە چوو بۆ ئەندامێکی‌تر زیادە جووڵانەوە «نشاط»یەك ئەخاتە ئەو ئەندامە لە ئیش‌کردنا •

بوونیو خۆراکی ، ئەوەتا ـ لەپاش سكپڕبوون ـ منالدان بەرە بەرە گەورە ئەبێ ، وە لوولەی خوێن گەورەتر ئەبێ ، لەپاشا کیسەی منالو هاوڕێکەی پەیدا ئەبێ •

٣ ـ مەمك ئامادە ئەکات بۆ گەورە بوونو ژیانەوە ، وە بۆ پەیدا بوونی شیر بۆ منالەکە لەدوای لەدایك بوونی ، ئنجا لەمانەوە دەرئەکەوێ پەیوەندیی گەرا بە سنگو مەمکی ژنەوە •

ئەم ئایەتە معجزەیەکی گەورەی علمی‌یە ١٤٠٠ ساڵ لەپێش ئەوەی کە علمی دروست بـوونی منال لە منالدانا ، یا علمی وظائفی ئەندام پەیدا ببێ ئـەم خبرە علمی‌یەی داوە ، کە تازە دۆزراوەتەوە(١) •

ئنجا با بچینەوە سەر بەیەکەوە بەستنی ئایەتەکە ، واتە ئاوی پیاو هەرچەند گیانداری تۆویی تیابێ ، بەڵام نە وێنەی ئادەمیی تیایە ، نە ئەندامو پەلوپۆ کە ئیشوکاری ژیانی تیا دەرئەکەوێ ، کەچی لەگەڵ ئەمیشە لە ماوەی چەند مانگێکا ئادەمیی‌یەکی جوانی ، ڕێكوپێکی ، تەواوی ، لێ‌پەیدا ئەبێ ، پڕ لەژیانو تەوانایی‌و ژیریی‌و بیروهەستو تێگەیشتنو زیتیی‌و زرنگیی‌و وورییایی ، بە ڕەنگێکی وا کە بتوانێ ببێ‌بە جێ‌نشینی خوا لەسەرزەویی، ئەم قەلەم‌کێشانەی بەم‌جوانی‌ودلچەسپی‌یە وە بەم شەنگو شۆخی‌یە ، وە داڕشتنی ئەم ئەندامانە هـەر یەکە بە قەد خـۆی ، بەبێ زیادو کەم ، وە دانانی هێزو تەوانایی لەناویانا هەریەکە بە پێی خۆی ، وە بە ڕەنگێکی وا کە ئەو ئەندامە بتوانێ پیشەی هەمیشەیی‌و فرمانی خـۆی بەجێ بێنێ لە قەڵەمڕەوی لەشەکەدا

دیارە ئەمانە هەرگیز لەخۆیانەوە نابن بەبێ ئاگادارێکی زانا کە چاودێریی بکات لەهەموو پەردەیەك لەم پەردانەی کە لەپێشەوە باس کران ، کە ئەو ئاگادارەش خوایە ، کەوابوو دەرکەوت کە هەموو کەسێك ئاگادارێکی بەسەرەوەیە ، وەك لـە پێشەوە سوێندی لەسەر خوارد •

---

(١) ئەم باسە وەرگیراوە لە ووتاری :«القرآن والعلم والحديث»کە بلاوکراوەتەوە لەژمارە شەشی ساڵی دوو لەگۆڤاری «لواء الاسلام»دا •

إنهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ(٨) يَوْمَ تُبْلَى السرَائِرُ(٩) فَمَالَهُ مِنْ قُوَّةٍ وَلاَ نَاصِرٍ(١٠) وَالسمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ(١١)

**بەڕاستی خوا بە دەسەڵاتە لەسەر زیندووکردنەوەی(٨) لەڕۆژێکا کە هەرچی نهێنی هەیە ئاشکرا ئەکرێ(٩) وە ئەو نە هێزێك شك ئەباو نە یارمەتی دەرێك(١٠) سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران(١١)**

⊙ ⊙ ⊙

**لەپاش ئەوەی کە ئاوورێکی بەئادەمیی دایەوە بەلای سەرەتای پەیدابوونیەوە، ئنجا ئەیهێنێ بۆ سەرەنجامێك کە بەئاسانی بیگاتێ ، وەك پایەی دووهەم بێ کە اثباتی زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی یە ، ئەفەرموێ (انه علی رجعه لقادر) خوا بە دەسەڵاتە لەسەر زیندووکردنەوەی ئادەمیی ، واتە ئەو خوایەی کە ئادەمیی دروست کردووە لەدڵۆپێ ئاو بـەبێوێنەو ماننند ، ئەش توانێ لەدوای مـردنی زیندووی بکاتەوە لەسەر وێنەی پێشووی ، بەڵکو ئـەم دروستکردنەوەیە ئاسانترە ، چونکە ئەمیان لەسەروێنـەیە ، بەڵام ئەویان بەبێوێنە بووە ، زینـدووشی ئەکاتەوە (یوم تبلی السرائر) لەڕۆژێـکا ـ وەك ڕۆژی دوایی بێ ـ کە هـەرچی ڕازو نهێنی هەیە هەمووی تیا ئاشکرا ئەکرێ ، وە پاكو پیس لەیەك جیا ئەبێتەوە کەس ناتوانێ بە قالەی دەم خۆی بباتە پێشەوە ، یا خراپێك خۆی بەباش بداتە قەلەم ، بەڵکو هەموو کەسێك چاوەڕوانی بەری کردەوەی خۆیەتی ، ئەگەر چاکە ، بەچاکـەو ، ئەگەر خراپە ، بەخراپە ، نە کەس ئەتوانێ حاشا لەخراپەیەکی خۆی ، وە نە ئەتوانێ بە زۆر خۆی ڕزگار بکات ، یا یەکێك یارمەتی بدات ، وەکو ئەفەرموێ (فما له من قوة ولا ناصر) نە کەس تەواناى دەرچوونو نە یارمەتی دەرێکی هەیە ٠**

⊙ ⊙ ⊙

**لەدوای جێگیر کردنی پایەی یەکەمو دووهەم ، ئنجا باسی پایەی سـێهەم ئەکات لەپێغەمبەریەتی پێغەمبەر، لەبەرئەوەی کەئەمەش جێی دوودڵیی بێبڕوایانە، بۆیە سوێندی لەسەر ئەخوات ئەفەرموێ (والسماء ذات الرجع) سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران ، کە هـەر دەمەی بەپێی پێویسـت ئەبارێنێ ، وە هەمـوو جـۆرە**

وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ (١٢)إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ(١٣)وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ (١٤)
إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْداً(١٥)

وە بە زەویی خاوەن قلیشن(١٢)ئەم(قورئان)ە گوفتارێکی ڕاستوجوێکەرەوەیە(١٣)
وە گاڵتە نی‌یە(١٤) بێبڕواکان فێڵ ئەکەن چۆن فێڵ کردنێك(١٥)

خواردەمەنی‌و پێبژیـوێکمان بۆ ئەڕوێنێ (والارض ذات الصدع) وە سـوێند بە زەویی خاوەن قلیش کە گیا سەری لێدەردێنێ ، واتە هەر چڵە گیایەك کە بی‌یەوێ سەر دەربێنێ ، بەفەرمانی خوا زەوی‌یەکەی بۆ ئەقلیشێتەوە ، نەك بەزۆری چڵـە گیایـەکی نـەرم‌و شـلی بـاریـکی ناســکی وەك تـاوە دەزوو ، چـونکـە شتی وا ناتـوانێ زەویی لەتکات ، با زەوی‌یەکەش شێداربێ ، واتە سـوێند بەمانە (انه لقول فصل) ئەم قورئانە گوفتارێکی ڕاست‌و دروستە ، وە کۆمەڵە دەستوورێکی بەرزە ، مایەی سەرکەوتن‌و پێشکەوتن‌و خۆشبەختیی هەردوو جیهانە(وما هو بالهزل) وە گاڵتە نی‌یە ، بەڵکو شایستەی خوێندنەوەو بییر لێکردنەوەیە ، تا هەموو کەسێك بەپێی خۆی بەهرەی لێوەرگرێ .

وەك بارەها نووسـیومانە : خوا بەشتێك سـوێند ئەخوات کە زۆر بەکەڵك بێ بۆ ئادەمیی ، تا بەهرەی لێوەرگرن ، وە بە سووکیی تەماشای نەکەن ، جـا لەبەرئەوەی چاکترین شتێك کە لەئاسمانەوە چاوەڕوان بکرێ باران‌و لەزەوی‌یەوە گیاو دەغڵ‌ودان‌و شیینایی‌یە ، بۆیە بەتایبەتی سوێندی پێخواردن ، لەگەڵ ئەمیشە بەم سوێنـدە نیشان ئەدات کە سرووشی خوایی لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبـەر ، وەك باران مایـەی ژیان ، وە دەرچـوونی ئایاتی قورئانیشـ لـەدەمی پێغـەمبەرێکی نەخوێندەوارەوە ، وەك دەرچوونی گیایەکی نەرم‌و شل وایە لەزەوی‌یەکی ڕەق‌و تەقەوە ، ئەگەر دەستی خوای تیا نەبێ نابێ .

⊙ ⊙ ⊙

لەدوای باسی هەرسێ پایەکانی ئیسلام ، ئنجا باسی فڕوفێڵی بێبڕواکانمان بۆ ئەکات ، ئەفەرموێ (انهم یکیدون کیدا) ئەوان هەموو جۆرە فڕوفێڵێك ئەکەن

وَأَكِيدُ كَيْداً(١٦) فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ : أَمْهِلْهُمْ رُوَيْداً(١٧)

وە منیش فێڵ ئـەکەم چۆن فێڵێك (بەتۆڵەلێسـەندنیان)(١٦) ئنجا مۆڵـەتی بێبڕواکان بدە : بـە مۆڵەتێکی کەم(١٧) ٠

بۆ کوژاندنەوەی چـرای ئیسلام (واکید کیـدا) وە منیش تۆڵـەی فڕوفێڵەکەیان لێئەسێنم (فمهل الکافرین : امهلهم رویدا) وە تۆ پەلە مەکە لەتۆڵە لێسەندنیان ئەی پێغەمبەر ، وە تۆزێك دان بەخۆتا بگرە تا ئێمە بەرە بەرە زەبوونیان ئەکەینو، ئەیان ڕووخێنین ، وەك یەکێك کە بەدزییەوە ، کنە لەیەکێکا بکات بۆ ڕووخاندنی ، بۆیە کردەوەکەی خۆشی ناوبرد بەفێڵ ٠

لێرەدا هەروەك هەڕەشەی تیایە بـۆ بێبڕواکان ، کە زوو بەزوو تۆڵەیـان لێئەسەندرێ ، مزگێنیشی تیایە بۆ پێغەمبەر ، بەڵکو بۆ هەموو سەرۆکێکی خێر خواهی باش کە هەرکەسە بـەپێی دڵو دەروونی پاکی خۆی سەرئەکەوێو پێش ئەکەوێ ٠

سُورَةُ الأَعْلَى

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى (١)

## سوورەی ( اعلى )یه

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**به پاكیی یادی پەروەردگاری هەرە بلندت بكه(١)**

## سوورەی ( اعلى )یه

**مەككی‌یه ، ١٩ ئایەته ، ٧٤ ووتەیه**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**خوا بەڕاستی ناناسرێ ، مەگەر بەناوونیشان ، وه بەو سیفەتانەی كه ئەیان بینین ، وەك بلێین خوا زانایەو دانایەو بینایەو ژنەوایەو بەدەســەلاته ، كەوابوو ئەوی ئێمه ئەیزانین لەبابەت خواوه ، هەر ناوەكەی‌و نیشانه «سیفەت»ەكانێتی بۆیه خواش خۆی فەرمانمان پێ‌ئەدات ، كه هەر تەسبیحاتی ناوەكەی بكەین،وه ئەفەرموێ (سبح اسم ربك الاعلى(١)) ناوی پەروەردگاری بلندی خۆت به پاكو تەمییز ڕابگره، وەبی‌پارێزه لەوشتانەی كەشایستەی ئەونین، لەهاودەم بۆپەیداكردنی، یادەركەوتنی لەشێوەی یەكێك لەدروستكراوانی خۆی ، یابوونی لەیەكێك ، یایەكێك لەوبووبێ،**

(١) كاتێك كه ئەم ئایەته هاته خوارەوه پێغەمبەر فەرمووی : «سبحان ربي الاعلى»، وه فەرمانی‌دا كه له سجدەی نوێژتانا بیلێن · هەروەك لەوەپێش ــ كه ئایەتی «فسبح باسم ربك العظيم» هاته خوارەوه ، فەرمووی : «سبحان ربي العظيم» ، وه فەرمانی‌دا كه بیخەنه ركووعتانەوه ·

أَلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى(٢) وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى(٣)

ئەوەی کە (هەمو شتێکی) دروست کردووەو ڕێکیخستووە(٢) وە ئەوەی کە دایناوە (بۆ هەموو گیاندارێك) مایەی ژیانی ، ئنجا ڕێ نموونیی بۆکردووە(٣) •

واتە نابێ بە هیچجۆرێك بیریلێبکەینەوە ، مەگەر بەم ڕەنگە نەبێ : کە بلێین خوا زانایە بەهەمووشتێك ، وە هەرچی شت هەیە دروستکراوی ئەوە ، وەکو ئەفەرموێ (الذي خلق فسوى) ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی دروستکردووەو ڕێکیخستووە لەسەر تەحرو وێنەیەکی شیرینو جوانی وا ، کە شایستەی ئەو شتە بێ (والذي قدر فهدى) وە ئەو خوایەی کە دایناوە بۆ هەموو گیانلەبەرێك مایەی ژیانێکی ڕێکوپێك ، وە بە سروشت وای دروستکردووە کە چاكو خراپی خۆی بزانێ ، وە بە پێی سروشت ئاگاداری کردووە بەو شتانەی کە پێویستی ژیانیبێ •

نابینیت بالندە هەرچەند بەهارانو پایزان کۆچ بکەن ، وە هەزاران میل دوور بکەونەوە ، لەپاشا بە سروشت دێنەوە ناو هێلانەکەی خۆیان • ئەو هەنگەی کە شانەکەی خۆی بەجێ دێلێ ، وە بە دەشتودەرا ئەگەڕێ بە شوێن گوڵو گوڵزارا ، ئەگەڕێتەوە بۆ ناو بۆشەك «خلية»ەکەی خۆی • جاڵجاڵۆکە خانووەکەی خۆی ئەتەنێ بە جۆرێکیوا کە زۆر لە تەنینی ئادەمیی ڕێکوپێکترە ، ئەگەر ئادەمیی لە تەنینی خۆیا هەڵە بکات ، ئەم هەرگیز هەڵە ناکات ! لەگەڵ ئەمیشە کە جۆرە کەتیرەیەکی زۆر لینجی قایمیوا ئەدا لە تاوەکانی ، ئەگەر لەپڕ بایەکی لێهەڵکات ، یا گێژەڵووکەیەکی لێبدات ، تێکی نەدات ، وە ئەگەر مێشێکی لێبکەوێ ، خێرا بیگرێ بۆ خۆراکی جاڵجاڵۆکەکە •

سەرۆکی ئەکادیمی علوم لە نیورك ( ا • کریسی مۆریسۆن ) لە کتێبی : «ئادەمیی بە تەنیا پایەدار نابێ»دا ، ئەڵێ «پەپوولەیەکی مێ ئەگەر لە ژوورێکی داخراوا مایەوە ، دوای ماوەیەکی کەم ئیشارەتێك ئەدا بە نێرەکەی لە هەر کوێیەك بێ ، وە ئەویش خێرا وەرامی ئەداتەوە ، ئایا ئەم پەپوولە مێیینە ئیزگەی پەخش «محطەی اذاعة»ی پێیە ؟ یا ئەو پەپوولە نێرینە مەکینەی رادیۆی لەبن باخەڵایە ؟

وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَى(٤) فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَى(٥) سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنْسَى(٦) إِلاَّ مَا شَاءَ اللهُ

وەئەوەی کە لەوەڕی دەرهێناوە(٤) ئنجا گێڕای بەپووشی ڕەشداگەڕاو(٥) (قورئانت) بەسەرا ئەخوێنینەوەو بیرت ناچێتەوە(٦) مەگەر ئەوەی کە خوا حەز بکات ،

دیارە کە خوایەکی دانای ئاگادار هەیە ڕێ نموونیی هەموو گیانلەبەرێك ئەکات بۆ ڕێی خۆی» •

(والذي أخرج المرعى) وە ئەو خوایەی کە هەموو جۆرە لەوەڕو سەوزاییەکی دەرهێناوە لە زەوی ، کە هەر یەکێکیان بۆ خواردنی جۆرە گیانداریك دەست ئەدات (فجعله غثاء أحوى) ئنجا گێڕای بە پووشێکی ڕەش داگەڕاو ، واتە یانی جیهانیش وایە ، ئەمڕۆ تەڕو نازاوو ، سبەینێ ووشكو ، برنگکو ، بێگیانە •

خوا فەرمـانی پێداین کە تەسبیحاتی ناوەکەی بکەین نەك خـۆی ، تا تێمان بگەیەنێ : ئەوەی کە لە تەوانای ئێمەدایە ، دۆزینەوەی سیفەتەکانێتی کە هەمیشە بەچاو نیشانەکانی ئەبینین ، وە بە ژیریی‌و بیر هەستیان پێئەکەین ، بەڵام خوا خۆی لەوانە نییە کە ژیریی‌و بیر بیگاتێ‌و پەیی ، پێبەرێ •

⊙ ⊙ ⊙

لە دوای ئەوەی کە خوا فەرمانی دا بە پێغەمبەر کە ناوی بە پاكو تەمیزو گەورە ڕابگـرێ ، وە ئەمیش ئەمەی گەیاند بە مسلمانان بە فەرمانی خـوا ، وە ئەوانیش بە باشیی نەیانئەزانی کە ناوو سیفەتەکانی خوا چین ؟ وە چۆن بە پاكو تەمیزو گەورە ڕائەگیرێن ، ئنجا خوا مزگێنیدا بە پێغەمبەر کە لەمەولا قورئانێکت بە سرووش «وحی» بۆ ئەنێرین ، جگە لەوە کە دەستووری خۆشیی‌و خۆشبەختیی هەردو جیهانی ئادەمیی تیایە ، هەرچی ناوو سیفەتەکانی خواش هەیە بۆت باس ئەکات ، وە هەرچی بۆی نەگونجێ‌و شایستەی نەبێ لێی دوور ئەخاتەوە ، وە ئەو سرووشەی ، کە بۆشت ئەنێرێ ، بە یەکەمجار ، دێتە بەرت ، وە لە بیرت ناچێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ (سنقرئك) ئێمە قورئانێکت بە سرووش بەسەرا ئەخوێنینەوە (فلا تنسى) وە تۆش دێتە بەرتو لەبیرت ناچێتەوە (الا ماشاءالله) مەگەر ئەوەی کە خوا

إنه يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى(٧) وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَى(٨) فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى(٩)

**کە ئەو بە هەموو شتێکی ئاشکراو پەنهان ئاگادارە(٧) وە یارمەتیت ئەدەین بۆ ڕێی ئاسان(٨) ئنجا تۆش ئامۆژگاریی بکە ئەگەر سوود بدات(٩)**

حەز بکات واتە ئەگەر خوا بیەوێ شتێکت لەبیر بباتەوە ئەتوانێ ، بەڵام هەرگیز لە بیریشتی ناباتەوە • ئەم تەعبیرە وەك ئەوە وایە کە بە خۆشەویستێکت بڵێیت : تۆ هاوبەشی منی لە هەرچی کە من هەمە مەگەر ئەوەی کە خوا حەز بکات ، بەم مەگەرە ئەوەت مەبەس نی‌یە کە شتێك لە ماڵەکەت دەرکەیت • (انه یعلم الجهر وما یخفی) بەڕاستی ئەو خوایەی کە ئەم بەڵێنانەی پێدایت ، ئاگادارە ، بەهەمووشتێکی ئاشکراو نهێنی ، وە هیچ شتێکی لێ وون نابێ لەو نهێنی‌یانەی کە لە دوو توێی دڵو دەروونتایە ، وە ئەگەر بیەوێ ئەتوانێ لە بیرتی بباتەوە •

بە ڕاستی ئەمە معجزەیەکی زۆر گەورەیە بۆ پێغەمبەر کە لە «مکە» ، وە لە سەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە خوا ئەم بەڵێنانـەی پێدا ، وە پێغەمبەر ، ما تا هەموو قورئانی بـۆ هات ، وە ئـایینی ئیسلام بە پایان گەیشـت ، وە ئـەم پێغەمبـەرە نەخوێندەوارە ، هیچی لەبیـر نەچۆتەوە لـەم قورئانە دوورو درێژەی کـە بۆی هاتووە •

کاتێك کە لە مزگێنی‌دان بەناردنە خوارەوەی قورئان ، مزگێنیش بوو ، بە دانانی ئایینێکی تازە لەگەڵ دەستوورو یاسایەکی تایبەتی‌دا ، بیر ئەچێ بۆ ئەوەی کە ئەگونجێ لەو دەستوورو یاسایەدا شتی قورس‌و گرانی وای تیابێ کە هەڵگرتنی گران بێ بـۆ مەردوم ، ئنجا بۆ لابردنی ئەم بیرە ، فەرمـووی (ونیسرك للیسری) ئێمە تۆ لەسەر ئایینێکی ئاسان‌و ، یاسایەکی سووك‌و ڕەوانی وا یارمەتیت ئەدەین کە بە هەموو کەسێك هەڵبگیرێ ، وە هەموو ژیرێکی خاوەن بیر تێی بگـات •

لەدوای مزگێنی دان بە هاتنە خـوارەوەی قورئان‌و بناغە دانـانی ئـایینی ئیسلام ، ئنجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر بە ئامۆژگاریی مەردوم ، ئەفەرموێ (فذکر ان نفعت الذکری) ئامۆژگاریی مەردوم بـکە بە چاکەو بیانترسێنە لە خراپە ، وە

سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى (١٠) وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى (١١) الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى (١٢) ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَى (١٣) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى (١٤)

**ئەوی لە خوا بترسیّ پەندی لیّوەرئەگریّ(١٠) وە ئەوی بەدبەختو خراپیش بیّ خۆی لیّ دوورئەخاتەوە(١١) ئەوی ئەچیّتە ناو ئاگری هەرە گەورەوە(١٢) لە پاشا نە ئەمریّ تیایاو نە ئەژی(١٣) بە ڕاستی ڕزگار بوو ئەوی کە خۆی پاك ڕاگرت(١٤)**

بیّداریان بکەرەوە لە خەوی بیّهۆشیی ، ئەگەر سوود بدات ، واتە زۆر کەسی وا هەیە پەردەی ڕەش بەسەر دڵو دەروونیا هاتووە ، بە ڕەنگیّکیوا کە هیوا ناکریّ پەندو ئامۆژگاریی کاری تیّبکات ، بەڵام تۆ ئامۆژگاریی خۆت هەر بکە ، سوودی ببیّ یا نەبیّ •

ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنیّ کە ئامۆژگاریی ــ ئەگەر زانرا بیّکەڵکە ــ پیّویست نیّیە ، زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوەن کە ئامۆژگاریی پیّویستیّکی ناچارییە لەسەر هەموو کەسیّك ، سوود بدات یا نەیدات ، هەروەك کردەوەی پیّغەمبەریش ، گەواهیی لەسەر ئەمە ئەدات ، وە هەروەك دەریش ئەکەویّ لە ئایەتی (سیذکر من یخشی) بیر لە پەندو ئامۆژگارییەکەت ئەکاتەوەو کاری تیّئەکات ئەوکەسەی کە لە خوا بترسیّ (ویتجنبها الاشقی) وە خۆی لیّ دوور ئەخاتەوە بەدبەختی خراپ ، ئەوانەی کە گویّ نادەنە ئامۆژگاریی ، وە چاو ئەقووچیّنن لە بینینی ڕیّی ڕاست ، ئەم جۆرە کەسانە لە هەموو شویّنیّك ، وە لە هەموو کاتیّکا هەن ، وە تووشی تۆڵەو سزای خۆیان ئەبن ، وەکو ئەفەرمویّ (الذي يصلى النار الكبرى) ئەو بەدبەختەی کە ئەچیّتە ناو ئاگریّ گەورەوە ــ کە ئاگری دۆزەخە ــ وە بە ئیّجگاریی تیائەمیّنیّتەوە (ثم لا يموت فيها) لەپاشانە ئەمریّ لەناو ئاگرەکەدا تا ڕزگاری ببیّ (ولا يحيى) وە نە ئەژیی بە ژیانیّکیوا کە پیّی بڵیّن ژیان •

لەپاش بـاسی ئازارو سزای بیّبڕوایـان ، ئنجا باسی ڕزگاربـوونی چاکان ئەکات ، ئەفەرمویّ (قد أفلح من تزكى) بەڕاستیی ڕزگار بوو ئەو کەسەی کە خۆی

وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى (١٥) بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا (١٦)
وَالآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى (١٧)

**وە ناوی پەروەردگاری خۆی هێناو پاڕایەوە(١٥) بەڵکو (ئێوە) ژیانی دنیا هەڵئەبژێرن(١٦) کە (ژیانی)دوایی باشترو پایەدارترە(١٧) ٠**

**پاككردەوە لە پیسی دڵو دەروونو ڕەوشتو خووی ناشرین (وذكر اسم ربه) وە ناوی پەروەردگای خۆی هێنا ، وە بە دڵ یادی سیفەتە بەرزەكانی كرد (فصلی) وە ترسو سامی لێ‌نیشتو پاڕایەوە ٠**

**مەبەس لە «صلی» لێرەدا ترسو سامە لە خوا ، وەك لە ئایەتێكی‌ترا ئەفەرموێ «انما المؤمنون الذین اذا ذكرالله وجلت قلوبهم»(١) ، تەعبیری دایەوە لەم ترسو سامە بە نوێژ ، تا نیشان‌بدات كە هەر ترسو سامە ، گیانی نوێژ ، و نوێژی بەبێ ترسو سام وەك جەستەی بێ‌گیان وایە ٠**

⊙ ⊙ ⊙

**لە هەموو دەمێكا مەردومی وا هەیە كە بە دیمەن مسلمانو نوێژكەرە ، بەڵام لە هیچ گوناهێك كۆ ناكات ، ئنجا ئەمانە زۆر جار ئەڵێن : ئێمە پاكینو ناوی خوا ئەبەینو نوێژی بۆ ئەكەین ، كەوابوو ئێمە بەر ئەم ڕزگارانە ئەكەوین ، ئنجا خوا بە درۆیان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ : درۆ ئەكەن (بل تؤثرون الحیاة الدنیا) بەڵكو ئێوە ژیانی جیهان هەڵئەبژێرن بەسەر ژیانی دوایی‌دا ، وە خۆشەویستی دنیاش سەرچاوەی هەموو خراپی‌یەكە ، لەگەڵ ئەمییشــە (والاخرة خیر وابقی) كە ژیانی دوایی گەلێ بەرزترو خۆشترو باشترە لە ژیانی جیهان ، واتە ئەگەر ڕاستتان ئەكرد هەوڵێكیشتان بۆ ڕۆژی دوایی ئەدا ، وە لە ترسی ئەو ڕۆژە خۆتان ئەگێڕایەوە لە گوفتارو كرداری خراپ ٠**

⊙ ⊙ ⊙

**لە دوای ئەوەی كە لە پێشەوە بەڵێنی‌دا بە دانانی ئایینێكی ئاسانو سووك ،**

(١) واتە بڕواداران ئەوانەن كاتێك كە ناوی خوا برا دڵیان بترسێ ٠

إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ :(١٨) صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ(١٩)

بێ‌گومان ئەمــه (ی کــه ووتمــان) لــه نامــەی پێشــووەکانایه :(١٨) نامــەکانی ابراهیمو مووسا(١٩) ٠

ئنجا بــاسی ئەوە ئەکات کە ئایینی ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی پێشوودا یــەکە ، وە هەموویان لە بنیاتو بناغەدا یەکن ، جیاوازی‌یەکیان ئەگەر ببێ هەر لە وێنەو لقو پۆپایە ، وەکو ئەفەرموێ (ان هذا) ئەمەی کە ووتمان لە ئایەتی «قد أفلح من تزکی» وە تا ئەم ئایەتە (لفي الصحف الاولی) لە نامە پێشووەکانایە (صحف ابراهیم وموسی) وەك نامەی «ابراهیم»و «مووسا» بێ ، کە لە پێش قورئانا هاتوونەتە خوارەوە ، بەم رەنگە «قــد أفلح من تزکی» ، پاك کردنەوەی دڵو دەروون ئەگەیــەنێ ، لە بیرو باوەڕی خراپ ، «وذکر اسم ربه» پەروەردەکردنی گیان ئەگەیەنێ ، بەناسینی خوا ، «فصلی» پەروەردەکردنی ئەندامو پەلو پۆ ئەگەیەنێ بە خوا پەرستی ، بە جۆرێك کە هیچ ئەندامێك کارێکی خراپ نەکات ، «بل تؤثرون الحیاة الدنیا» جلەوگیریی ئادمیی ، ئەگەیەنێ،لەخەریك بوون هەر بە ئارەزووی دنیاوە «والاخرة خیر وابقی» هانە هانەی مەردووم ئەگەیەنێ ، لەسەر ئیشی چاکەو ڕەزامەندیی خوا ٠ ئنجا ئەمانە بنیاتی هەموو ئایینێکن ، وە بە گۆڕینی ئایین ئەمانە ناگۆڕێن ، واتە ئەگەر بڕوایان بە نامەی پێغەمبەرەکانی تر هەیە ، با بڕواشیان بە قورئان ببێ ، چونکــه لەگەڵ ئەوانا یەکە ٠

سُورَةُ الْغَاشِيَةِ

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ؟(١) وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ(٢) عَامِلَةٌ نَاصِبَةٌ(٣) تَصْلَى نَاراً حَامِيَةً(٤)

## سوورەی ( غاشیە )یە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئایا پێت گەیشتووە باسی ڕۆژی دوایی؟(١) زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا ترسناکن(٢) هەوڵدەرێکی ڕەنجەڕۆن(٣) ئەچنە ناو ئاگری گەرمەوە(٤) ·**

## سوورەی ( غاشیە )یە

**مەککی یە ، ٢٩ ئایەتە ، ٩٢ ووتەیە**

### بسم الله الرحمن الرحيم

### به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(هل اتاك حديث الغاشية) ئایا پێت گەیشتووە دەنگ و باسی ڕۆژی دوایی ؟ کە دێ بەسەر مەردوما ، بەخۆیو هەموو ناخۆشییو دەردو سزایەکی یەوە ، واتە دەنگ و باسێکی ئەوەندە گەورەو بەسامە ، پێویستە وەربگیرێو دەماودەم بگێڕرێتەوە ، ئنجا باسی چەند شتێکی ئەو ڕۆژە ئەکات ، ئەفەرموێ (وجوه يومئذ خاشعة) زۆر دەموچاو لەو ڕۆژەدا ترسناکو ڕیسواو شەرمەزارن (عاملة ناصبة) ماندوێتی یان بۆ ماوەتەوە لەو هەوڵو تەقەلایەی کە داویانە لە جیهانا ، واتە هیچی بۆخوا نەبووە بەڵکو یا بۆ ئارەزووی خۆیان ، وە یا بۆ ئارەزووی ماڵو منالیان بووە،وە لەپێناوی ڕەزای ئەوانــا ، خوایــان لە خۆیان ڕەنجانــدووە ، لەبەرئــەوە لەجیهانــا ، هەر ماندوێتی یان بۆ ماوەتەوە ، لەگەڵ ئەمانەشا (تصلى نارا حامية) ئەچنە ناو ئاگرێکی گەرمەوە ، کە ئاگری دۆزەخە ·**

تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ آنِيَةٍ (٥) لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِنْ ضَرِيعٍ (٦) لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ (٧)

ئاو ئەدرێن لەسەرچاوەی لەکوڵ(٥) خۆراکیان هەر درکی حوشتر خوار (ی ئاگرین)ە(٦) نە قەڵەویی ئەداو نە برسێتی لائەبا(٧)

ئەم ئاگری دۆزەخە هەرچەندە نازانیین چۆنەو لەچی‌یە ، بەڵام بڕوامان پێ‌ی هەیە کە گەلێ گەلێ لەئاگری جیهان گەرمترە ، وە جێگای مەردومی خراپو ناپاکانە لەڕۆژیی دوایی‌دا ، ئنجا هەردەمێ ئەم دۆزەخی‌یانە تینویان بوو(تسقی من عین آنیة) ئاو ئەدرێن لەسەرچاوەیەکی گەرمی لەکوڵ ، وە هەرکاتێکیش برسی‌یان بوو (لیس لهم طعا م الا من ضریع) خۆراکیان هەر درکی ئاگریینە لەوێنەی حوشتر خوار ، کە ئەویش (لایسمن ولایغنی من جوع) نە مەردوم قەڵەو ئەکاتو نە تێری ئەکات ٠

واتە دۆزەخی‌یان کە برسی‌یان بوو بەو برسێتی‌یەی کە شایستەی ڕۆژی دوایی بێ ، شتی زۆر ناخۆشی وایان ئەدرێتێ کە نە برسێتی لابەرێو نە قەڵەویی بدات ، خوا ناوی ئەو خواردەمەنی‌یە ئەبات بە درکی حوشتر خوار لەسەر تەشبیە ، ئەگینا ڕۆژی دوایی جێ‌ی نەشونیمای جەستە نی‌یە ، وە خواردنی بەم جۆرە نی‌یە ، کە هەزم بکرێو ببێ بەخوێنو گۆشت وەك جیهان ، بەڵکو ڕۆژی دوایی جێ‌ی مانەوەی ئێجگاری «خلود»یە ، خۆشی‌یەکەی خۆشیی خۆشبەختی‌یە ، ئازاری ئازاری بەدبەختی‌یە ، هەرچی ڕوودبات لەوڕۆژەدا لە خۆشیی‌و ناخۆشیی کە بەراووردی بکەین لەگەڵ هی جیهانا ، ئەتوانیین بیان شوبهێنین بەیەك لەهێندێ شتا ، واتە خۆشیی‌و ناخۆشیی ڕۆژی دوایی تەعبیریان بۆ دانەنراوە ، ئەم تەعبیردانەوەیەیان بە تەعبیری دنیا هەمووی لەڕووی تەشبیهەوەیە ، نابینیت خوا تەعبیر ئەداتەوە لەخواردەمەنی دۆزەخ ، لێرەدا بە درکی حوشترخوارو ، لەسوورەی «حاقە»دا بەکێمو زووخی دۆزەخی یان ، کە ئەفەرموێ «ولا طعام الا من غسلین»،لە سوورەی «واقعە»دا بە زەقنەمووت کە ئەفەرموێ «ثم انکم ایها الضالون المکذبون لاکلون من شجر من

وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاعِمَةٌ(٨)لِسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ(٩)فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ(١٠)تَسْمَعُ فِيهَا لاَغِيَةً(١١) فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ(١٢) فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَةٌ(١٣) وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ(١٤)

**زۆر ڕوخسار لەو ڕۆژەدا پاراوە(٨) ڕازیـین لەبەری کردەوەی خۆیان(٩) وان لە بەهەشتی بـەرزو بلندا(١٠)قسەی هیچوپـووچی تیا نابیەن(١١) تیایەتی سەرچاوەی ڕەوان(١٢) تیایـەتی زۆر تەختی بەرز(١٣)و پەرداخی دانراو(١٤) •**

**زقوم(١)» ، ئەمانە هەمووی لەسەر تەشبیهن ، وە لەهەر شوێنەی بەجۆرێك تەعبیر ئەداتەوە لە خواردەمەنی دۆزەخ ، بۆ ئـەوەی ناخۆشی‌یەکەیمان تێبگەیەنێ ، وە بیخاتە دڵمانەوە کە خواردەمەنی دۆزەخ ئەمانە لەهەمووی خراپترو ناخۆشـترە ، تا خۆمانی لێبپارێزین •**

**دوای باسی تۆلەو سزای بێبڕوایان لەدۆزەخا ، ئنجا باسی بەهرەو خۆشیی چاکانمان بۆ ئەکات لەبەهەشتا ، ئەم بەهرانە هێندێکیـان گیانیین‌و هێندێکیـان جەستەیین ، وە گیانی‌یەکان پێش ئەخات ، ئەفەرمـوێ (وجوه یومئذ ناعمة) زۆر دەم‌و چاو لەو ڕۆژەدا تەڕو پاراوو ڕوون‌و گەشن ، لەخۆشـیی پاداشی کـردەوەی خۆیان (لسعیها راضیة) ڕازیین لەکۆشـش‌و بەری کـردەوەیان (في جنة عالیة) لە بەهەشتی بەرزو خۆش‌و دڵگیران (لا تسمع فیها لاغیة) نابیەن لەو بەهەشتەدا قسەی هیچ‌و پووچ ، لەجنێوو لاقرتی‌و قسەی ناشرین • بەم ئایەتە گەیاندی ، کە مسڵمان ئەبێ سەنگین‌و گران‌و دەم پاك‌و کردەوە جوانبێ •**

**لەدوای باسی ئەم بەهرە گیانی‌یانە ، ئنجا هاتە سەر باسی ئەو خۆشـیی‌و بەهرانەی کە لەهی جیهان ئەچن ، فەرمـووی (فیها عین جاریة) تیایـەتی کانی‌و سەرچاوەی ئاوی ڕەوان (فیها سرر مرفوعة) تیایەتی گەلێ جۆرە کورسیی‌و تەختی بەرز ، کە لە کەناری ئەو کانی‌و ئاوانە دانراوون بۆ دانیشتن (واکواب موضوعة)**

(١) واتە لەپاشا ئێوە ـ ئەی گومرایانی باوەڕ نەکەران ـ لە درەختی زەقنەمووت ئەخۆن •

وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ(١٥) وَزَرَابِيُّ مَبْثُوثَةٌ(١٦) أَفَلَا يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ(١٧) وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ(١٨)

وپشتی ڕیزکراو(١٥)و قـاڵیی ڕاخراو لەهەمـوو لایەکـەوە(١٦) بـۆ ووردنابنەوە لە حوشتر کە چۆن دروستکراوە؟ ولە ئاسمان کە چۆن بەرزکراوەتەوە(١٨) •

وە گەلێ جۆرە گەلاسو پەرداخی ئاو خواردنەوە(ونمارق مصفوفة)وە گەلێ پشتییو گۆشەی ڕیزکراو ، کە لەسەر ئەو تەختانە دانراوون (وزرابی مبثوثة) وە گەلێ قاڵییو لاکێشی ڕاخراوی گوڵ گوڵیی لەهەموو لایەکەوە •

ئەمە باسی گۆشەیەکی بچکۆلانە بوو لە خۆشییو بەهرەی بەهەشت بە زمانێك کە بۆ خۆشییو بەهرەی جیهان دانراوە ، ئەگینا ئەم لەکوێو ئەو لەکوێ •

⊙ ⊙ ⊙

دیت کە لە سەرەتای سوورەتەکەوە باسی ڕۆژی دواییو ، بەسەرهاتی ئادەمیی کرد لـەو ڕۆژەدا ، دیارە لەناو ئەو کەسانەی کە قورئانیان یەکەمجار بـۆ هاتۆتە خوارەوە ، زۆر کـەسی بێبڕوا بوون ، ئینجا خوا ویستی ئاگاداریان بکاتـەوە بە وورد بوونەوە لە هێندێ دروستکراوی خوا ، لەبەرئەوەی کە قسە لەگەڵکراو بەم ئایەتانە ، یەکەمجار عەرەب بوون ، وە ئەمانیش جگە لەوە ، کە چاکترینی ئاژاڵیان حوشترە ، زۆریشیان دەشتنشینن ، ئەوی هەمیشە لەبەرچاویان بێ ئاسمانو زەوییو شاخوداخو حوشترە ، بۆیە فەرمووی (افلا ینظرون الی الابل کیف خلقت) بۆ بەچاوی وورد بوونەوە تەماشای حوشتر ناکەن کە چۆن دروستکراوە ؟ بەڕاستی حوشتر گیانداریکی گەورەو بەهێزو بارەبەرو کەمخـۆرە ، لە دەشتی گەرمی عەرەبستانا بیست سەعات بە برسێتیو تینوێتی بار ئەبات ، لەپاشا خۆراکی دڕکی حوشترخوارە، کە گیانلەبـەریتر کەمتر ئەیخوا ، لەگـەڵ ئەو هێزو توانـاییو گەورەیییەشا ، منداڵێك ئەتوانێ یخی بداو باری بکاتو هەڵیسێنێو بیبا بە ڕێدا ، لەگەڵ ئەمانەشا شیرو گۆشتی ئەخورێو مووەکەی کاڵاو نوێنو ژێرەخەری لێ دروست ئەکرێ •

(والی السـماء کیف رفعت) وە بۆ تەماشای ئاسمان ناکەن بـە ڕۆژو مانگو

وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ(١٩) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ؟!(٢٠)
فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ(٢١)

**و لەشاخەکان کە چۆن داکوتراوون(١٩)و لەزەوی کە چۆن ڕاخراوە ؟!(٢٠)
ئامۆژگاریی بکە ، تۆ هەر ئامۆژگارییت(٢١)**

ئەستێردیەوە کە چۆن بەرزکراونەتەوە ، وە هەریەکە لەجێی خۆی ڕاگیراوە ، وە بەم جوانی‌یە ، ئەم هاتوچۆیە ئەکەن، بێ‌ئەوەی یەکێکیان ساتێك پاش‌وپێش بکەوێ٠

بۆ تەماشای ئاسمان ناکەن لە کاتی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا ، کە هەر یەکێکیان چەشمەندازێکی دڵفڕێنی هەیە ، وە بۆ تەماشای ئاسمان ناکەن لە شەوێکی سافی بێ‌گەردا ، وە گوێ ناگرن بۆ ئەو قسانەی کە ئەیچرپێنێ بە گوێی دڵو دەروونی ئادەمیی‌دا لەبابەت خواوە ٠

(والی الجبال کیف نصبت) وە بۆ تەماشای شاخو کێوەکان ناکەن کە چۆن وەك سنگ داکوتراوون بە زەویی‌دا ، تا نەبزوێو لەیەك بەرنەبێ ، وە کێوەکانیش نیشانەبن لەسەر ڕێوبان ، وە پەنابن بۆهەموو ئادەمیی‌و گیان‌لەبەرانێکی دوژمن‌دار، جگە لە چەشمەندازە جوانەکەی ، وە لە سامو شکۆهەکەی ، کە ئادەمیی لە چاو ئەوا خۆی زۆر بە بچکۆلانەو زەبوون دێتە پێش چاو ٠

(والی الارض کیف سطحت) وە بۆ تەماشای زەویی ناکەن کە چۆن ڕاخراوە لە ژێر پێتانا بۆ ئەوەی کە بەسەریا بڕۆنو بەهرەی لێوەربگرن ، واتە ئەگەر بێ‌بڕوا ، وورد ببێتەوە لەمانە ، تێ‌ئەگات کە ئەمانە لەخۆیانەوە دروست نەبوون ، بەڵکو خوایەك دروستی کردوون ، وە ئەو خوایەی کە ئەم جیهانەی بەم ڕێکوپێکی‌یە دروست کرووە ، ئەتوانێ ئەم ئادەمی‌یەش زیندو بکاتەوە لەڕۆژی دوایی‌دا بۆ لێ‌پرسینەوە ، ئنجا کە مەردوم لەمانە وورد بووەوە ، ئەو حەلە خێرا پەندی لێ‌وەرئەگرێ ، کەواتە (فذکر انما انت مذکر) بە پەندو ئامۆژگاریی ، خواو ڕۆژی دوایی ، بیری مەردوم بخەرەوە ، چونکە تۆ هەر بیرخەرەوەی مەردومیت ، ئیتر نە ئەتوانییت بڕوا لە دڵو دەروونی کەسا پەیدا بکەیت ، وە نە پێویستیشە لەسەرت

لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُسَيْطِرٍ (٢٢) إلاَّ مَنْ تَوَلَّى وَكَفَرَ (٢٣) فَيُعَذِّبُهُ اللهُ الْعَذَابَ الأَكْبَرْ (٢٤) إنَّ إلَيْنا إيَابَهُمْ (٢٥)

تۆ دەسەلاتدار نییت بەسەریانا(٢٢) بەلام ئەو کەسەی کە پشت هەلکاو بێبڕوایی بکات(٢٣) خوا سزای ئەدات بە سزای زۆر گەورە(٢٤) هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان(٢٥)

---

کە چاودێریی دڵو دەروونی ئەمو ئەو بکەیت ، وەکو ئەفەرموێ (لست علیهم بمسیطر) تۆ دەسەلاتدار نییت بەسەر دڵو دەروونی بێبڕوایانا ، واتە یەکێك خۆی نەیەتە سەر ڕێی ڕاستو بڕواکردن ، تۆ ناتوانییت بڕوا ببەیتە دڵیەوە ٠

ئەگەر جەنگی ئایینی «غەزا»ش ئەڵێیت ، کە لە پاشا پێویست کراوە ، ئەوە بۆ ئەوە نەبووە کە بە زۆر مەردوم مسلمان بکرێ ، وە بڕوا بخرێتە دڵیەوە ، بەڵکو ئەوی لە کاتی پێغەمبەرا بووە ، بۆ پارێزگاریی بووە لە سەرو ماڵو ناموس ، ئەوی دوای پێغەمبەریش بووە ، بۆ هەڵگرتنی کۆسپو گرێ بووە لە ڕێی بانگ کردنی مەردوما بۆ مسلمانبوون ، تا هەموو کەسێك بتوانێ بە ئارەزووی خۆی مسلمان ببێ وە لەدوای مسلمانبوونیشی کەس نەتوانێ بەزۆر پەشیمانیبکاتەوە٠

بۆ ئەوەی کەس لێرەدا خەیاڵێکی خراپ نەکات بڵێ : هەرگاه پێغەمبەر دەسەلاتی بەسەر دڵو دەروونی کەسا نەبێ ، وە هەموو کەسێك لغاوی خۆی بە دەست خۆیەوە بێ ، وە هەرچی بکات ، بتوانێ بیکات ، کەواتە هەمووڵا ، وەك یەك ئەوێستینەوە لە پاشەڕۆژا ، فەرمووی (الا من تولی) بەلام یەکێك پشت هەڵکاتو گوێ نەداتە پەندو ئامۆژگاریی ئایین(وکفر) وە بێبڕوا ببێ بەخواو ڕێی ڕاست (فیعذ به الله العذاب الاکبر) ئەوسا خوا لە تۆڵەی ئەوەدا ئازارو سزای ئەدات بە سزای زۆر سەخت ، واتە تۆ هەرچەند ، هەر ئامۆژگارییت ، وە دەسەلاتت نییە بەسەر دڵو دەروونی کەسا ، بەلام خوای تۆ ، بەدەسەلاتە بەسەریانا ، وە ئاگای لە دڵیانە ، وە هەرکەسێك ملپێچی بکات لە فەرموودەو فەرمانی ئەو ، تۆڵەی لێئەسێنێ ، ئنجا بۆ بەهێز کردنەوەی ئەم تۆڵە سەندنە ، فەرمووی (ان الینا ایابهم)

ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ (٢٦)

لە پاشا لەسەر ئێمەیە لێپرسینەوەیان(٢٦) •

هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان (ثم ان علینا حسابهم) لەپاشا هەر لەسەر ئێمەیە لێپرسینەوەیان •

سُورَةُ الْفَجْرْ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

وَالْفَجْرِ (١) وَلَيَالٍ عَشْرٍ (٢) وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ (٣)

## سوورەی ( فجر )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند بە بەیان(١) وە بە دە شەوەی هەوەڵی مانگ(٢) وە بە تاکو جووت(٣)**

## سوورەی ( فجر )ە

**مەککی‌یە ، ٢٩ ئایەتە ، ١٧٩ ووتەیە**

بسم الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(والفجر) سوێند بەکاتی بەیانیی کە شەبەق ئەداو جیهان ڕوون ئەبێتەوە ، وە تاریکی شەو لائەچێ (وليال عشر) وە بەدەشەوەی هەوەڵی مانگ ، کە لەگەڵ شەبەقدا وەك یەك وان ، چونکە هەروەك شەبەق بەرە بەرە تاریکی شەو کز ئەکات و لەپاشا ئنجا ڕووناکیی ڕۆژ زۆری لێ‌ئەسێنێ ، ئەو دە شەوەش بەهۆی مانگەشەوەکەیەوە تاریکی هەوەڵی شەو کز ئەکەن ، لەپاشا ئنجا تاریکی دوای شەو ، زۆر ئەسێنێ (والشفع والوتر) وە بەتاکو جووتی ئەو دە شەوە ، واتە سوێند بەو دەشەوە هەم بە سەریەکەوە ، وە هەم بەجیا جیا ٠**

**دوورنی‌یە کە مەبەس ژمارەی تاکو جووت بێ کە گەورەترین نهێنی‌یە لە جیهانا ، وە سەرچاوەی گەلێك جۆرە زانیاری‌یە ، جارێ جگە لەوە کە ژمارە لە برانەوەدا نی‌یە ، وە وێنەیەکی نەبڕانەوە «لامتناهی»مان نیشان ئەدات ،**

وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ (٤) هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِذِي حِجْرٍ ؟(٥)

وە بە شەو کاتێك کە تێئەپەڕێ(٤)، ئایا ئەمانەی کە سوێندیان پێخورا شایستەی سوێندپێخواردن نیین لای تێگەیشتوو(٥)

دەرگایەکیشمان لێئەکاتەوە ، لەبڕواکردن بەمانەوەی ئیجگاریی «خلود» ، چونکە مانەوەی ئیجـگارییش هەر نەبڕانەوەیە ، ئنجـا کە نەبڕانەوەی ژمارە بـوو ، با نەبڕانەوەی شتیتریش ببێ کە ژیانی دوایی‌یە •

لەپاش سوێندخواردن بە چەند جۆرێك لەڕووناکیی ، ئنجا سوێند ئەخوات بەتاریکیی ئەفەرموێ (والليل اذا يسر) سوێند بەتاریکیی شەو کە دێتو ئەڕوا •

لەبەیانیانا تاریکی شەو لائەچێ ،و هەمـوو کەسێك بە لەشێکی سـووكو هێزێکی تازەوە دەست ئەکـات بە ئیشوکاری خۆی ، هـەروەك مردبێو زینـدو بووبێتەوە وایە •

دەشەوی هەوەڵی مانگ هەم ڕووناکی‌یەکەی بەکار دێ ، هەم تاریکی‌یەکەی، چونکە جارێ مانگەشەوەکەی ـ کە وەك تارایەکی زیویین وایە بەسەر شاخوداخو دەریاو ووشکانی‌یەوە ـ ماندوێتی ئەحەسێنێتەوە ، وە ژیانێکی تازە ئەبەخشێ ، جگە لەوە هەر کاروبارێك بەڕۆژ لەبەر گەرما نەکرابێ ، بەشەو لەهەوەڵی مانگە شەوەکەیەوە ئەکرێ • تاریکیی دوای مانگەشەوەکەشی مایەی نووستنو حەسانەوەیە جگە لەوە ئەوانـەی کە خۆیان شاردبێتەوە لـەدوژمن ، بەئاسانی ئەتـوانن دوای ئاوابوونی مانگ ڕزگار ببن ، بەڵام شەوی دوانزەی مانگ هەرچەندە کە ئەویش تاریکی دوای ئاوابوونی مانگی هەیە ، وە لێ چونکە کەمەو هیچی تیا نـاکرێ ، بۆیە ناوی نەبرد •

تاریکیی شەوداپۆشەری ئادەمیی‌و گیانداری ترە لە دوژمن ، ئەوی کە لـە ڕۆژا خۆی شاردبێتەوە ، لەشەوا ئەتوانێ دەرباز ببێ ، کەوابوو ئەمانەی کە خوا سوێندی پێخواردن ، زۆر بە کەڵکن بۆ گیانلەبەران ، وە شایستەن بۆ ئەوەی کە بەم سوێندپێخواردنە بەرچاوی بخات ، وەکو ئەفەرموێ (هل في ذلك قسم لذى حجر)

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ (٦) إِرَمَ ذَاتِ العِمَادِ (٧) الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ؟ (٨) وَثَمُودَ

**ئایا نازانیت کەخوای‌تۆ چی‌کرد بەگەلی عاد(ی)(٦) ارم ؟ خاوەن پایە (و دەسەلات)(٧) کە وێنەیان دروست نەکرابوو لەوولاتا ؟(٨) وە (چی‌کرد) بە گەلی ثمود**

ئایا لەمەدا سوێند هەیە بۆ مەردومی ژیر ، واتە ئەمانەی کە سوێندی‌یان پێ‌خورا ئایا لای ژیر شایستەی سوێند پێ‌خواردن نیین ؟ واتە بەڵێ شایستەن چونکە زۆر بە کەڵکن ، مەردوم نابێ لەدەستیان بدەن ، وە بەهرەیان لێ‌وەرنەگرن •

ئەم سوێندە کەوتۆتە دوای ئایەتی «ان الینا ایابهم ثم ان علینا حسابهم» وە پێش ئەم ئایەتە ، لەم سوورەتەدا کە ئەفەرموێ «الم تر کیف فعل ربــك بعاد» ، لەبەرئــەوە جــوابی سوێنــدەکە ئاشکرایــەو پێــویست بــە ووتن نی‌یــە ، وە لە نەووتنیا خوێندەوار ، بەزۆر جۆر بیــری لێ‌ئەکاتەوە ، واتە سوێند بەمانە هیچ بێ‌بڕوایەك لەچنگمان دەرناچێ ، ئنجا ئەگــەر زوو بەزوو تــۆڵەی لێ‌نەسێنین ، لەپاشا لەناوی ئەبەین ، وەك گەلانی بێ‌بڕوای ڕابوردوو ، کە بۆمان باس ئەکات ، ئەفەرموێ (الم تر کیف فعل ربك بعاد) ئایا نەتدیی واتە نەتزانی کە پەروەردگاری تۆ چی‌کــرد بە «عــاد»ی ئوممــەتی «هود» پێغــەمبەر کە گەلێك بــوون لە عەرەب لەنەتەوەی «عوص»ی کوڕی «ارم»ی کوڕی «سام»ی کوڕی «نوح» کە لەنــاوەندی «عومان»و «حضرموت»دا بوون ، ئنجا ئەم گەلە هەروەك پێ‌یان ووتوون «عاد» ، پێشیان‌ووتوون (ارم) کە ئەمانە عادی یەکەمن ، وە ئەم گەلی «ارم»ە (ذات العماد) خاوەن پایەو دەسەلات‌و هێزێکی وابوون (التی لم یخلق مثلها في البلاد) کە وێنەیان لەو ڕۆژەدا دروست نەکراوە لە وولاتا •

(وثمود) وە ئایا نازانییت کە خوای تۆ چی‌کرد بە (ثمود)ی ئوممەتی (صالح) پێغەمبەر کە گەلێك‌بوون لەعەرەب لەنەتەوەی «کاثر»ی کوڕی «ارم»ی کوڕی «سام»ی

الذِینَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ؟(٩) وَفِرْعَوْنَ ذِی الْأَوْتَادِ؟(١٠)
الذِینَ طَغَوْا فِی الْبِلاَدِ(١١) فَأَکْثَرُوا فِیهَا الْفَسَادَ(١٢)

**ئەوانەی کە (شاخی) بەردیان ئەتاشیی لەچۆڵو بیابان(٩) وە بە فیرعەونی خاوەن سنگی زۆر (وەك ئەهرامەکان بن کە وەك سنگ چوون بەزەوییدا)؟(١٠) ئەوانەی کە یاخیبوون لەووڵاتا(١١) وە زۆریان خراپە تیا کرد(١٢)**

**کوڕی «نوح» کە لەناوەندی «شام»و «حجاز»ا بوون ، کە ئەم گەلەش (الذین جابوا الضخر بالواد) کەسانێك بوون کە شاخی بەردیان وەك خانوو داتاشییبوو لەچۆڵ وبیابانا ، وە تیادانیشتبوون ، وەك لە ئایەتێکیترا ئەفەرموێ «وتنحتون من الجبال بیوتا فارهین» شعراء /١٤٩»(١) •**

**(وفرعون ذی الاوتاد) وە ئایا نازانییت کە خوای تۆ چی کرد بە فیرعەون کە حکمداری مصر بوو لەکاتی مووسادا ، وە خاوەنی «ئەهرام»ی وا بووە کە وەك سنگی گەورەی ئەستووری سەر بەرەوخوار ، دا کوتراوون بە زەوییدا ، کە ئەم سی گەلەش (الذین طغوا فی البلاد) کەسانێك بوون کە لەووڵاتی خۆیانا یاخیبوون وە لەرێی ڕاستو دادپرسی لایاندابوو (فاکثروا فیها الفساد) ئنجا زۆریان خراپە تیاکرد ، وە لەهەموو لایەکەوە بەهەموو ڕەنگێك دەستیان کرد بەدەست درێژییو زۆرو ستەم ، گەلی قوڕبەسەر ، یا لەناو کۆتو زنجیرا ئەیناڵاند ، وە یا لەزینداناو بەندیخانەدا ئەیبۆڵاند •**

**هەموو یاخیبوونێك ئەبێ بەهۆی خراپیی یاخییەکەشو ، ئەو گەلەش کە یاخی گەرێتییەکەی لەگەڵا ئەکرێ ، هەروەك ئەبێ بەهۆی پچڕانەوەی هەموو شیرازەیەك ، بۆچی ؟ چونکە یاخی هەر بەشوێن خۆشییو ئارەزووی خۆیا ئەسووڕێتەوە ، لەبەرئەوە سەربەستیی گەلی ناوێ ، وە تەماشای کۆمەڵە ئەکات بە چاوی ئاژاڵ ، وە بە هەموو جۆرێ ، وە لەهەموو لایەکەوە هەووڵئەدات ، بۆ**

(١) واتە هۆدەی زۆر دائەتاشن لەکێوەکان بەشارەزایی •

فَصَبَّ عَلَیْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ(١٣) إنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ(١٤)

**ئنجا پەروەردگاری تۆ دایگرتن بە قامچی سزا(١٣) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە کەمینی ستەمکارانایە(١٤)**

کەڵەمەکردنو دەمکوتکردنیان ، لەبەرئەوە هەموو کەسێك ، خۆی لەقەفەسی دیلییدا ئەبینێ ، نە ئـەتوانێ بەدڵی خۆی قسەبکا ، نە بنووسێ ، نە هەڵسـووڕێ ، بـەم پێشخواردنەوەو قینو ڕقـەی کە لەدڵیا پۆنگك ئەخواتەوە ، چـرای زیرەکییو بلیمەتییان ئەکووژێتەوە ، هەر بەهرەیەکی ببێ کوێر ئەبێتەوە ، نرخی ئادەمێتی دائەمرێتەوە ، تا وای لێدێ خۆی لەبەرچاوی خۆی ئەکەوێ ، لەدوای ماوەیەك ئنجا خۆی لەخـۆیا بۆگەن ئەبێ وە ئـەبێ بە گۆمێکی پـڕ لەکرمو مـار ، وە چـرای دڵودەروونی ئەکوژێتەوە ، وە مەردییو ڕەووشتو خووی بەرزی لەبیرئەچێتەوە.

ئنجا کە زۆروستەمو بەدکرداریی بڵاوبووەوە ، هیچ چارەیەك نامێنێ ، پاك کردنەوەی ووڵات نەبێ لەخراپان ، لەبەر ئـەوە (فصب علیهم ربك سوط عذاب) پەروەردگاری تـۆ دایگرتن بە قامچی تۆڵـەو سزا یەك لەسەر یەك ، کـە هەموو تۆڵەیەك وەك قامچی بچووزێنێتەوە ، تا دوایی لەناوی بردنو کردنی بەواتەی ڕۆژگار .

ئەمە دەستوورو باری خوایە لەجیهانا ، هەر گەلێك کە لەڕێی ڕاست لایدا ، وە دەستی کرد بەزۆرو ستەمو دەستدرێژیی ، خوا پێی ئەنوێنێ ، تا بسڵەمێتەوە ، وە لەکردەوە خراپەکانی بگەڕێتەوە ، بێئەوەی گەلێك دەربکات لەم دەستوورە ، وەکو ئەفەرمـوێ (ان ربـك لبالمرصاد) بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ لەکەمینی ستەمکارانایە

⊙ ⊙ ⊙

ئنجا ئەگەر ئەتەوێ ئادەمیی بناسییت بەخۆیو هەموو بێئاگاییو بەدبینییەکی لەگەڵ پەروەردگاریا ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوە کە ئەفەرموێ «فاما الانسان» هەتەد واتە ئەمەی پێشوو چۆنێتی خـوای تۆ بوو ، لەمەولاش چـۆنێتی ئادەمییتان بـۆ

فَأَمَّا الْإِنْسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ ، فَيَقُولُ : رَبِّي أَكْرَمَنِ (١٥) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ ،

**کاتێك کە خوا ئادەمیی تاقیکردەوە ، بەم ڕەنگە ڕێزیگرتو بەهرەی بەسەرارشت ئەوا ئەڵێ پەروەردگارم ڕێزی گرتووم(١٥) وە ئەگەر کاتێك تاقیکردەوە (بەمڕەنگە) ڕۆزیی لێگرتەوە ،**

**ئەخوێنرێتەوە دوای ئەوەی چۆنێتی پەروەردگاری خۆتت خوێندەوە ، وەکو ئەفەرموێت (فاما الانسان) ئادەمیی (اذا ما ابتلاه ربه) کاتێك کە پەروەردگاری ، تاقییکردەوە ، بەم ڕەنگە (فاکرمه) ڕێزی گرت (ونعمه) وە بەهرەی بەسەرا ڕشت ، تا بزانێ ئایا سوپاس ئەکات یا نا ، وە ئەو ڕێزو بەهرەیەی کە داوێتی لەڕێی چاکەو خزمەتی هەژارانا بەکاری دێنێ ،یا لەخوێنمژیی‌و دەستدرێژییدا؟ ئەو حەلە بەشی زۆریان لەو تاقیکردنەوەیەدا ، دەرناچن ، وە وا ئەزانن کە خۆیان خۆشەویستیخوان‌و چینێکی هەڵبژاردەی ئەوون ، وە ئەبێ خوا دەوڵەمەندیان بکات، وە نازو بەهرەی خۆی بڕێژێ بەسەریانا ، ئنجا ئەو حەلە واتێئەگەن کە هەرچی بکەن لەخراپەو دەستدرێژیی مافی خۆیانە ، ئیتر لەهیچشتێك سڵناکەن ، وە هەرچی ئارەزوو بکەن لەخراپە ئەیکەن ، ئنجا تەعبیری دایەوە لەم یاخیبوون‌و سەرکێشییەیان بە فەرموودەی (فیقول ربی اکرمن) واتە ئەو حەلە ئەڵێ : پەروەردگارم گەورەو دەوڵەمەندی کردووم ، وە ڕێزو ناوونیشانی داومێ ناچارم بەپێی ئەو ناوونیشانەم هەڵسووڕێم ، وە لەگەڵ ڕۆژا بڕۆم بەڕێدا بۆ پارێزگاریی پایەو دەسەڵاتەکەم ، وە هەرکەسێکیش وا خۆشەویست بێ لای خوا، هیچیلێناکرێ، ئنجا ئەو حەلە لەجیاتی چاکە ، خراپە ئەکات (واما اذا ماابتلاه) وە ئەگەر کاتێك تاقیکردەوە ، بەم ڕەنگە (فقدر علیه رزقه) ڕۆزیی لێگرتەوە ، تا بزانێ ئایا هەژارێکی سابرو خۆ ڕاگرە ، یا نا ؟ هەروەك زۆرجار هەژار ئەبینیین لەژێر باری ئەم تاقیکردنەوەیەدا ، دەرئەچێ ، وە زۆریشیان دەرناچن ، چونکە وائەزانن کە ریسوای لای خوان ، وە هەرچی نرخ بێ نییانە ، وە شایستەی ئەوە نیین کە پرسیاریان لێبکرێ لەپاشە ڕۆژا ، لەبەرئەوە هەرچییان لێهەڵکەوێ ئەیکەن ،**

فَيَقُولُ : رَبِّى أَهَانَنِ(١٦) كَلاَّ !

**ئەوا ئەڵێ : پەروەردگارم ریسوای کردم(۱٦) نەء وانیيە (کە تێی گەیشتوویت)**

ئنجا تەعبیری دایەوە لەم بیرە ناقۆڵایە بەم عبارەتە کە ئەفـەرموێ (فیقول ربی أهانن) ئەڵێ خوا ڕیسواو بێنموودی کردووم ، وە هەرکەسێکیش ئەمەندە لای خوا بێنرخ بێ ، لەهیچەوە دیارنیيە ، وە هیچی لێناگرێ ، نە چاکەی بە چاکە پاداشو، نە خراپەی بە خراپە تۆڵە ئەدرێتەوە ، ئیتر لەهەرلایەکەوە هەرچێکی لێهەڵکەوێ پڕی پیا ئەکات ، بەدزیی بێ ، بەسوێندی درۆ بێ ، یا بە هەرفروفێڵێکی تر بێ ، وە ئەم هەژارە لەگەڵ دەوڵەمەندە زۆردارەکەدا ، جیاوازیی نیيە لەپیسـکردنی ناوچەو زیانگەیاندن بەکۆمەڵەدا •

بەڕاستی مـەردوم ئەگەر ووردبێتەوە ، هەمووڕۆژێ بەچاوی خـۆی ئەمانە ئەبینێ ، بەم ڕەنگە یا دەوڵەمەندی دەستدارەو لغاوی هەوەسو ئارەزووی خـۆی بەرداوە ، وە بەهیچ شتێکەوە ناوەستێ ، وە یا هەژارەو خۆی بە بچووکێکی وادێتە پێشچاو کە شایستەی لێپرسینەوە نیيە ، ئنجا ئەفەرموێ (کلا) وانیيـە وەکـو تێی گەیشتوون ، نە گـەورەیی لای خوا بـە دەوڵەمەندیيو دەسـتداریيەو نە بێنرخییش بە هەژارییو بێدەسەڵاتیيە ، بەڵکو گەورەیی لای خوا ، بەچـاکەو خوا پەرستیيەو بێنرخییش بەخراپیو چوونە دەرەوەیە لەفەرموودەو فەرمانی خوا، زۆر هەژاری دڵپاکی گیانبەرز هەن ، گەلێ لە دەوڵەمەندو دەستدار خۆشەویست ترو بە نرخترن لای خوا •

واتە نابێ ئادەمیی وا بەدبیین بێ لەگـەڵ پەروەردگاری خۆی ، بەڵکـو بە پێچەوانەی ئەمە ، ئەبێ وا بزانێ کە هەرچی خوا بۆی ئەکات ، ئەوە خێری ئەوێ تیایە ، تەنانەت ئەگەر هەژاری کرد ، ئەوە بۆ ئەوەیە کە لەبۆتەی هەژارییدا قاڵی بکات ، جگە لەوە ، هەر هەژارییە کە هەزاران هێزو تەوانایی بێپایانی مەردومی دەرخستووە ، وە هەزاران هەژاری دەستپاکی ، دەمپاکی ، دڵپاکی وەك شێری نەڕ ، لەبێشەی هەژاریی هێناوەتە دەرەوە ، وە بەبیری تیژی خۆیان ڕێگای سـەختی

بَلْ لاَ تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ(١٧) وَلاَ تَحاضُونَ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ(١٨)

بەڵكو ئێوە ڕێزی هەتیوان ناگرن(١٧) وە هانە هانە (ی یەکتریی) نادەن لەسەر خواردەمەنیدان (و بەخێوکردن)ی هەژاران(١٨) •

ژیانیان هەڵبژاردووە ، وە چاکی مەردانەیان لیکردووە بەلادا ، تا ئەو ڕێگایەیان بڕییوە ، وە گەیشتوون بە پلەی هەرەبەرزی ژیانو ، چوونەتە ڕیزی هەرە دەوڵەمەندو پیاوە گەورەکانی جیهان ، کەوابوو مەردوم ئەبێ هەمیشە سوپاسی خوای خۆی بکات لەسەر دەوڵەمەندییو هەژاریی ، وە لەهیچیانا لانەدا لەسنووری خـوا •

ئاشکرایە کە قسەلەگەڵکراو ، بەم ئایەتانە ، یەکەمجار عەرەب بوون ، کە خۆیان بە ئۆمەتی ئیبراهیم پێغەمبەر دائەنا ، وەوایانئەزانی کە ئەوانیش ئاینێکیان هەیە ، ئنجا کە گوێیان لەم هەڕەشانەی قورئان ئەبوو ، وە ئەیانبینی کە پلاری تیایە بۆ بێبڕوایی ئەوان ، بە دڵ لە خۆیانیان دوورئەخستەوە ، وە ئەیانووت ئەمانە بۆ ئێمە نییە ، چونکە ئێمە خواناسین ، ئنجا خوا بەدرۆیانئەخاتەوە ، وە بەڵگەو نیشانەی لەسەر ئەهێنێتەوە ، ئەفەرموێ درۆئەکەن نە بڕواتان هەیەو نەڕەحم لەدڵتانا هەیە ، وەکو ئەفەرموێ (بل لا تكرمون اليتيم) بەڵکو ئێوە لەگەڵ ئەم هەموو دەسەڵاتەی کە هەتانە ، نە دەستگیرۆیی هەتیو ئەکـەن (ولاتحاضون عـلى طعام المسكين) وە نەهانە هانەی یەکتریی ئەدەن لەسەر دەستگیروییی هەژاران •

لەم ئایەتەو گەلێ ئایەتی ترەوە ، دەرئەکەوێ کە قورئان زۆری مەبەستە ، دەستگیرۆیی هەتیوانو هەژاران وە نزیبك خستنەوەیان لە کۆمەڵو گەل ، ئنجا ئەگەر خۆتان ئەتوانن خۆتان ، وە ئەگەر ناتوانن ، هانە هانەی مەردوم بدەن لەسەر دەستگیرۆییان ، کە ئەمە پیشەی کۆمەڵانی چاك «جمعیاتی خیری»ە •

ئەم بەزەیی نەهاتنەوەیەتان بە هەتیوانو هەژارانا ، لەبەر ئـەوە نییە کە دەستتان لەجیهان هەڵگرتووە ، وە دەخڵتان بەسەر کەسەوە نەماوە،وەك هێندی کەس کە دەستبـەرداری دنیا ئەبن ، وە لەپەنایـەکا ئەکەوون تا ئەمـرن ، بەڵکو ئێوە

وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلاً لَمّاً (١٩) وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبّاً جَمّاً (٢٠)
كَلاَّ! إذا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكّاً دَكّاً (٢١) وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفّاً
صَفّاً (٢٢) وَجِيءَ يَوْمَئِذٍ بِجَهَنَّمَ ، يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ الْإِنْسَانُ :

(بەڵکو سەرەڕای ئەمەش بەشە) کەلەپوور (ی بەشداران) ئەخۆن بەسەروبەرەوە(١٩) وە دارایی‌تـان خۆش‌ئـەوێ بەخۆش‌ویستنێکی زۆر (٢٠) وامـەکەن ! کاتێـك کە زەوی پارە پارە کرا(٢١) وە (فەرمانی) خوا هات لەگەڵ فریشتەداو پۆل پۆل وێستان(٢٢) وە دۆزەخ ئامادەکـرا ، لەو ڕۆژەدا ئادەمیی ( کردەوەی خـۆی ) بیر ئەکەوێتەوە ،

ئەوەندە هەڵپەی ژیانتان زۆرە ، خـراپەکانی پێشووش ئەکـەن (وتاکلون التراث اکلا لما) و بەشە کەلەپووری بەشدارانیش ئەخۆن ، نەخوازەڵا ئافرەت کە لەبەر بەشە کەلەپوورەکەیان مارەیان ئەکەن هەر بۆ خواردنی پارەکەیان (وتحبون المال حبا جما) وە دارایی جیهانتان خۆش ئەوێ بە خۆشەویستنێکی زۆر ، بەڕەنگێکی وا کە سوودی بۆ بکەن ، وە خوێن مژی تیا بکەن ، واتە ئەگەر ڕاستتان ئەکـرد وا نەئەبوون ، کەوابوو گەورەترین نیشانە لەسەر درۆکەتان ئەمەیە کەوا چاوتان بڕییوەتە ماڵی دنیا ، بەجۆرێکیوا کە دڵتان داناچڵەکێ ، نە بە داماویی هەتییوو نە بە نەدارایی هەژاران ، وە بیرێك ناکەنەوە لەحاڵیان ، بەتەنگەوەنین ئەگەر هەموو سەرسەریی ببن •

(کلا) پەشیمان بنەوە لەم خراپانە ، پێش ئەوەی ڕۆژی پەشیمان بوونەوە بێ، وەکو ئەفەرموێ (اذا دکت الارض دکادکا) کاتێك کە زەویی پارە پارە کـرا ، وە هەرچی شاخو بەرزیی هەیە هەمووی یەکسان کرا (وجاء ربك) وە پەروەردگاری تۆ هات ، واتە فەرمانی هاتە خوارەوە (والملك صفا صفا) وە فریشتە هاتن‌و پۆل پۆل ڕیزیان بەست (وجیء یومئذ بجهنم) وە دۆزەخ دەرکەوت بۆ تەماشاکەران ، وەك لەئایەتێکی‌ترا ئەفەرموێ «وبرزت الجحیم لمن یری»(١) (یومئذ یتذکر الانسان) لەو ڕۆژەدا ئـادەمیی هەرچێکی کـردبێ لەجیهانـا بیری ئەکەوێتـەوە ، بەڵام چ

(١) واتە دۆزەخ دەرخرا بۆ هەرکەسێك کە ببینێ •

وَأَنَّى لَهُ الذِّكْرَى؟(٢٣) يَقُولُ : يَالَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي(٢٤)
فَيَوْمَئِذٍ لاَ يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ(٢٥) وَلاَ يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ(٢٦)

**بەڵام ئەو بیرکەوتنەوەیە چ سوودێك بەو ئەدات؟(٢٣) (ئنجا بەداخەوە) ئەڵێ : کاشکێ لەدنیادا کاری چاکەم پێشبخستایە بۆ ژیانی ئەم ڕۆژەم(٢٤) ئنجا لەو ڕۆژەدا کەس سزای کەس نادات بەوێنەی سزای ئەو(٢٥) وە کەس پێوەندی کەس ناکات بەوێنەی پێوەندکردنی ئەو(٢٦) •**

سوود (وانی له الذکری) لەکوێ قازانج بەو ئەدا ئەو بیرکەوتنەوەیە ، واتە هیچ سوودێکی لێنابینێ ، جا لەبەر ئەوە بەدڵێکی پڕ لەداخو پەشیمانی‌یەوە (یقول یالیتنی قدمت لحیاتی) ئەڵێ خۆزگە لەجیهانا کردەوەیەکی باشم پێشبخستایە بۆ ژیانی ئەم ڕۆژەم (فیومئذ لایعذب عذابه احد) ئنجا لەوڕۆژەدا خوای گەورە سزای دەوڵەمەندانی یاخیو هەژارانی خراپی سەرلێشێواو ئەدات بە سزایەکی وا کە لە دەست کەس نەهاتبێ (ولا یوثق وثاقه احد) وە پێوەندو کەلەپچەیەکی واقایمیان ئەکات کە لەدەست کەس نەیێت خوا نەبێ •

⊙ ⊙ ⊙

لەدوای باسی تەمەعو چاوبرسێتی ئادەمیی کە هەوەسو ئارەزوو پێی ئەکات ، وە لای ئەدا لەڕێی ڕاست ، لەگەڵ باسی ئەو ئازارو سزایانەی کە لە ڕۆژی دوایی‌دا دووچاری ئەبێ ، ئنجا بانگی ئەو کەسانە ئەکا کە لە ڕەووشتو خووی ناشرینین خۆیان پاك ئەکەنەوە ، وە خەریکی پاککردنەوەی گیانو ، جوانکردنی ڕەووشتو خووی خۆیانن ، لە دەوڵەمەندیی‌دا ، ڕژدییو چرووکیو دەست‌درێژیی ناکەن ، وە چاویان لە هەتییوو هەژارەوەیە ، لەهەژارییشا خۆڕاگرن، وە چاویان لەماڵی کەسەو ەنی‌یە ، لەگەڵ ئەو هەژاری‌یەدا ، ئاگایان لەهەتییوانو هەژارانە ، ئەگەر بەماڵ نەیان توانی خزمەتیان بکەن ، بە زبان ئامۆژگاریی مەردوم ئەکەن بە خزمەتکردنیان ، ئەمانە بەڕاستی یارم فریشتەیەکن بۆ خۆیان ، شایستەن بۆ ئەوەی کە بەناوی نەفسو گیانەوە بانگ بکرێن ، وە پێیان بڵێن : ئەی نەفسی بە ئارام ، وەرە بڕۆ بۆ بەهەشت ، وە بۆ دراوسێتی خواوچاکان ،

يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ(٢٧) إرْجِعِي إلى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً(٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ، وَادْخُلِي جَنَّتِي(٢٩)

**(لەوڕۆژەدا بە خواپەرست ئەووترێ) : ئەی نەفسی بەئارام(٢٧) بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگاری خۆت بە خۆشنوودو پەسەندکراو(٢٨) ئنجا بچۆرە ناو بەندەگانیمنو ، بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە(٢٩) .**

بەڕازییمەندیی ، چونکە لە جیهانا ڕازییبووە هەم بەبەشی خوا ، وە هەم لەکردەوەی خۆی ، چ لە دەوڵەمەندییو چ لە هەژارییدا ، وە بەڕازییلێبواویی چونکە لەجیهانا کەسی ئازارنەداوە ، وە هەموو کەس لێی ڕازییبووە ، دیارە کەسێك کەوابێ ، خواش لێیڕازییە ، وەکو ئەفەرموێ (یا ایتها النفس المطئنة) ئەی نەفسی بەئارام ، بەهۆی بڕواو خواپەرستیتەوە (ارجعي الى ربك) بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت دوای مردنت (راضية مرضية) بە ڕەزامەندییو ڕازیلێبوویی (فادخلي في عبادي) تێکەڵی چاکانمببە (وادخلي جنتي) وە لەگەڵ ئەوانا بچۆرە بەهەشتمەوە .

سُورَةُ البَلَد

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

لاَ أُقْسِمُ بِهَذَا الْبَلَدِ(١) وَأَنْتَ حِلٌ بِهَذَا الْبَلَدِ(٢)

---

## سوورەی ( بلـد )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند ناخۆم بەم شارە (کە مەککەیە)(١) کە ئازاردانی تۆی تیا ڕێدراوە(٢)

---

## سوورەی ( بلـد )ە

**مەککی‌یە ، ٢٠ ئایەتە ، ٨٢ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(لا اقسم)(١) سوێندناخۆم (بهذا البلد) بەم شاری مکەیە کە پێغەمبەری تیا لەدایك‌بووە ، وە چـرای ئیسلامەتی تیاهەڵکـراوە ، وە کعبەی تیـا دروست‌کراوە لەلایەن ابراهیمی خلیل‌و اسماعیلی کوڕی‌یەوە بۆ ئەوەی ببێ بەڕووگەی خۆی‌و نەوەو وەچـەی تا حەزرەتی محمد درووودی خوای لێ‌بێ ، وە ببێ بـە بەست‌وپەنا بۆیان ، ئەو شارەی کە دارودرەخت شکاندنەوەو ، گیان‌لەبەر تیاکوشتنی قەدەغەیە ، واتە سوێند بـەم شارە لەکاتێکا کـە (وانت حل بهـذا البلد) ئازاردانی تـۆی تیا**

---

(١) لە سوورەی «حاقە»و «تکویر»و «انشقاق»دا تەفسیری «لااقسم»مان کردووە ٠

وَوَالِدٍ وَمَا وَلَدَ(٣) لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ(٤)

وە بەباوكو ئەوەی كە لێی كەوتۆتەوە(٣) بەڕاستی ئادەمیی‌مان دروست‌كردووە لە ڕەنجو كێشە(٤) •

ڕێدراوە لەلایەن بێبڕواكانەوە (ووالد وما ولد)(٢) وە بە هەموو باوكو ڕۆڵەیەك لە ئادەمییو گیانلەبەرو شیینایی (لقد خلقنا الانسان) بێگومان ئادەمیی‌مان دروست كردووە (في كبد) لە ڕەنجوكێشە ، واتە لە ڕۆژی هاتنە جیهانی‌یەوە تا مردنی لە ڕەنجو هــەوڵو ماندوێتی‌دایە ، بەم ڕەنگە خواردنی ڕەنجو جووڵانــەوەی ڕەنجو پێ‌گرتنی ڕەنجو پشت‌ڕاستبوونەوەی ڕەنجو قسە فێربوونی ڕەنجو دان ڕووانی ڕەنجو خوێندنو فێربوونی ڕەنجو بیركردنەوەی ڕەنجو ژیانی ڕەنجو خواپەرستیی ڕەنجو هەموو شتێكی ڕەنجە لەناو ڕەنجا ، نەخوازەلا پیاوانی گەورەی هەڵكەوتوو كە ئەیانەوێ خزمەتی ئادەمیی بكەن بە تێكڕایی ، وەك پێغەمبەری ئیسلام «دروودی خوای لێ‌بێ» وە ئەم هەڵكەوتوانە نابێ كۆڵ بدەنو دەست هەڵگرن ، بەڵكو ئەبێ وەك مۆم خــۆیان داگیرسێنن تا جیهانێك ڕووناك‌ئــەكەنەوەو ، كۆمەڵێك لــە ئادەمیی ئەحەسێننەوە •

واتە ئەی پێغەمبەر دڵت لە خۆت نەمێنێو سارد نەبیتەوە ، وە بە ئازاردانت ، لەلایەن گەلەكەتــەوە ، دەست هەڵنەگرییت ، چونكە ئەم ڕەنجوكێشــەیە پیشەی هەموو پیاوێكی گەورەی هەڵكەوتووە بەڵكو پێویستی ژیانی هەموو ئادەمی‌یەكە •

سوێندی یەكەم دووشت ئەگەیەنێ ، یەكەم موبارەكیی شاری (مكە) ، واتە ئەم شارە لەزۆر كۆنەوە ، شارێكی پیرۆز ، وە هەر بەستوپەنا بووە ، هەركەسێك چووبێتە ناوێوە دڵنیابووە لە هەموو ئــازارو دەست‌درێژی‌یەك ، ئێستا هەرچەند تۆشی تیا ئازار بدرێو خوێنتی تیا بكرێتە كاسەوە ، هێشتا هەر شایستەی ئەوەیە كە خوا سوێندی پێ‌بخوات ، دووهەم سەرزەنشتی بێبڕواكانی مەككەیە كە حورمەتی

(٢) ئەم دوو وتەیە ئیشارەتی تیایە بۆ ئەو باوكو كوڕەی كە لە شاری مەككە كعبەیان دروست‌كرد كە ابراهیمو اسماعیلی كوڕێتی •

شارەکەیان ناگرن ، بەو ڕەنگەی کە شایستەیەتی ، واتە نەئەبوو ئازاری کەسی تیا بدەن چ جای پێغەمبەرەکەیان ٠

سوێندی دووهەم بۆ ئەوەیە کە ئاووڕێکمان پێبداتەوە بەلای چۆنیەتی پەیدا بوونی ئادەمییو گیانلەبەرو شیینایییەوە ، وە بەلای ئەو دەستووره ڕێکوپێکانەی کە تێیاندایـە ، وە ئـەو ڕەنـجو کۆششەی کە بـاوكو ڕۆڵە ئەیدەن لـە پێناوی پێگەیاندنی وەچەیانا ٠

مەردوم ئەگەر باش وورد ببێتەوە لە شیینایی کە چۆن لەپێشەوە تۆوەکەیان ئەڕوێ ، وەخواردنو خواردنەوە لەزویی وەرئەگرێ ، وە لە باوهەتاو ، بەهرەمەند ئەبێ ، وە چـۆن لقوپۆپ دەرئەکاتو بەرهەڵستی سەرماو گەرمـاو گەلێشتیتر ئەکات ، وە ئەم تۆوەش لەپاشا ڕەنجێکیتری دوورودرێژ ئەدات ، تا ئەبێتەوە بە درەختێکیتر ، وە جیهان جوان ئەکات بە سەوزییو تەڕییو پاراویی خۆی هەر بەم ڕەنگە مەردوم ئەگەر بەرزتر بڕوانێ ، وە تۆزێك وورد ببێتەوە لە ئادەمییو گیاندارانیتر ، کە چۆن پەیدا بوون ؟ وە هەمیشە زاووزێ ئەکەن ، وە هەموو گیاندارێك بە سروشت ئەوەندە هەستو تێگەیشتنی دراوەتێو ڕێنموونییکراوە ، کە پێویستی ژیانی خۆیو منالو بێچوولەی بزانێو پەروەردەیان بکاتو بەرهەمیان بێنێ ، نەخوازەلا ئادەمیی کە لە هەموویان ئەرکی زۆرترو پێویستیی گەورەترە ، مەردوم ئەگـەر بـاش لەمـانە ووردببێتـەوە ، تێئـەگات کـە ئەم ڕووپـەڕەیە ، ڕووپەڕەیەکی ئێجگار ووردو قووڵە ، پێویستە بە بیرلێکردنەوە ٠

لەباسکردنی شاری مەککە لەگەڵ باوكو ڕۆڵەدا ، وە لەگەڵ باسی ئازاردانی پێغەمبەر تیایـا ، ئەگەیـەنێ کـە شـاری مەککـە ـ لەگـەڵ کـردەوەی خـراپی دانیشتووەکانیا ـ شتێکی زۆر گەورەی وای تیا لەدایك ئەبێ ـ وەك ئایینی ئیسلام بێ کە لەپاشەڕۆژا ببێ بە مایەی شانازیی ئادەمیی ، وە هەم ئەگەیەنێ کە ئەم هەموو ئازارو سزایانەی کـە دووچاری پێغەمبەر ئەبێ لەم ڕێگایەدا ، وەك ئـەو ئازارو سزایانە وایە کـە دووچاری باووك ئەبێ لـە پێناوی گەورەکـردنو پێگەیاندنی ڕۆڵەو جگەرگۆشـەیا ، هەروەك ئەگەیەنێ کە ئەم شتەی تیا لەدایكبـووە ، وەك

أَيَحْسَبُ أَنْ لَنْ يَقْدِرَ عَلَيْهِ أَحَدٌ؟(٥) يَقُولُ: أَهْلَكْتُ مَالاً لُبَدًا(٦) أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ؟(٧)

---

ئایا وائەزانێ کە کەس دەسەڵاتی بەسەریا نی‌یە ؟(٥) (بەفیزەوە) ئەڵێ : ماڵی‌زۆرم لەناو بردووە(٦) ئایا وائـەزانێ کە کەس نەی‌دیـوە ؟(٧)

---

هەموو ڕۆڵەو وەچەیەك ، ڕۆژبەڕۆژ لەگەورەبوونا ئەبێ ، تا ئەگات بە پلەی هەرە بەرزی خۆی لەجیهانا •

⊙ ⊙ ⊙

لەم ئایەتانەدا هەروەك دڵخۆشیی‌دانەوەی پێغەمبەری تیایە ، هەڕەشەشی تیایە بۆ ئەو زۆردارانەی کە بەهێزی بازوو یا بە پیشەو پایە ، یا بە پارەو دارایی خۆیـان ئەنـازن ، وە بەچـاوی سـووك تەماشای مەردوم ئەکـەن ، وە ئـازاری پێغەمبەرەکەیان ئەدەن لە شوێنێکی وەك مەککەدا ، واتە ئێوە ئەگەر ووردبینەوە ، تێ‌ئەگەن کە زۆر زەبوونن ، لە پاروە نانێكو قومەئاوێکەوە کە بیخۆنو بیخۆنەوە ، تا هەمـوو ئیش‌وکارێکی‌ترتـان ، پێویستن بـە ئیش‌کردنو جووڵانـەوەو جۆرە ڕەنجێك ، کە وابوو وا مەزانن کە بێ‌نیازن لە هەموو کەسێك ، وە کەس دەرەقەتتان نایەت ، وەکو ئەفەرموێ (أیحسب) ئایا ئەوکەسەی کە بە هێزی بازوو ئەنازێ وائەزانێ (ان لن یقدر علیه احد) کە کەس زۆری بەسەریا ناشکێ ؟ ، نەخوازەڵا ئەو خوایەی کە دروستی‌کردووەو ، ئاگاداریی ئەکات •

ئەوکەسەی کە بەپارەو داراییش ئەخوڕێ ، ئەگەر جارێك داوای یارمەتی‌یەکی لێ‌بکرێ بۆ کارێکی باش (یقول) ئەڵێ (اهلکت مالا لبدا) پارەو ماڵی زۆرم لەناو بردووە ، واتە ئەو دارایی‌یە زۆرەی کە بەختم کردووە بەسە ، ئنجا خوا پێی‌ئەڵێ : (أیحسب) ئایا وائەزانێ (ان لم یره احد) کە کەس نەی‌بینیوە ، واتە ئێمە ئاگامان لە هەموو کردەوەیەکێتی ، وە ئەزانین چی خەرج‌ئەکات ، وە بۆچی خەرج‌ئەکات •

⊙ ⊙ ⊙

لەپێشەوە باسی‌کرد کە ئادەمیی دروست‌کراوە لە ڕەنجو تێکۆشان ، لەپاشا سەرکۆنەی ئەو نادانانەی‌کرد کە یاخیین وە وائەزانن کە کەس دەرەقەتیان نایەت ، لەگەڵ ئەو

أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ(٨) وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ(٩) وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ؟؟(١٠) فَلاَ اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ(١١)

**ئایا دووچاومان نەداوەتێ(٨) وە زمانێكو دوولێومان پێ‌نەداوە ؟(٩) وە ڕێی چاكوخراپمان نیشان‌نەداوە ؟(١٠)هێشتا (ئادەمیی بەتێكرایی)پەلاماری پلەی سەختی**

ڕیاكارانەی كە ماڵی خۆیان بەخت ئەكەن بۆ ناووشۆرەت ، ئێستا ئەیەوێ بەهەردوو لایان بڵێ كە خوا باشترین بەهرەی پێ‌داوون ، وەك بەهرەی چاوو گوێو ژیریی‌و بیربێ ، ئەفەرموێ (الم نجعل له عينين) ئایا دووچاومان نەداوە بە ئادەمیی ، كە نامەی بوونەوەری پێ‌بخوێنێتەوە (ولسان وشفتين) وە زمانێكو دوو لێومان نەداوەتێ كە قسەی پێ‌بكات ، وە مەبەستی دڵی خۆی پێ‌بەجێ‌بێنێ ، (وهديناه النجدين) وەڕێگای باش‌وخراپمان نیشان‌نەداوە؟ ،واتە ئادەمیی‌مان وادروست‌كردووە، كە بە سروشت چاكوخراپ لەیەك جیابكاتەوە ، وە بە ژیریی‌و بیر بیاندۆزێتەوە ، لەپاشا سەربەخۆیی «اختيار»مان داوەتێ بە ڕەنگێكی وا كە ئارەزووی هەركامێكیانی كرد بتوانێ بیكات واتە ئەو خوایەی كە بتوانێ ئەم هەموو بەهرانە بدات بە ئادەمیی ، ئەشتوانێ لێی‌بسێنێتەوە ، كەوابوو ، با وانەزانێ كە كەس دەرەقەتی نایەت ، یا ئاگای لە نهێنی ئەو نی‌یە ، وە پێویست بوو هەمیشە لە سوپاسی ئەم بەهرانەدابێ ، وە ڕێی چاكە بگرێ ، وە بە ژیریی‌و بیرو دەستو دەمو دڵ ، هەوڵ بدات بۆ پێشخستنی هاوتەحری ، وە بۆ بەرزكردنەوەیان لە پلەی شارستانێتی‌و ڕەوشتو خوودا ، وە پێویست بوو لەسەری كە هەووڵبدات بۆ ئەوەی كە هەموو جۆرە ناخۆشیەكیان لەسەر هەڵگرێ وە هەموو كۆسپێكیان لەڕێدا لابەرێ ، وە هەموو گرێیەكی ژیانیان بۆبكاتەوە ، نەخوازەلا گرێی برسێتی‌و بەندەیی «ڕق» ، كە ساڵەهای ساڵە ئادەمیی ئەناڵێنێ بەدەستیانەوە ، بەڵكو ئەبوو تا ئێستا ئەم دوو پلە سەختەی ببڕیایە ، وە دەردی هەژاریی‌و بەندەیی لەناوا هەڵبگرتایە ، بەڵام هێشتا ئەم دوو پلەیەی نەبڕییوە ، وەكو ئەفەرموێ (فلا اقتحم العقبة) هێشتا ئادەمیی بە تەواویی پەلاماری پلەی سەختی نەداوە ، ئنجا بۆ نیشاندانی سەختیی

وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ ؟(١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ (١٤) يَتِيماً ذَا مَقْرَبَةٍ أَوْ مِسْكِيناً ذَا مَتْرَبَةٍ (١٦)

**نەداوە(١١) تۆ چووزانییت پلەی سەخت کامەیە ؟(١٢) ئازادکردنی بەندەیە(١٣) وناندانە لـە ڕۆژی برسـێتیدا (١٤) بـە هەتیوی خزم(١٥) یا بـە هەژاری کەفتەکار(١٦) •**

**ئەو پلەیە ، ئەفەرموێ (وما ادراك ما العقبة) تۆ چووزانییت ئەو پلەسەختە کامەیە ؟ کە ڕێی خۆشییو بەرزبوونەوەی لە ئادەمیی گرتووە ، ئنجا باسی ئەکات ئەفەرموێ ئەو پلە سەختە دووشتە :**

**١ ـ (فك رقبة) ئازادکردنی بەندەیە •**

**لەلایەك خوا بەندە گرتنی ئەمەندە بەلاوە سەختو گران بێ ، کە بۆ یەکە یەکەی ئادەمییە ، وە ئازادکردنی تاقە یەکێکی ئەمەندە مەبەست بێ ، ئەبێ داگیر کردنی گەلێکی ، چەند پێناخۆشبێ ، وە ڕزگارکردنیان لەژێر دەستیی ، چەند پێخۆشبێ •**

**٢ ـ (او اطعام) نانذانە (في يوم ذی مسغبة) لە ڕۆژی برسێتییو گرانیدا (يتيما ذا مقربة) بە هەتیوی خزم (او مسکینا ذا متربة) یا بە هەژارێکی کەفتەکار کە لەسەر خاك کەوتبێ ، واتە پێویستە لەسەر هەموو کەسێك هەووڵدان بۆ لابردنو تەختکردنی ئەم دوو پلە سەختە ، پلەی برسێتییو پلەی بەندەییو ژێردەستیی •**

**ئەگەر ڕاستت ئـەوێ نییومی ئـادەمیی برسیی ، وە بەندەو ژێـردەستە ، تا برسێتیو بەندەیی بمێنێ لە جیهانا ، ئادەمیی ناحەسێتەوە ، ئەو ڕۆژەی ئەم دوو نەخۆشییە نەما لەناوا ، ئنجا ئادەمیی ئەبێ بەجێنشینی خوا لەسەر زەویی •**

**لەم ئایەتەوە دەرئەکەوێ کە ئایینی ئیسلام دوو شتی زۆر مەبەسە یەکەم ئازادییو سەربەستی ئادەمیی بە یەکەیەکەیو بە گەلانییەوە ، دووهەم هەڵگرتنی برسێتیو هەژاریی ، کە ئەمڕۆ خۆشییو خۆشبەختی ئادەمیی لەسەر ئەم دوو شتە**

ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ (١٧) أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ (١٨)

**سەرەڕای ئەمانەش لەوانە بێ کە بڕوایان هێنابێ‌و ئامۆژگاریی یەکتریی‌یان کردبێ بە خۆڕاگرتن‌و میهرەبانیی(١٧) ئەوانە خاوەنی بەختیـارییـن(١٨)**

بەندە ، وە هەرچی جەنگ‌و ئاژاوە هەیە هەمووی لەسەر ئەم دوانەیە •

بەڕاستی ئایینی ئیسلام لەم ڕووەوە زۆر خزمەتی ئادەمیی کردووە ، وە یەکەم ئایینی ئاسمانی‌یە کە بناغەی ئازادیی‌و سەربەستێتی‌و هەڵگرتنی برسێتی‌و هەژاریی داناوە ، ئـەویان بە کردنەوەی دەرگای ئـازادکردنی بەندەو هانەهـانەی مەردوم لەسەری‌و ، ئەمیان بەقەدەغەکردنی سوودو دەستبەسەراگرتن (احتکار) بۆپێ‌بژیوی ئادەمیی وە بەدانانی زەکات‌و کردنی هەژار بەهاوبەشی دەوڵەمەند لە پارەو کووتاڵ‌و دانەوێڵەو ئاژاڵا •

لەپاشا پێویستە لەسەر ئادەمیی لەگەڵ بڕینی ئەو دوو پلەیەدا خاوەنی بڕواو خۆڕاگرتن‌بێ لەبەر باری ڕۆژگارو ئەو ئازارو سزایانەی ، کە تووشی ئەبێ لەڕێی ئامۆژگاریی مەردوما ، وە دڵنەرم‌و یارمەتی‌دەریان بێ لە هەموو تەنگانەیەکا ، وە بە گوفتارو کردار ، خۆی بکات بەسەرمەشقی مەردوم لەخۆڕاگرتن‌و دڵنەرمیی‌دا ، وەکو ئەفەرموێ (ثم كان من الذين آمنوا) سەرەڕای ئەوەش لەوانەبێ کە بڕوایان هێناوە ، چونکە هیچ چاکەو کردەوەیەکی باش بەبێ بڕوا بەخوا بایەخی پێ‌نی‌یە (وتواصوا بالصبر) وە ئامۆژگاریی یەکتریی‌یان کردووە بە خۆڕاگرتن لەبەر باری هەوڵ‌و تەقـەلادان لەم ڕێگایەدا (وتواصوا بالمرحمة)و ئامـۆژگاریی یەکتریی‌یان کردووە بەدڵنەرمیی‌و میهرەبانیی لەگەڵ بەندەگانی خوادا •

ئامۆژگاریی بەخۆڕاگرتن بۆ ئەوەیە کە کۆمەڵە نەڕووخێ‌و لەشکری نەشکێ ، هەروەك ئامـۆژگاریی بە دڵنەرمیی بۆ ئەوەیە کە کۆمەڵە لەناو خۆیانـا خاوەن پەرۆش‌و بەزەیی‌بن •

(اولئك) ئەو خاوەن بڕواو کردەوە باشانە (اصحاب الميمنة) یارانی دەستی

وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا هُمْ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ (١٩) عَلَيْهِمْ نَارٌ مُؤْصَدَةٌ (٢٠)

**وە ئەوانــەی کەبێبڕوابوون بە نیشانەکانی ئێمە ئەوانە خاوەنی بەدبەختین(١٩) دایگرتوون ئاگری دەرگاداخراو(٢٠) .**

**ڕاستن ، واتە خاوەنی بەختیارین (والذین کفروا بآیاتنا).وە ئەوانەی کە بێبڕوا بوون بەو شتانەی کە نیشانەی تاكوتەنهایی خوان ، واتە لێیان ووردنابنەوە ، تا ڕێی ڕاستی پێبدۆزنەوە (هم اصحاب المشامة) ئەوانە یارانی دەستی چەپن ، واتە خاوەنی بەدبەختین (علیهم نار مؤصدة)دایگرتوون ئاگری دەرگا داخراو ، واتە نە دووکەڵی دەرنەچێتو نە هەناسەی تیا وەرنەگیرێ .**

سُورَة الشَمْس

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا(١) وَالْقَمَرِ إِذا تَلاَهَا(٢) والنهَارِ إِذاَ جَلاَّهَا(٣)

## سوورەی ( شمس )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بەخۆرو ڕووناکیی‌یەکەی(١) وە بەمانگ کە دوا بـەدوای ئەو هەڵبێ(٢) وە بەکاتی ڕۆژ کە خۆر دەرئەخات(٣) •

## سوورەی ( شمس )ە

**مەککی‌یە ، ١٥ ئایەتە ، ٤٥ ووتەیە**

بسم الله الرحمن الرحيم

### به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئادەمیی ئەوەتی چاوو گوێی هەڵاتووە ، عاشقی ئەم بوونەوەرە گەورەیەیە ، بەڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەیەوە وە بە ڕووناکیی‌و تاریکی‌یەوە ، زبـانێکی نهێنی هەیە بە سروشت لەناوەندی ئەم بوونەوەرەو دلی ئادەمی‌دا ، هەر قسەیەك بچرپێنێ بە گوێچکەیا خێرا تێ‌ئەگات ، لەبەرئەوە لەم جزمەدا قورئان لەزۆر سوورەتا ڕووی دڵ ئەکاتە چەشمەندازی بوونەوەر ، وەك لێرەدا کە ئەفەرموێ (والشمس) سـوێند بەو ڕۆژەی کە بە ئاسمانەوەیە ، کە گەورەترین شتێکە لەناو کۆمەڵەی ڕۆژیی ئێمەدا وە ملیۆنێك‌و سێ‌سەد هەزارجار لەزەویی گەورەترە (وضحاها)وە بەڕووناکی‌یەکەی لەکاتی چێشتەنگاوا کە جوانترین کاتە (والقمر اذا تلاها) وە بەمانگ لەکاتێکا کە دوا بەدوای ئاوابوونی ڕۆژ هەڵبێ ، وە هەموو شەو ڕووناك ئەکاتەوە ، وەك شەوی سیانزەو چواردەو پانزەبێ (والنهار اذا جلاها) وە بە ڕووناکی ڕۆژ ، لەکاتێکا کە**

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا(٤) وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا(٥)

وە بەشەو کە خۆر دائەپۆشێ(٤) وە بەئاسمان‌و دروست‌کەرەکەی(٥)

قورسی ڕۆژ دەرئەخات ، بەڵام ئەوڕۆژەی کە هەورو ڕۆژ بەدەرەوە نی‌یە ، ئەوە بەر شەو ئەکەوێ کە لەمەولا سوێندی پێ‌ئەخوات ٠

ڕووناکیی گەورەترین بەهرەی خوایە لەجیهانا،ئنجا بۆ ئەوەی کە ئاووڕێکمان پێ‌بداتەوە بەلای سوودی ڕووناکی‌یەوە ـ هات سوێندی پێ‌خوارد بەم سێ‌جۆرە ٠

لەپاش سوێند خواردن بە ڕووناکیی ـ کە کاتی ئیش‌و کاری ئیش‌کەرانە ـ ئنجا سوێند ئەخوات بەتاریکی ـ کە کاتی حەسانەوەی ماندووانە ـ ئەفەرموێ (واللیل اذا یغشاها) وە بەشەو لەدەمێکا کە خۆر دائەپۆشێ ، وە هیچ جۆرە ڕووناکی‌یەکی دەرناکەوێ ، نە هی خۆی،وە نە هی مانگ کە لەوەوە وەری‌ئەگرێ٠

تاریکی کە هات هەرچی ئادەمیی‌و گیانلەبەری تر هەیە ، بەسامی خۆی لە ئیش‌و کاری ئەخات ، وە بە ناچاریی ڕای‌ئەوەستێنێ ٠ تاریکی بەخۆی‌و سام‌و ترسی‌یەوە ، کە هات لەهەموو لایەکەوە مەردوم دائەگرێ ، وە ڕێی دەرچوون‌و هەڵاتنی ناهێڵێ ، وەك گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا وایە ، کە لەگەڵ یەکێکی گرت ئیتر دەرچوونی نی‌یە ، وە نازانێ چۆن چۆنیی گیراوەو دەورە دراوە ـ جگە لەوە کە تاریکی،کاتی نوستن‌و حەسانەوەیە،ئەو گیانلەبەرانەی کە بەڕۆژ ئەچەوسێنەوە، بەو شەو ئەحەسێنەوە ، جا لەبەر ئەمانە خوا سوێندی پێ‌خوارد ٠

لەپاش سوێندخواردن بەڕووناکیی ئنجا سوێند ئەخوات بەسەرچاوەی ئەو ڕووناکی‌یە کە ئاسمانە ، بەڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەیەوە ، ئەفەرموێ (والسماء وما بناها) وە بەئاسمان‌و ئەو کەسەی دروستی کردووە ٠

ئاسمان بەم بۆشایی‌یە گەورەیە ئەڵێن کە لەژوور سەرمانەوەیە ، وە بە هەزلران هەزار ملیون ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرەی تیایە ، وەخوای گەورە هەموویانی بەهێزی کێشندە بەیەکەوە بەستۆتەوە ، بەڕەنگێکی وا کە بەهەزاران هەزارساڵ نەزدیکیی‌و دووری‌یان لەیەکتری‌یەوە نەگۆڕێ ـ وە هەڵاتن‌و ئاوابوونیان بە

وَالأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا(٦) وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا(٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا(٨) قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا(٩)

وە بەزەویی‌و ڕاخەرەکەی(٦) وە بە نەفس(ی ئادەمیی)و ڕێکخەرەکەی(٧) ئنجا بە سروشت ئاگاداری کرد بە بەدکاریی‌و پارێزگاریی خۆی(٨) بەڕاستیی ڕزگاری بوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك کردەوە(٩)

هەناسە پاش‌وپێش نەکەوێ ، وە هەموو ئەستێرەیەك لەم گومەزە گەورەیەدا ، وەك خشتێك وایە لەگومەزێکا کە بە گەچەوە دانرابێ •

لەدوای سوێندخواردن بەتاریکی ئنجا سوێند ئەخوات بە سەرچاوەی ئەو تاریکی‌یە کە زەوی‌یە ، چونکە هەر زەویی خۆیەتی کە هەمیشە نیوەی سێبەر ئەکات لەنیوەکەی تری‌و ئەبێ بەشەو ئەفەرموێ (والارض وماطحاها) وە بە زەویی‌و ڕاخەرەکەی •

لەپاش سوێند خواردن بەمانەی پێشوو ، ئنجا ئەفەرموێ (ونفس وماسواها) سوێند بە نەفسی ئادەمیی‌و ڕێکخەرەکەی ، بەم ڕەنگە هەرچی هێزێکی ئاشکراو نهێنی هەیە تیا داناوە ، وە هەر هێزەی پیشە «وظیفە»یەکی تایبەتی بۆ داناوە کە بیکات ، وە بۆ بەجێ‌هێنانی ئەو پیشانە ، لاشەیەکی بۆ دروست کردووە ، بە چەند ئەندام‌و پەل‌وپۆیەکەوە بۆ بەکارهێنانی ئەو هێزانە ، بەم ڕەنگە هەر ئەندامەی پیشەی هێزێك بەجێ‌دێنێ ، ئنجا ژیریی‌یەکی وای داوەتێ کە ڕێی چاك‌و خراپی خۆی پێ‌جیا بکاتەوە ، وەکو ئەفەرموێ (فالهمها فجورها وتقواها) ئنجا بە سروشت ئاگاداری کردووە بە بەدکاریی‌و پارێزگاریی خۆی ، واتە خوا هێزی جیا کردنەوەی چاك‌وخراپی داوەتێ، هەروەك سەربەخۆیی داوەتێ بۆئەوەی بەئارەزووی خۆی کامیان هەڵئەبژێرێ هەڵی‌بژێرێ ، ئنجا هەرکەسێك ڕێی چاکەی هەڵبژارد ، ڕزگاری ئەبێ ، وە هەرکەسێکیش ڕێی خراپەی هەڵبژارد دووچاری زیان ئەبێ ، وەکو ئەفەرموێ (قد افلح من زکاها) بەڕاستیی ڕزگاری بوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك‌کردەوە لەهەموو جۆرە پیسی‌یەك،وە پەروەردەی کرد بە پەروەردەکردنێکی

وَقَدْ خابَ مَنْ دَسّاهَا(١٠) كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا(١١)

**وە نائومێد مانەوەی کە نەفسی خۆی وونو نابووت کرد(١٠) بڕوای نەهێنا خێڵی ثمود بەهۆی سەرکێشیی خۆیەوە(١١)**

بەرز ، تا گەیاندی بەپلەی هەرەبەرزی خۆی (وقد خاب من دساها) وە نائومێد ما ئەوکەسەی کە نەفسی خۆی وونو نابووتکرد ، بەمڕەنگە لایدا لەڕێی ئادەمێتی ، وە دوای هەوەسو ئارەزوو کەوت بە جۆرێکی وا کە خۆی لەکۆمەڵی ئادەمیی دوور خستەوە ، چ زیانێکی لەم زیانە گەورە تر هەیە ، کە ئادەمیی بەدەستی خۆی خۆی بشواتەوە لە ئادەمێتی •

جوابی سوێندەکە لەم سوورتەمەدا نەووتراوە ، وەك سوورەتی «بروج» بەلام مەردوم ئەتوانێ خۆی بیدۆزێتەوە لەم ئایەتەوە کە ئەفەرموێ (کذبت ثمود بطغواها) وەك لەدوایی سوورەتەکەوە باسی ئەکەین ، واتە خێڵی ثمود بەهۆی یاخیبوونی خۆیەوە پێغەمبەرەکەیانی بەدرۆزن دانا •

ثمود خێڵێکە لەعەرەب خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن ـ کە ناوی صالح بوو ـ ناقە حوشترێکی مێی شیرداری بوو ، گەلەکەی داوای معجزەیەکیان لێکرد ، خواش حوشترەکەی بۆ کردن بە معجزە ، بەم ڕەنگە پێیووتن : خوا ئەفەرموێ واز لەم حوشترە بێنن تا بۆخۆی بلەوەڕێ لە ئەرزی خوادا ، خواردنی لەسەر ئێوە نییەو شیرەکەشی بۆ ئێوەیە ، وە ئەو ، نۆرە ئاوێکی ببێو ئێوەش ڕۆژە ئاوێکتان ببێ ، وە هیچ کامێکتان زیانی پێنەگەیەنێ ، ئەگینا خوا دووچاری سزایەکی سەختتان ئەکات، وەك قورئان لە سوورەی «هود»ا ئەفەرموێ «ویا قوم هذه ناقة الله لکم آیة فذروها تأکل فی أرض الله ولا تمسوها بسوء فیأخذکم عذاب قریب»(١) وەلە سوورەی «شعراء»دا ئەفەرموێ «قال هذه ناقة لها شرب ولکم شرب یوم معلوم ، ولا تمسوها بسوء فیأخذکم

(١) واتە ئەی گەلی خۆم ئەمە حوشتری خوایە نیشانەیە بۆ ئێوە ، وازیلێبێنن با بلەوەڕێ لە زەویی خوادا ، وە زیانی پێمەگەیەنن با سزایەکی نزیك نەتانگرێ •

إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا(١٢) فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ نَاقَةَ اللهِ وَسُقْيَاهَا(١٣) فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا ، فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُمْ بِذَنْبِهِمْ فَسَوَّاهَا(١٤)

**کاتێك کە ڕاست بووەوە خراپترینیان(١٢) ئنجا پێغەمبەری خواپێیووتن : وازبێنن لەم حوشتری خوایەو نۆرەئاوی(١٣) بڕوایان پێنەکردو حوشترەکەیان پەیکرد ، ئنجا پەروەردگاری ئەوان سزای ڕشت بەسەریانا بەهۆی گوناهیانەوەو ، تەختیکردن(١٤)**

**عذاب یـوم عظیم»(٢) کەوابوو معجزەکەی صالح پێغەمبەر ئەمەبووە ئەگـەر ئەوان زیان بەحوشترەکە بگەیەنن خواش ئەوان لەناوبەرێ •**

**پێویست بوو لەسەر خێلی ثمود هەموو بڕوا بێنن بە پێغەمبەرەکەیان ، وە لە قسەی دەرنـەچن ، وە نەیەڵن کەس دەستدرێـژیی بکات بۆ ئەو حوشـترە بەڵام بڕوایان پێنەهێناو بەقسەیان نەکرد ، وەکو ئەفەرموێ (اذ انبعث اشقاها) کاتێك کە خراپترینیان چوو بۆ کوشتنی حوشترەکە (فقال لهم رسول‌الله) ئنجا پێغەمبەری خوا صالح ناو پێیووتن (ناقة الله) وازبێنن لەم حوشترەی کە خوا کردوویەتی بە معجزەو نیشانەی پێغەمبەرەکەی ، وە زیانی پێمەگەیەنن (وسقیاها) وە ئاگاداریی ئاو خواردنـەوەکەی بکەن ، واتە دەستدرێـژیی مەکەن نە بۆ خۆیو نـە بۆ نۆرە ئاوی ، ئەگینا خوا سزاتان بەسەرا ئەڕێژێ (فکذبوه) بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان نەکرد (فعقروها) وحوشترەکەیان کوشت ، بەمڕەنگە بەشیر قاچیان پەیکرد •**

**ئەوکەسەی حوشترەکەی کوشت ئەو تاقە کەسەیان بوو کە خوا ناوی برد بە خراپترینیان ، بەڵام چونکە ئەوانییکەیتر هیـچ جۆرە ئامۆژگارییەکیان نەکردو دەستیان نەگرت ، خوا کردنی بە هاوبەشی گوناهکارەکە ، وە کوشتنەکەی پاڵدایە پاڵ هەموویان ، بۆیە تۆڵەکەشی ڕشت بەسەر هەموو لایەکیاناو فەرمووی (فدمدم علیهم ربهم بذنبهم) ئنجا پەروەردگاری ئەوانیش ڕشتی بەسەریانا سزای سەخت (فسواها)**

(٢) واتە پێغەمبەرەکەیان ووتی : ئەمە حوشترێکە ، ئەو نۆرە ئاوێکی هەیەو ، ئێوەش نۆرە ئاوی ڕۆژێکی تایبەتیتان هەیە ، وە زیانی پێمەگەیەنن تاسزای ڕۆژێکی گەورە ، یەخەگیرتان نەبێ •

وَلاَ يَخَافُ عُقْبَاهَا(١٥)

وە ناترسێ لەپاشەڕۆژی (سزادانیان)(١٥) •

وە یەکسانیکردن (ولا یخاف عقباها) وە خواش ناترسێ لە پاشەڕۆژی ئەم تۆڵە لێسەندنەیان ، چونکە نە ستەمکارە تا بترسێ لەسەرەنجامی ستەم ، وە نە بێدەسەڵاتییشە تا بترسێ لەسبەیڕۆژێ کە زیانێکی پێبگەیەنرێ •

لەم داستانی خێڵی ثمودەوە دەرکەوت وەرامی سوێندەکانی پێشوو ، واتە سوێند بەمانە ئەی بێبڕوایانی مەککە ، ئەگەر ئێوەش بڕوا نەکەن بە پێغەمبەرەکەتان ، لەناوتان ئەبەم وەك خێڵی ثمود ، بەڕاستی خوا هەڕەشەکەی خۆی هێنایە دیی ، وە لە جەنگی «بدر»دا زۆری لە گەورەکانی مەککە بەکوشتدا بەدەستی مسڵمانەکان ، لەپاشا ئەوانییکەیتریش ، چ لە ئەهلی مەککەو ، چ لە دەورووبەری ، ڕۆژبەڕۆژ لەکەمبوونەوەدا بوون ، دەمێ بەکوشتنو دەمێ بەدەربەدەرکردن ، تا عەرەبستان لە ژیانی پێغەمبەرا پاكبووەوە لەبێبڕوا •

سورة الليل

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمْ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى(١) وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى(٢) وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالأُنثَى(٣)

## سوورەی ( لیـل )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بە شەو کاتێك کە (زەویی) دائەپۆشێ(١) وە بەکاتی ڕۆژ کە ڕووناك ئەبێتەوە(٢) وە بەوەی کە نێرومێی دروستکردووە(٣) •

## سوورەی ( لیـل )ە

مەککی‌یە ، ٢١ ئایەتە ، ٧١ ووتەیە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

(واللیـل اذا یغشی) سوێند بە شەو لەکاتێکا کە ڕووی زەویی دائـەپۆشێ بە تاریکی خۆی (والنهار اذا تجلی) وە بە ڕۆژ لەدەمێکا کە ڕووناك ئەبێتەوەو تاریکی شەو لائەبات (وما خلق الذکر والانثی) وە بەو کەسەی کە نێرومێی دروستکردووە، کە خوایە •

بەم ڕەنـگە سوێندی خوارد بەخوا ، بۆ ئەوەی نیشان بدات ، کـە زانایەکی ئاگادارە بەو مادەیەی کە نێرومێی لێ‌دروست ئەکات ، چونکە لە شوێنی خۆی باس کراوە کە هەموو گیانلەبەرێك لە تۆوی نێرومێ دروست ئەبێ ، وە ئەم تۆوەش لە

إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى(٤) فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى(٥)

بەڕاستی کۆششی ئێوە بە گەلێ‌جۆرە(٤) ئنجا ئەوکەسەی ببەخشێ و پارێزگاریی بکات(٥)

خواردەمەنیو ، خواردەمەنیش لە خاك پەیدا ئەبێ ، کەوابوو ئەجزای أصلی لەمادەدا، بۆ بوونی بەنێر یا بەمێ وەك یەکوان ، وە پەیدابوونی بێچوولە لەسکی دایکیا لە چەند مادەیەکی تایبەتی ـ دەمێ بەنێرو دەمێ بەمێ ، نیشانەیە لەسەر ئاگاداریی ئەوکەسەی کە ئەم دەستوورەی داناوە ،واتە لەیەك نێرومێ دەمێ نێر دروستکردنو دەمێ مێ ، یا بەسکێك نێرومێ‌یەك پێکەوە دروستکردن ، بەڕەنگێکیوا کە نیسبەتی نێرومێ بەتێکڕایی ، لە هەموو جیهانا بەرزونزم نەبێتەوە ،وە هەردوکیان هەمییشە بەقەد یەك بن ، گەورەترین نیشانەیە لەسەر ئاگاداریی خوا بەم کردەوەیەی ، ئەگینا چۆن ئەگونجێ شتی وا ڕێکوپێك بە درێژایی سال ڕووبدا بەڕێکەوت ، لە سروشتێکەوە کە هەرچی هۆشو گۆش بێ نی‌یەتی ،لەپاشا نێرومێ هەر بۆ ئادەمییو گیانداری مەمك دارنی‌یە ، بەڵکو بۆ هەموو گیاندارو دارو درەختو گوڵو گیایەکیشە ئنجا گیاندارەکان بەسكو زابێ ، یا بە هێلکەو گەرا بێ ، هەروەك دارو گیاش بە تۆوە ، کی بەم بۆشەك «خلیە»ەکە لەگەڵ گەرادا متوربە ئەبێ لە مناڵدانا ، یا بەم هێلکەو گەرایە ، یا بەم دانەی تۆوەی ووت : تۆ ببە بە نێر ، وە بەوییکەی تری ووت ، تۆ ببە بە مێ ؟ بێجگە لەخوا ، واتە سوێند بەو خوایەی کە ئەمانە ئەکات (ان سعیکم لشتی) کۆششتان بەگەلێ جۆرە ، بەم ڕەنگە هێندێکی چاکو هێندێکی خراپو ، هێندێکی جوانو ، هێندێکی ناشیرینو ، هێندێکی پاکو هێندێکی پیسو ، هێندێکی بەخشینو دەستگرتنو ، هێندێکی چرووکییو دەست قووچانو ، هێندێکی دینداریو ، هێندێکی بێدینیو ، هێندێکی بڕوا بەچاکەو ، هێندێکی بێبڕوایی‌یە بەچاکە ، هەروەك ئەنجامی هێندێکیان قازانجو سەرفرازییو هێندێکیشیان زیانو سەرشۆڕی‌یە ، وەك ئەفەرموێ (فاما من اعطی)ئنجا ئەو کەسەی مالی خۆی بەخت بکات لەڕێی دەستگیرۆیی هەژارانو لێقەوماوانا ، یا لەڕێی قازانجێکی تێکڕاییدا (واتقی) وە خۆی بپارێزێ لەهەموو گوناهێکی ئاشکراو

وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى(٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى(٧)

**وە بڕوای بێ بە چاکە(٦) زوو یارمەتی ئـەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاکەیە)(٧)**

نهێنی ، نەخوازەلا زیانگەیاندن بە مەردوم (وصدق بالحسنی) وە بڕوا بکات بە چاکەو پاکیی ، وە لەخراپەو ناپاکیی ، جیایان بکاتەوە ، وە بـڕوای وابێ ، کە ئادەمیی ئەبێ هەر ڕێی چاکە بگرێ ، وە هەرگیز نابێ توخنی خـراپەو ناپاکیی بکەوێ ، ئەو حەلە شایستەی یارمەتیی خوا ئەبێ کە بەبێ ئەم یارمەتیيە هیچی بۆ ناکرێ •

زۆر کەسی وا هەیـە بەقسە هیچی نەهێشتۆتەوە ، کە لەگـەڵ دێ بەباسـی چاکەدا درێژەی پێئەدات ، وە قازانجی چاکەو زیانی خراپەت بۆ باس ئەکات ، کەچی خۆی بۆ کردنی چاکە زۆر سـست وە بۆ کردنی خراپە ئامادەو لەسەرپێیە ، خۆلاسە : بڕواکردن بەچاکە بایەخی پێ نیيە ، تا نەڕوێ لەدڵو دەروونا ، وە لقو پۆپی لەهەموو ئەندامێکەوە نەیەتە دەرەوە ، بە ڕەنگێکی وا کە هیچ ئەندامێك لە چوارچێوەی ئاییـن دەرنەچێت ، وە هەموو بۆ خوا وە لەژێر چـاودێریی خـوادا هەڵسووڕێن ، دیارە مەردوم کە گەیشتە ئەم پایەیە ئەو حەلە فێری چـاکە کردن ئەبێو خـووی پێوەئەگـرێ وە زۆر بـە ئاسـانیی هەموو جـۆرە چـاکەیەکی لێئەوەشێتەوە ، وەکو ئەفەرموێ : هەرکەسێك وابێ وەکو ووتمـان (فسنیسـره للیسری) ئێمەش زۆر زوو یارمەتیی ئەدەین بۆ ئاسانترین ڕێ ، بەپێی سروشت ، کە ئەویش ڕێی چاکەو بەرزبوونەوەی گیانە •

ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ ئەوە بۆچی ڕێی چاکە ئاسانترە بۆ مەردوم لە ڕێی خراپە ؟ ئەڵێم چونکە ڕێی چاکە هۆی زۆرە ، نابینیت ئادەمیی کە لەگیاندارانی تر جیا ئەبێتەوە ، بە ووردبونەوەو بیرکردنەوەیەتی لەسەرەنجامی کردەوەی خۆی، ئنجا هەر ئادەمییەك کە بزانێ خۆی هەزاران پێویستیو نامانگـووریی هەیە بـە مەردوم کە ئەبێ یارمەتی بدەن ، ئەشزانێ کە مەردومیش پێویستییان هەیە بەم ، کە ئەبێ یارمەتییان بدات ئنجا یەکێك بەسروشت بزانێ کە ئەبێ خزمەتی مەردوم

وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩)

وە ئەو کەســەی رژدیی بکاتوە خۆی بێنیاز بزانێ(٨) وە بڕوای نەبێ بە چاکە(٩)

بکات ، دیارە هەر بەسروشتیش ئەزانێ کە نابێ زیانیان پێبگـەیەنێ ، یا ئیشی ناشیرینی وا بکات کە زیانی ببێ بۆیان ، کەوابوو ئادەمیی هەر بە سروشتی پاك ئەمانە ئەکات ، بەڵام بۆ مانەوەی ئادەمیی لەسەر ئەم سروشتە پـاکە پێویستە بـە ژییری‌یەکی وا کە تەماشای هەموو شتێکی پێبکات ، تا بزانێ چی ئەبێ بکاتو چی ئەبێ نەکات ، ئنجا کە مەردوم گەیشتە ئەم پایە بەرزە ، ئەو حەلە ئەو شتانەی کە بە سروشت بۆی ئەچێ لەچاکە خوا باشتر بۆی ئاسان ئەکات،چونکە باوی خوا لەسەر ئەوەیە هەموو جارێك مەردوم کە کردەوەیەکی باشـ بکات خوا دەرگایـەك لەدڵی بکاتەوە ، وە بییرێکی تازەی بداتێ لەبابەت ئەو کردەوەیەوە ، وە ئەبێ بەسەرەتای عادەتێك بۆی   وە ڕۆژ بە ڕۆژ خووی پێوە ئەگرێ ، وە بە کـردنی کەیف خۆشـ ئەبێ ، بەڵکو هەر ناتوانێ کە نەیکات ، وە مەبەس لەئاسانکردنی خوا ئەمەیە •

(واما من بخل) بەڵام ئەو کەسەی کە ڕژدیی‌و چرووکیی بکات ، بەم ڕەنگە هەر هیچ بەخت نەکات ، یا لەڕێی خراپەو ئارەزووی هیچوپووچا بەختی بکات(١) (واستغنى) وە خۆی بێنیاز بزانێ لەمەردوم بەهۆی ئەو دارایی‌یەی کە هەیەتی ، وە وابزانێ کە پێویستی پێیان نی‌یە ، لەبەر ئەوە بەزەیی بە هەژاریانا نایەتەوە ، وە دڵی بـۆ لێقەوماویان دانەچڵـەکێ ، وە هەر بە تەنها بۆ خـۆی بژیی (وکذب بالحسنى) وە بڕوا نەکات بەچاکە ، وە لەخراپەی جیا نەکاتەوە ، وە بڕوای نەبێ کە چاکە سەرچاوەی ئادەمێتی‌و بناغەی مەردایەتی‌یە   وە هەر خۆشـیی‌و خۆشـ ڕابواردنی خۆی مەبەست بێ ، ئیتر با لەڕێی خۆشیی ئەما ، مەردوم تووشی زیان ببێ ، تـا وای لێدێ ئـەبێ بە جانەوەرێکی دڕندە ، وە چـرای دڵو دەروونـی

(١) چرووك لای زانایانی شەرعو ڕەووشتو خوو،بەکەسێك ئەڵێن کە ماڵی خۆی بەخت نەکات لەڕێی چاکەدا ، یا لەڕێی کەیفو ئارەزووی خۆشـیا بەختی بکات •

فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ(١٠) وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ (١١)
إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ(١٢)

**زوو ڕێی سەختی بۆ ئاسان ئەکەین(١٠) وە دارایی‌یەکەی قازانجی پێناگەیەنێ کاتێك کە سەرەنگرێ بوو(١١) بەڕاستی لەسەر ئێمەیە ڕێنموونی(١٢)**

ئەکووژێتەوە ، وە بە ئێجگاریی خوو ئەگرێ بە خراپەوە ، وە بەبێ‌تــرس‌و بییم ئەیانکات ، وەکو ئەفەرمــوێ هەرکەسێ وابێ (فسنیسره للعســری) ئێمەشــ زوو یارمەتیی ئەدەین بۆ ڕێی سەخت کە ڕێی خراپەیە ، کە ئەم ڕێگایەش لەڕێی چاکە گەلێ گرانترە ، چونکە خراپەکردن نە سروشت داوای ئەکاتو نە مەردوم ٠

یەکێك کە لەناو کۆمەڵەدا ، هەر بۆ خۆیو بۆ ئارەزووی خۆی بژیی وە قازانجی بۆ کەس نەبێ ، دیارە سبەی ڕۆژێ ــ کە دووچاری ڕۆژێکی ڕەش‌بوو ــ کەسیش یارمەتی ئەو نادات ، وە پارەو دارایی‌یەکەی ڕزگاری نــاکات ، وەکــو ئەفەرموێ (وما یغنی عنه ماله) وە پارەو دارایی‌یەکەی قازانجی پێناگەیەنێ (اذا تردی) کاتێك کە سەرەنگرێ ببێ ، بەم ڕەنگە بمرێو ڕوو بکاتە تۆڵەو سزای خوا، یا تووشی ڕۆژێــکی‌ڕەش ببێ لەژیانیا کە ئەو حەڵەش لەبــەر چرووکیو بێ‌کەڵکی خۆی نە کەس دێ بەدەنگی‌یەوەو نە خواش ڕزگاری ئەکات ٠

لێرەدا ئەگونجێ یەکێك بڵێ لەپاش ئەوەی کە خوا ئادەمیی دروست‌کرد ، وە ئەم هەموو هێزوئارەزووەی دایە ، وە بۆبەجێ‌هێنانی هەر ئارەزوویەك ، ئەندامێکی تایبەتیی بۆ دروست‌کرد ، ئیتر هەرچی کەوتە ژێردەستی ، وە ئارەزوو بردی بۆی ، کردنەکەی ئەبێ بەشتێکی ناچاریی بەپێی ئەو سروشتەی کەخوا تیادروست‌کردووە، کەوابوو ، چۆن ئەبێ خوا سزای بدات لەسەر کردەوەیەك کە خۆی دەسەڵاتی کردنی ئەو کردەوەیەی دابێتێ ؟ وە لغاوی بۆ بەرەڵڵاکردبێ ، وە چۆن ئەبێ لەسەر ئەوە لێی‌بڕەنجێ ؟ وە لە ڕۆژی دواییدا تۆڵەی لێ‌بسێنێ ؟ ئنجا لەبەرئەوەی کە ئەم بیرە لە هەموو کاتێکا ئەکرێ ، فەرمووی (ان علینا للهدی) بێ‌گومان لەسەر ئێمەیە باسی ڕێی چاك‌وخراپ ، واتە ئێمە ئادەمیی‌مان دروست‌کردووە کە چاکەو خراپە لەیەك

وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَى (١٣) فَأَنذَرْتُكُمْ نَاراً تَلَظَّى (١٤)
لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى : (١٥) الَّذِي كَذَّبَ وَتَوَلَّى (١٦)

وە هەردوو جیهان هی ئێمەیە(١٣) من ئێوەم ترساند بە ئاگرێکی بڵێسەدار (کە دۆزەخە)(١٤) کەس ناچێتە ناوی‌یەوە مەگەر بەدبەختترینی مەردوم(١٥) : ئەو کەسەی کە بڕوای نەبێ‌و پشتی هەڵکردبێ(١٦)

جیابکاتەوە، لەپاشا ئنجا لەپیاوانی پاكوتەمیزی هەڵکەوتووی خۆیان، بەهەڵبژاردە پێغەمبەرانمان بۆ ناردوون بە دەستوورو ئایینەوە ، وە هەرچی ڕێی چاکەو خراپە هەیە بۆم باس‌کردوون ، لەپاش ئەمانە ئیتر ئادەمیی خۆی سەربەخۆیە ، یا ڕێی چاکە ئەگرێ ، ئەوحەلە تووشی پاداش‌و چاکە ئەبێ ، یا ڕێی خراپە ئەگرێ ، ئەوحەلە تووشی تۆڵەو سزا ئەبێ ، واتە کاتێك کە ویستمان ئادەمیی دروست بکەین ئەبوو وامان دروست بکردایە ، تالەهەموو گیان‌لەبەرێکی‌تر جیاببێتەوە ، بەژیریی‌و بیرو دەسەلات‌و سەربەخۆیی خۆی (وان لنا للاخرة والاولی) وە ژیانی هەردووجیهان هی ئێمەیە ، وە ئێمە خاوەنی هەردولاین ، کەوابوو نابێ ئادەمیی لە فەرمانمان دەرچێ ، وە هەرچی بەسروشت ئەیخەینە دڵیەوە لە چاکە ، یا بە ئامۆژگاریی لەسەر زمانی پێغەمبەران ، پێی‌ئەڵێن نابێ لێی‌لادات ، جا لەبەر میهرەبانی‌مان لەگەڵتانا(١) ، وە لەبەر خاوەنداریی‌مان بۆتان(٢) ، ڕێ نموونییمان‌کردن ، وەکو ئەفەرموێ (فانذرتکم نارا تلظی) ئنجا ترساندمانن بە ئاگرێك کە بڵێسە ئەسێنێ ، کە ئاگری دۆزەخە ٠

مسڵمان ئەبێ بڕوای ببێ کە لە ڕۆژی دوایی‌دا ، ئاگرێکی دۆزەخ هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە باسمان بۆ ئەکات ئەفەرموێ ( لا یصلاها ) ناچێتە ناوی‌یەوە بە ئێجگاریی ( الا الاشقی الذی کذب ) مەگەر خراپترین‌و بەدبەختترین کەسێکی وا ئەبێ ، کە بڕوای نەکردبێ بە ڕێی ڕاست (وتولی) وە پشتی هەڵکردبێ بەڕەنگێکی وا کە پەشیمان بوونەوەی نەبێ

(١) کە لە ئایەتی «ان علینا للهدی»وە دەرکەوت ٠
(٢) کە لە ئایەتی (وان لنا للاخرة والاولی)وە دەرکەوت ٠

وَسَيُجَنَّبُهَا الْأَتْقَى (١٧) : أَلَّذِي يُؤْتِي مَالَهُ يَتَزَكَّى (١٨) وَمَا
لِأَحَدٍ عِندَهُ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَى (١٩) إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِ
الْأَعْلَى (٢٠) وَلَسَوْفَ يَرْضَى (٢١)

وە نێی دوورئەخرێتەوە پارێزگارترینکەس :(١٧) ئەوی کە ماڵی خۆی ئەبەخشێ تا پاکببێتەوە(١٨) لەکاتێکا کە کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نییە کە پاداش بدرێتەوە(١٩) مەگەر هەر بۆ ڕەزای پەروەردگاری هەرە بەرزی خۆی(٢٠) وە (ئەو کەسە) لەمەولا خۆشنوود ئەبێ(٢١) ٠

(وسیجنبها الاتقی) وە دوورئەخرێتەوە لەو ئاگرە بە ئێجگاریی ، ئەوکەسەی کە زۆر پارێزگاریی ئەکات لە هەموو جۆرە گوناهو بێبڕواییەك ٠ ئنجا باسی هێندێك لە ڕەووشتو خووە جوانەکانی ئەو پارێزگارانە ئەکات ، ئەفەرموێ (الذی یؤتی ماله یتزکی) ئەوەی کە ماڵی خۆی بەخت ئەکات لەڕێی خوادا بۆ ئەوەی کە گیانی خۆی بێپاك بکاتەوە لە ڕژدییو پیسی ، وە بە پلەی ئادەمیێتیدا ، سەرکەوێ ، بەڕەنگێکی وا کە هەر خێرێكو دەستگیرۆییەکی کرد ، هەر بۆ خوای بکات ، بێئەوەی کە پیاوەتیی یەکێکی بەسەرەوە بێو بیەوێ بەو خێرە پاداشی چاکەی بداتەوە ، وەکو ئەفەرموێ (وما لاحد عنده من نعمة تجزی) بە لاشییەوە نییە چاکەو پیاوەتیی هیچ کەسێك ، کە ئەوانە بێ پاداشی بدرێتەوە ، واتە دارایی بەخت کرد نەکەی لەبەر هیچ شتێك نەبێ (الا ابتغاء وجه ربه الاعلی) مەگەر هەر بۆ ڕەزای خوای گەورەو بەرزی خۆی نەبێ (ولسوف یرضی) وە ئەو کەسە لەمەولا ڕازیی ئەبێ بە پاداشی دوا ڕۆژی لەلایەن خواوە ٠

# سوورەی ( ضحى )یە

مەککی‌یە ، ١١ ئایەتە ، ٤٠ ووتەیە

## بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

وەك لەشوێنی خۆی باس کراوە ، پێغەمبەر «دروودی خوای لێ‌بێ» یەکەم‌جار کە سرووشی بۆ هات لەئەشکەوتی «حراء» ، زۆر ترسا ، وە بەدەم لەرزەوە هاتەوە ماڵەوەو دایان پۆشیی ، وە ماوەیەك مایەوە لەناوەندی نوستن‌و بێـداریی‌دا ، تـا داچڵەکیی بەدەم سرووشێکی دووهەمەوە ، وە سامێکی زۆر قورس‌و گرانی لێ‌نیشت، وەك هەموو کەسێك کە ئیشێکی زۆر گەورەی پێ‌بسپێررێ‌و بترسێ لەوەی کە لە ژێری دەرنەچێ ، ئنجا بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر بحەسێتەوە ، وە ئەو ترس‌و سامەی لەسەر دەرچێ ، وە خۆی بە ئارەزووەوە چاوەڕوانیی سرووشێکی تر بکات ، ماوەی دوو ساڵ سرووشی بۆ نەهات ، پێغەمبەر بەرەبەرە ئەو سام‌و ترسەی پێشووی لەسەر لاچوو ، وە خۆشیی پێغەمبەریەتیی‌و سرووشی ، هاتەوە یاد ، ئیتر هەر چاوەچاوی هاتنەوەی سرووشی ئەکرد وە بەڕۆژ ئەچووەوە بۆ ئەشکەوتی«حراء»چاوی ئەبڕی‌یە ئاسمان ، تا لەدوایی‌دا هیوای بڕا ، وە وای زانیی کە خوا دەستی لێ‌هەڵگرتووە ، وە بە جۆرێکی وا خەمبار بوو ، زۆر جار ئەهاتە سەر ئەوەی کە خـۆی بەر بداتە خوارەوە ، لەسەر لوتکەی شاخەکانی مەککە ، لەپاشا خوا ویستی ئەو چاوەڕوانی‌یەی لابەرێ ، وە سرووشـێکی بـۆ بنێرێ ، وە لـەو سرووشەدا دڵنیای بکات کـە خوا دەست‌بەرداری نەبووە ، وە لەسەر ئەوە سوێندی بۆ بخوات ، وە لەسوێندەکەدا ، نیشانی بدات کە سەرەتای ئەو سرووشەی بۆی هاتووە وەك کاتی چێشتەنگاو وایە کە مایەی ژیان‌و باڵاکردنی هەموو گیاندارو شینـایی‌یەکە ، وە ئـەو ماوەیەی کە سرووشی بۆ نەهاتووە ـچونکە مایەی حەسانەوەو لاچوونی ترس‌و بیمی پێغەمبەرەـ وەك شەو وایە کە بزرنگێتەوە ، کە مایەی نوستن‌و حەسانەوەی هەموو ماندوویەکە،

سُورَةَ الضُّحَىٰ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمْ

وَالضُّحَىٰ (١) وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ (٢) مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ (٣) وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الْأُولَىٰ (٤) وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ (٥)

---

# سوورەی ( ضحى )یە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند بە چێشتەنگاو(١) وە بەشەو کاتێك کە بزرنگێتەوە(٢) پەروەردگارت دەستی لێهەڵنەگرتوویت‌و لێت دڵگیر نەبووە(٣) وە دوایيت باشتر ئەبێ لەپێشوو(٤) وە لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ‌ئەبەخشێ کە خۆشنوود ببییت(٥)**

---

**لەگەڵ ئەمیشە کە مزگێنیی بداتێ بەتەواوکردنی ئایینەکەی ، وەبەپایان گەیاندنی لەپاشە ڕۆژا ، فەرمووی (والضحى) سوێند بە چێشتەنگاو کە جوانترین کاتە ، وە دەمێ ئیش‌و کارو جووڵانەوەو ژیانێکی تێکڕاییە بۆ هەموو ئادەمیی‌و گیانلەبەرو شینایی‌یەك (والليل اذا سجى) وە بە شەو کە بزرنگێتەوە ، کە کاتی حەسانەوەی هەموو ماندویەکە (ماودعك ربك) پەروەردگارت دەستی لێهەڵنەگرتوویت (وما قلى) وە لێت دڵگیر نەبووە (وللاخرة خير لك من الاولى) وە دوایيت گەلێ باشتر ئەبێت لەپێشووت ، چونکە بەچاوی خۆت ئەبینییت کە دینەکەت بەپایان ئەگات ، وە پەرە ئەسێنێ‌و ڕیشە دائەکوتێ (ولسوف يعطيك ربك) وەلەمەولا پەروەردگارت ئەمەندەت پێ‌ئەبەخشێ لەهاتنی سرووش‌و ڕەوانە کردنی دەستوورێکی وەك قورئان‌و دانانی ئایینێکی پاکی وەك ئیسلام (فترضى) کە بەتەواویی ڕازیی ببییت ٠**

**ئەمە خەبەرێکە لەغەیبەوە کە خوا لەبەرە بەیانی ئیسلامەتی‌دا داوێتی بە پێغەمبەر کە تۆ ئەمێنیت تا ئایینەکەت‌و شریعەتەکەت بەپایان ئەگات ، وە هەموو**

أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِماً فَآوَى ؟(٦)

**ئایا تۆی نەدیی بە هەتیوو حەوانی‌تی‌یەوە؟(٦)**

قورئانت بە سرووش بۆ دێت • ئەگینا پێغەمبەر چۆنی زانی کـە ئەمێنێ تا ئـەم ئایینە بە پایان ئەگات ، لەکاتێکا کە لە خدیجەی خێزانیو زیدی کـوڕی حارثەو ابوبکری صدیق زیاتر کەسی تر مسلمان نەبووبوو .

بەڕاستی وابوو وەك خوا لەم بەرەبەیانی ئیسلامەتی‌یەدا مزگێنی پێداوە ، لەماوەی بیست‌وسێ ساڵا درگە «جزيرة»ی عەرەبستان پاككرایەوە لەبێبڕوا ، وە دینێكو ، گەلێـكو ، دەوڵەتێك ، پێكهـات ، خۆ ئەگەر تەماشـای دوای پێغەمبەر بكەین ، ئەبیینین کە لە ماوەی سەدساڵا ئایینی ئیسلام لە ڕۆژئاواوە گەیشتە سنووری «فەرەنسە»و دەریـای «ئەتڵەسیی» لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە «چیـن»و «بخارا» ، لە خوارو «جنـوب»ەوە گەیشتە «هیندستان»و دەریای هیندیی ، لەسـەرو «شمال»ەوە گەیشتە «قازان»و سنووری مۆسكۆ •

بەڕاستی ئەمە گەورەترین خەبەرێکی غەیبی‌یە کە خوا داوێتی ، وە شایستەی لێوردبوونەوەیە ، بەڵكـو شایستەی ئەوەیە کە سەری بۆدابنـەوێنرێ ، وە هەموو کەسێك دانی پیابنێو ئیعترافی پێبكات •

⊙ ⊙ ⊙

ئنجا بیری پێغەمبەری ئەخاتەوە کە لەپێش پێغەمبەریەتی‌دا ، خوا ئاگاداریی‌و چاودێریی کردوویت ، ئێستا ــ کە پێغەمبەرێکی هەڵبژاردەی ئەوییت ــ چۆن دەست بەردارت ئەبێ ، ئەفەرموێ (الم يجدك يتيما فآوى) ئایا خوا تۆی نەدیی بەهەتیوێکی بێباوكو حەوانی‌تی‌یەوە ، واتە تۆ لەسکی دایکتابوویت کە باوکت مرد ، وە دڵی «عبدالمطلب»ی باپیرتی بۆ نەرم کردییت کە بەخێوت بكات ، تا بوویت بە هەشت ساڵانە ، ئنجـا باپیریشت مرد ، وە دڵی «ابوطالب»ی مامتی بۆ نـەرم کردییت کە بتباتە لای خۆی تا گەورە بوویت •

پێغەمبەر «دروودی خوای لێبێ» هەر لە منالی‌یەوە بە سروشت خوا پەرست

وَ وَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى ؟(٧)

وە تۆی نەدیی بەسەرگەردانو ڕێنموونیی کردییت ؟(٧) •

بووە ، ڕۆژێك نەبووە سەر بۆ بتێك دابنەوێنێ ، یا هاودەمێك بۆ خوا پەیدا بکات ، ڕەووشتو خووی تایبێتیت جوانو بەرز بووە ، جارێك نەبووە گوفتار یا کردارێکی خراپی کردبێ ، خوای گەورە هەمیشە بەتایبەتی ئاگاداریی کردووە ، وە شتی خراپی لێدوورخستۆتەوە ، بۆئەوەی کە بەپاکیی بێتەپێشەوە ، وە هەر لەمناڵییەوە بچێتە دڵی مەردومەوە ، تا لەپاشەڕۆژا بڕوای پێبێنن ، بەڕاستی وابوو هەر لە گەنجیدا ، ناوی دەرکرد بە «محمد أمین» •

ئەم پێغەمبەرە هەر لە گەنجییەوە ئەیزانیی کە بتپەرستیی گەلەکەی شتێکی بێکەڵكو هیچ‌وپووچە ، ئاینی گاورو جوولەکەش هەرچەند هەبوون ، وە هەردووکیان نامەی ئاسمانییان بوو ، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ئەوانیش تێكچووبوون ، وە شتی پڕوپووچیان تێکەڵ بووبوو ، پێغەمبەر لە هەڵبژاردنی یەکێکیان بۆخۆیو گەلەکەی ، سەری سووڕمابوو ، نەخوازەلا کە نەخوێندەواریش بوو ، وە نەیئەزانی چی لە نامەکانیانا هەیە ، ئنجا هەرچەند گەلەکەی خۆی ئەدیی بە بێ‌ئایینو بێڕەوشت‌وخوو ، وە هەردەمەی یەکێك بەسەریانا ئەهاتو داگیری ئەکردن ، دەمێ «حەبەشە»و دەمێ «فارس»و دەمێ «ڕۆمان» ، هەرچەند ئەمانەی ئەدیی ئارەزووی ئەکرد ، کە خوا ڕێگایەکی خۆشیو خۆشبەختیی بکاتەوە لە گەلەکەی ، ئنجا بۆ ڕزگاربوونی لەم سەرسامییە ، هەمووجارێك بەتەنیا ئەچووە ئەشکەوتی «حراء» بۆ خوا پەرستیو بیرکردنەوە لە خاوەنی ئاسمانو زەویی ، وە لە هەموو کونوقوژبنی دڵییەوە چاوەڕوانیی ڕووناکییەکی خوای ئەکرد ، تا خوا بە چرای پێغەمبەرێتی ، دڵی پیرۆزی ڕووناك کردەوە ، وە کردی بە چرایەکیوا کە هەموو جیهانی پێ‌ڕووناك بووەوە ، وەکو ئەفەرموێ (ووجدك ضالا فهدی) ئایا تۆی نەدیی بەسەرگەردان لە دۆزینەوەی ڕێی ڕاست ، تا خوا ڕێی نیشانداییت بۆ ڕزگارکردنی خۆتو گەلەکەتو هەموو کۆمەڵی ئادەمیی •

وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى ؟(٨) فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلاَ تَقْهَرْ(٩)

**وە تۆی نەدیی بە هەژارو ، دەوڵەمەندی کردییت ؟(٨) کەواتە (تۆش) لەهەتیو تووڕەمەبە(٩) •**

(ووجدك عائلا فاغنى) وە ئایا تۆی نەدیی بە هەژارو ، دەوڵەمەندی کردییت بەو کڕینو فرۆتنەی کە لەپێش پێغەمبەریەتییدا ، ئەتکرد بە پارەو دارایی خەدییجە خاتوونی خێزانت ؟ واتە خوایەك کە لە هەتییوییدا بتحەوێنێتەوەو ، لەسەرگەردانییدا ، ڕێنموونییت بکاتو ، لە هەژارییدا ، دەوڵەمەندت بکات ، ئەمەولاش دەستبەردارت نابێ تا نەتگەیەنێ بە پلەی هەرەبەرزی پێغەمبەریەتیی ، وە تا قورئانەکەتو ئایینەکەت نەگەیەنێ بەپایان •

⊙ ⊙ ⊙

کەسێك تاڵاوی هەتیویی چەشتبێ ، ئەبێ بەزەیی بێتەوە بەهەتیوانا ، جا لەبەرئەوەی کە پێغەمبەر هەتیویی بەخۆیەوە دییوەو ، خوا چاودێریی کردووەو ، حەوانوویەتییەوە ، پێویستە لە سوپاسی ئەم میهرەبانییەدا ئەمیش بەزەییبێتەوە بە هەتیوانا ، لەبەرئەوە ، خوا فەرمانی پێداو فەرمویّ (فاما اليتيم فلا تقهر) ئنجا کە وابوو تۆش دڵی هەتیو مەشکێنەو زەبوونی مەکە ، وە هەمیشە ئامۆژگارییو دەست گیرۆیی بکە ، وە هەوڵ بدە بۆ پێگەیاندنی ، بەڕەنگێکی وا کە ببێ بە ئەندامێکی بەکەڵك بۆ کۆمەڵە . ئەو هەتیوانەی کە بەرەڵڵای کۆڵانان ئەکرێن ، سەرسەریی ئەبن ، وە ئەبن بە ئەندامێکی خراپو زەهراویی ، بۆ منالانی کۆمەڵە ، یەکێك لەمە تێبگات ئنجا ئەزانێ کە بۆچی قورئان لە ٢٣ شوێن ناوی هەتییو ئەبات ، وە لە هەر شوێنەی بەڕەنگێك فەرمان ئەدات بە خزمەتکردنو پێگەیاندنیان •

ئەگەر هەموو دەوڵەمەندێك لێکیبدایەتەوە کە مردن لە ڕەگی بناگوێ نزییکترە ، وە هەموو کەسێك گیای مردنە ، وە ئاخۆ چەرۆژێك کوتوپڕ ئەمیش بمرێو بەلادابێ ، وە منالە نازدارەکانی بەبێ باووك بمێننەوە ، سا یا بە دەوڵەمەندیی، ئەوحەلە چاودێر «وصی»و زۆردارماڵەکەیان بخۆن، وەیا بەهەژاریی،

وَأَمَّا السَّائِلَ فَلاَ تَنْهَرْ(١٠) وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ(١١)

**وە هەڵمەشاخێ لە پرسیارکەر(١٠) وە بەهرەی پەروەردگارت دەربخە (بەیارمەتیی هەژاران)(١١) •**

ئنجا نامەرد بیانچەوسێنێتەوە ، ئەگەر دەوڵەمەندەکان باش ئەمەیان بزانیایە ، بیرێکیان لە هەتیوی ناو کۆڵانەکان ئەکردەوە ، وە چارەیەکیان بۆئەدۆزیینەوە •

پێغەمبەر چونکە خۆی لە دۆزینەوەی ئایینێکی پاکوتەمیزا ، تا ماوەیەکی زۆر بەسەر گەردانیی مایەوە تا لەپاشا خوا ڕزگاریکرد لەو سەرسامی‌یە ، وە بە ناردنە خوارەوەی قورئان ڕێگای ڕاستی بۆ ڕووناك کردەوە ، کەواتە پێویستە لەسەری ، لە سوپاسی ئەم چاکەیەدا کە خوا لەگەڵیا کردووە ، خۆشیی ، زۆر بەزەیی بێتەوە بەو کەسانەی کە پرسیاریان هەیە ، وە لە دۆزینەوەی ڕێی ڕاستا ، سەرگەردان ماوون ، بۆیە خوا پێی فەرموو (واما السائل فلاتنهر) تووڕە مەبە لە کەسێك کە پرسیارێکت لێبکات ، با ئەوکەسە زۆر نادانیش‌بێ‌و نەزانێ بدوێ ، بەڵکو وەك مامۆستایەکی میهرەبانی دڵنەرم ، وەرامی بدەرەوە ، چونکە خۆت داخی سەرگەردانییت چەشتووە •

پیسکەی چرووك هەمیشە ئەکورێژێتەوە ، وە بە سکاڵای هەژاریی‌و نەبوونیی ، دەوڵەت‌و دارایی‌یەکەی خۆی ئەشارێتەوە ، بۆ ئەوەی کەس داوای هیچی لێنەکات ، بەڵام پیاوی ئازاو دەستکراوە ، هەموو حەلێك بەپیاوەتی کردن‌و دەستی هەژارگرتن ، دەوڵەت‌و دارایی خۆی بەزیادەوە دەرئەخات ، جالەبەر ئەوە دەرخستنی دارایی‌و سامانی گێڕا بەبڕیتی «کنایە» لە خزمەتی هەژاران‌و دەستگرتنی لێقەوماوان ، فەرمووی (واما بنعمة ربك فحدث) باسی بەهرەی پەروەردگارت بکە ، واتە چونکە خۆت تاڵاوی نەبوونیی‌و هەژارییت چەشتووە ، هەمیشە دارایی‌و سامانت دەربخە ، بە شاباشی هەژاران ، بەڕاستی وابوو وەکو قورئان فەرمانی پێ‌ئەدا ، وە پێغەمبەر هەمیشە دارایی خۆی دابەش ئەکرد بەسەر هەژارانا ، وە خۆشی بەبێ‌شێو سەری ئەنایەوە •

سُورَةُ الإنشرَاح

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمْ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ؟(١) وَوَضَعْنَا عَنْكَ

سوورەی ( انشراح )ە

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئایا سنگمان بۆ گوشاد نەکردییت ؟(١) وە لێمان داگرتییت**

## سوورەی ( انشراح )ە

**مەککی‌یە ، ٨ ئایەتە ، ٢٩ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**وەك لە سوورەی پێشوودا باس‌کرا پێغەمبەر لەپێشەوە زۆر خەفەتبار بوو ، بۆ بێ‌ئایینی گەلەکەی ، تا خوا بە چرای پێغەمبەریەتی دڵی پیرۆزی رووناك‌کردەوە ، وە بەو چرایەوە ، پێشیان‌کەوت تا بردنی بۆ سەرچاوەی برواو خواشناسیی ، ئنجا لەم رێگایەدا هەرچەند گرێ‌یەکی هاتبێتە پێش ، خوا بۆی کردۆتەوە ، وە هەرچەند رێگای لێ‌تێك‌چووبێ خوا رێ‌نموونیی کردووە ، وەکو ئەفەرموێ (الم نشرح لك صدرك) ئایا دڵمان بۆ گوشاد نەکردییت بە لابردنی ئەو خەمو خەفەتەی کەئەتخوارد بەدەست بێ‌ئایینی گەلەکەتەوە ؟ بەم رەنگە کردمانییت بە پێغەمبەرو رێ‌ی‌ڕاستمان نیشاندایت ، واتە بەڵێ دڵمان رووناك‌کردییتەوە ، وە رێ نموونییمان کردییت ، وە بەم رەنگە باری شانمان سووك‌کردییت ، وەکو ئەفەرموێ (ووضعنا عنك) وە**

وِزْرَكَ(٢) الَّذِى أَنْقَضَ ظَهْرَكَ(٣) وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ(٤)

ئەو بارەگرانەی(٢) کە پشتی قورس کردبوویت؟(٣)وە ناومان بۆ بەرزکردییتەوە؟(٤)

هەڵمانگرت لەسەرت (وزرك الذى) ئەو بارە گرانەی (انقض ظهرك) کە پشتی قورس کردبوویت •

بەڵێ خوا یارمەتیی پێغەمبەری‌دا بۆ ڕزگارکردنی گەلی عەرەب‌و زۆر گەلی‌تر، لە بێبڕوایی‌و پڕوپووچ‌پەرستی،وە سەربەستیی‌و سەربەخۆیی‌و ژیریی‌و بیری دانێ ، وە بە سەدەها ملیۆن ئادەمیی کرد بە برای یەك ، وە جیاوازیی هەڵگرت لەناویانا ، وە بەم ڕەنگە گەورەترین خزمەتی کرد بە کۆمەڵی ئادەمیی ، یەکێك ئەمە خزمەتی بێ ، وە پلەو پایەی بێ ، ئیتر چ پایەیەك لەم پایەیە بەرزتر ، وە چ ناوێك لەم ناوە گەورەتر ئەبێ ؟!! نەخوازەلا کە خوا پێویستیشی کردووە ، لەسەر ئەوانەی کە پێغەمبەرێتی پێغەمبەریان پێ‌گەیشتووە ، بڕوا پێ‌هێنانی‌و شەهادەت دان لەسەر ڕەوانە کردنی لەلایەن خواوە ، وە ئەم شەهادەتەی کردووە ، بەمایەی چوونە بەهەشت ، وەك ئەفەرموێ (ورفعنا لك ذكرك) وە ناومان بڵند کردییتەوە ، واتە هەروەك دڵمان فراوان کردییت‌و باری شانمان سووك کردییت ، ناوییشمان بەرز کردییتەوە •

چ ناوێك لەم ناوە گەورەتر هەیە ؟ : شەووڕۆژی پێنج جار لەسەر هەرچی منارەو مزگەوتانی جیهان هەیە بانگ بدرێ ، وە ناوی پێغەمبەر لەگەڵ ناوی خوادا ببرێ ، وە بەسەدها ملیون پێنج فەرزە لەنوێژا سڵاواتی لێ‌بدەن ، وە شەهادەت لە سەر پێغەمبەریەتی بدەن •

⊙ ⊙ ⊙

ئەم دڵخۆش‌کردنی پێغەمبەرە لەدوای دڵتەنگیی‌و ، باری شان سووك‌کردنەی لەپاش قورسیی‌و گرانیی‌و ، ناو بەرزکردنەوەی لەدوای بێ‌ناویی،بەپێی دەستوورو باوێکە کە خوا دای‌ناوە لەجیهانا بۆ ئەم پیاوە گەورانە ، کە ئەو دەستوورەش ئەمەیە

فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا(٥)

بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا ئاسانییە(٥)

کە ئەفەرموێ (فان مع العسر یسرا) بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکا خۆشییو ئاسانییە •

ئەمە باوی خوایە لەجیهانا هەر حاڵێك تەنگانەیەکی هەژاریی ، یا زەبوونیی، یا نادانیی ، یا هەر شتێکی تر ، ڕووبدا لەیەکێك یا لەگەلێك ، نەخوازەڵا کە دوژمنەکەشی بەهێزو دەستدار بێ ، وە ئەو کەسە یا ئەو گەلە ، بەڕاستی ویستی لەو تەنگانەیە خۆی ڕزگار بکات ، وە دەستی دایە بییرکردنەوەو ئیشکردنو هەوڵدانو کۆڵنەدان ، وە لەگەڵ ئەمانەشا پشتیان بەست بەخوا بۆ ئەوەی ئەگەر قۆرتو گرێیەکیان هاتە پێش ، سارد نەبنەوە ، بێگومان ڕزگاریان ئەبێ لەو تەنگانەیە ، وە بە سەربەرزیی ، لێی ئەچنە دەرەوە •

پێغەمبەر «دروودی خوای لێبێ» بەم ڕەنگە بوو ، لەپێشەوە زۆر دڵتەنگ بوو ، بۆ نادانییو بێئایینی گەلەکەی ، لەپاشا کە کەوتە بییرکردنەوە لە ڕزگارکردنیان ، خوا ڕێگای نیشاندا ، وە لەژوور ئاواتی خۆیەوە پێیدا ، کە ئەوەش پێغەمبەرێتی بوو ، لەپاشا ئنجا ئازارو سزاو دەردی سەریی گەلەکەی ساردی نەکردەوە لەبییروباوەڕەکەی ، وە هەمیشە لەهەوڵو تەقەلادا بوو ، وە بۆ دوای خۆشی ، بنیاتێکی وا بەهێزی بۆ مسڵمانەکان بەجێهێشت ، تا چەن سەدساڵێك بەسەر بەرزییەکی بێوێنەو مانەند ، پێی ژیان لەجیهانا ، ئەگەر ئوممەتەکەی وەك جاران زاناو داناو بەهۆشو گۆش بوونایە ، وە لەسەر ڕێی ئەو بڕۆیشتنایە ، ئەو میراتو کەلەپوورەیان لەدەست نەئەدا ، بەڵکو لێیان زیاد ئەکرد ، بەڵام ـ داخەکەم ـ پەیڕەویی ئەویان نەکرد ، تا خوا ، لەوانی سەندەوەو دای بە دوژمنەکانیان ، هەر وەك ناوەجاخێك کە ڕێزی خانەوادەی خۆی نەزانێ ، وە لە دوای مردنی باوکی لەماوەیەکی کەما هەرچییەکی بۆ بەجێهێشتبێ لەدەستی بدات ،

إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْراً(٦) فَإِذَا فَرَغْتَ فَانْصَبْ(٧)

(دووبارە) لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا ئاسانی‌یە(٦) ئنجا کە لەکارێك بوویتە،خۆت ماندوو بکە(بەکارێکی تر)(٧)

لەپاشا دەستەوسان دانیشێ‌و دەست بکات بەسواڵ یا بە خزمەتکاریی ئەو کەسانەی کە وەختی خۆی ، خزمەتکاری باوکی بوون •

لەم ئایەتەدا گەورەترین پەندو ئامۆژگاریی هەیە بۆ مسـلمانان ، چونکە لەهەر کاتێکـا با بدەنـەوە بەلای قورئـانا ، وە بـەپێی دەسـتوورە بەرزەکـانی بجووڵێنەوە ، خوا لەدوای ئەم هەموو تەنگانەیە ، ڕزگاریان ئەکات ، وە خۆشیی‌و ئاسانی‌یان بەسەرا ئەڕێژێ •

لەبەرئەوەی کە ئەگونجێ باوەڕ بەم دەستوورە نەکەن ، ئەوانەی کە لەبـەر نەزانیی‌و ترسنۆکیی‌و ڕاڕایی خۆیان هەمیشە لەتەنگانەو ناخۆشیی‌دان،وە هەرگیز ڕزگاریان نابێ لێی ، لەبەرئەوە دووبارە دەستوورەکەی پێشووی ووتەوە لەگەڵ پیتی (ان)دا کە بۆ بەهێزکردنەوەیە ، فەرمووی : (ان مع العسر يسرا) بەڕاستیی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکا خۆشیی‌و ئاسانی‌یە ، واتە ئەم دەستوورە ڕاستە ، بەڵام بەو مەرجە ئەو کەسە ، یا ئەو گەلەی کە لەناخۆشیی‌یەکەدایە ، هەوڵ بدات بۆ خۆ ڕزگارکردن ، وە بەپێی دەستوورو باوی ئەو کارە ڕێگای بۆ بدۆزێتەوە و کۆڵ نەدات ، بەڵام ئەوانەی کە هەرچی هەوڵ‌و تەقەلابێ ، نی‌یانە ، وە ئەیانەوێ هەر لە خۆیانەوە ڕزگاریان ببێ‌و بگەن بەئاوات ، ئەوە خەیـاڵی خاوە ئەیکەن ، چونکـە دەستووری خوا بەو ڕەنگە نی‌یە کە ئەوان لەسەرین •

⊙ ⊙ ⊙

لەدوای ئەوەی کە زانییت لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکا خۆشیی‌و ئاسانی‌یە ، ئنجا بزانە کە لەدوای هەموو ڕەنجێکیش گەنجێـك وە لەدوای هەمـوو هەوڵێـك حەسانەوەیەك هەیە ، کەوابوو:(فاذا فرغت) هەر حاڵێك لێ‌بوویتەوە لەئیش‌وکارێك کە مایەی قازانجی خۆت‌و مسلمانان بێ (فانصب) خۆت ماندوو بکە بە خەریك‌بوون بەکارێکی ترەوە ، چونکە لەدوای هەموو هەوڵ‌و تەقەلایەك بەرێکی خۆش‌و شیرین

وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَبْ(٨)

**وە هەر لەپەروەردگارت بخوازە (بەری هەموو کردەوەیەکت)** (٨)

**ئەچنییت ، وە ماندویّتییت ئەحەسێتەوە ، (والی ربــك فارغب) وە هەر لەخـوا بپاڕێرەوە ، واتە لەدوای خۆ ئامادە کردنو دەستدانە هەموو کارێك ئییتر پشت بە خوا ببەستە •**

سُورَةَ التِّينْ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمْ

وَالتِّينِ وَالزَّيتُونِ(١) وَطُورِ سِنِينَ(٢) وَهَذا البَلَدِ الأمِينْ(٣)

---

# سوورەی ( تین )ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بە قدس(١) وە بە طووری سینا(٢) وە بەم شاری ئارامگایە (کە مەککەیە)(٣)

---

## سوورەی ( تین )ە

**مەککی‌یە ، ٨ ئایەتە ، ٣٤ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(والتین والزیتون) سوێند بەشاری (قدس) کە هەنجیرو زەیتوونی ئێجگار زۆرە ،و جێی لەدایـکبوونی حەزرەتی عیسـایە کە پێغەمبەرێکی زۆر گـەورەو گرنگـە (وطور سینین)وە بەو کێوەی کە لەدەشتی سینا ، وە لەرۆژئاوای قەنالی سوێسەوەیە، کە بارەها موو‌سـا پێغەمبەر سرووش «وحی»ی لەسـەر وەرگرتووە ، (وهـذا البلد الامین) وە بـەم شاری مـەککەیە کە جـێی ئاشتیی‌و دلنیایی‌یە ، چونکـە لەپێشـ پێغەمبەریشـا شارێکی هەر پیـرۆز بووە ، وە جەنگ‌و کێشـەو ، دارودرەخـت شکاندنەوەو ، ڕاو تیاکردن‌و ، گیان‌لەبەر کوشتنی تیا قەدەغە بووە ، جگە لەوە کە دواترینی پێغەمبەرانی تیا هاتۆتە جیهانەوە ، وە تیا بووە بە پێغەمبەر ، وە نیوەی قورئانی لەوێ بۆ هاتۆتە خوارەوە •**

**ئەم سێ شوێنە ــ وەك ابن تیمیه ئەفەرموێـ سێ شوێنی زۆر گەورەو گرنگ‌و**

بەفەڕن کە لــە هەر یەکێکیانا خــوا پێغەمبەرێکی خــاوەن نامەی ، خــاوەن یاساو شەریعەتێکی جیهانیی «عالەمی» لێوە ڕەوانە کردووە •

تەورات لە أصحاحی ٣٣ لە «سفری تثنية»دا مژدەی ئەم سێ پێغەمبەرەی‌داوە ، وە ئەفەرموێ : «خوا پورتەوی‌دا لە سینا (بە ناردنی مووسا) ، وە ڕووناکیی‌دایەوە لە (شاخی) ساعیر (لە دێی ناصرە بە ناردنی عیسا) ، وە شەوقی دایەوە لە شاخی «فاران» ـ کە مەککەیە بەلای مسڵمانەکانو ، گاورەکانو ، جوولەکەکانەوە ـ بە ڕەوانەکردنی حەزرەتی محمد •

دوور نی‌یە ئەگەر بڵێین لە سەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە کە پێغەمبەرو هاوڕێکانی لە تەنــگانەو دەردی‌سەریی‌دا بــوون ، وە بــە دەست زۆرو ســتەمی بێبڕواکانێوە ئەیان‌ناڵاند ـ خوا سوێندی بەم شوێنانە خوارد بۆ ئەوەی کە مزگێنی‌یان بداتێ کە لەپاشەڕۆژێکی نزیکا ئەم شوێنانە ئەکەونە ژێر دەستی مسڵمانانەوە ، وە نیشانیان بدات کە ئەم شوێنانە زۆر پیرۆزو گرنگن ، وە زۆر پێویستن کە ئاگاداریی بکرێنو لەدەست نەدرێن ، چونکە (فەلەستیین) دەرگای یەکــەمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســتو وولاتی ئیسلامە ، هەروەك دەشتی «سینا»و قەناڵی «سویس» دەرگایەکی تریەتی ، وە ئەم دوو شوێنە دوو شوێنی جەنگیی زۆر گرنگن ، وەك سەنگەروسوپەروان بــۆ عالەمی ئیسلام ، نەخوازەلا بۆ مەککەو مەدینە •

بەڕاستی ئەگەر وورد ببینەوە تێ‌ئەگەین کە هەر سوێندێك لەم سوێندانە وەك گوڵۆپێکی سوور وایە ـ کە نیشانەی مەترسی‌یە ـ هەڵواسراوە بەسەر شاخێکی بەرزو شوێنێکی جەنگی‌یەوە لەم شوێنە گرنگانە ، بۆ ئەوەی کە مسڵمانان نرخیان بزانن‌و ئاگاداری‌یان بکەن ، وە هەر لەبەر ئــەوەیە ، کە بە تایبەتی قدســیش لە فەلەستین کراوە بە شوێنی شەورەوی «اسراء» پێغەمبەر ، درودی خوای لێ‌بێ •

بەڕاستی مسڵمانانی پێشوو ، لەم ئاماژە «اشارە»یە گەیشتبوون ، وە لە دڵی باوانو باپیرانیانەوە سەرڕێژی کردبوو بۆ دڵی نەوەو وەچەیان ، بە ڕەنگێك کە دەستە جڵــەوی دڵیانی گرتبووە دەست بەجۆرێك هەرچەند هێرشێك برابێتــە سەر «قدس» بەسەرو بەماڵ بەرهەڵستی‌یان لێ‌کردووە ، وە ئاگاداری‌یان کردووە ، بەڵکو

لَقَدْ خَلَقْنَا الإنْسانَ فِي أَحسَنِ تَقْوِيم(٤)

بەڕاستی ئادەمیی‌مان دروست کرد لەجوانترین شێوەدا(٤)

ساڵەهای ساڵ وێستان ڕووبەڕووی هێرشی ڕۆژئاوایی‌یەکان ، تا بەپاکو تەمیزیی دایانە دەست مسڵمانانی سەدەی چواردەهەم ، بەڵام داخەکەم لەم دواییی‌یەدا فەلەستین لەدەستچوو ، وە دەرگای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست درایە دەست دوژمن ، ٠

وەك لەبەسەرهاتی ڕابووردوو،وە لەمێژووی ژیانی لەمەوبەرەوە دەرئەکەوێ، ئادەمیی لەسەرەتای ژیانیا ، لەگەڵ یەکا زۆر دڵپاکو دڵنەرمبوون ، وە لەسروشت لایان نەداوە ، هەموو وەك منالی ماڵێك ساڵەهای ساڵ پێکەوە ژیاوون ، وە بە خۆشییو برایەتی ڕایانبواردووە ، چونکە هەموو زانیویانە کە زۆر شت لەم جیهانەدا ، بە دووپشكو ، مارو ، شێرو ، گورگو سەرماو ، گەرماو ، لافاوو ، بوومەلەرزەیەوە ، دوشمنی ئەوون ، وە ئەمان لەهەموو گیانلەبەرێك زیاتر پێویستن بەیارمەتی یەکتریی ، وەکو ئەفەرموێت : سوێند بەمانەی پێشوو (لقد خلقنا الانسان) بێ‌گومان ئادەمیی‌مان دروستکرد (في أحسن تقويم) لە جوانترین شێوەدا ، چ لەبابەت جەستەو ئەندامی‌یەوە ، چ لەبابەت ژیریی‌و بیری بەرزی‌یەوە ، چ لەبابەت گیانی خاوەن پەروازی‌یەوە ، بەڕەنگێکیی‌وا ئەگەر لێی ووردبیتەوە ، تێ‌ئەگەیت کە ئەم دروستکراوە شتێکی تایبەتی‌یە ، وە بۆ ئەوەیە کە بەژیریی‌و بیری بەرزی خۆی خوا بدۆزێتەوە ، وە ببێ بەجێ‌نشینی لەسەرزەویی ، وەلەپاشەڕۆژا زیندوو بکرێتەوە بۆ لێ‌پرسینەوە ، بەڵام لەپاشا کە بە پلەی شارستانێتی‌دا سەرکەوتن ، وە هەوەس‌و ئارەزوویان جووڵا ، وە ئاواتو مەبەستیان زۆربوو ، وە هەرکەسە دوای هەواو هەوەس‌و ئارەزووی هیچ‌وپووچی خۆی‌کەوت ، وە قازانجو سوودیان تێکەڵاو بوو ، وە لەم ڕێ‌یەدا قین‌و کینەو فیزو ناپاکی‌و دووزمانی‌و دووبەرەکی‌و ڕووپامایی «ریاء»و زۆروستەم لەناویانا بڵاوبووەوە ، وە ئەمانە سەریان کێشایە دەستدرێژیی بۆ سەرو ماڵو ناموسی یەکتریی ، تا وای‌لێ‌هات پشت بەستن بەجانەوەرو درندە ، گەلێ باشتربوو لە پشتبەستن بە هێندێ ئادەمیی

ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ(٥) إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ، فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٦)

**لەپاشا گێرامــان بەپەستترینی هەموو پەســتێك(٥) مەگەر ئەوانەی کــە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە ، بۆ ئەوان هەیە پاداشی بێبڕانەوە(٦) •**

**ناڵەبار ، وە بەم ڕەنگە زۆر لە ئادەمیی لە پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی خۆیەوە ، هاتە خوارەوە تا گەیشتە لای هەرە خوارووی جانەوەرو دڕندە ، وەکو ئەفەرموێ (ثم رددناه أســفل سافلین) لەپاشــا ئادەمییمان گێــڕا بە پەستترو نــەویتر لەو گیانلەبەرانەی کە لەم پەستترو نەوییتر بوون ، چونکە جانەوەرو دڕندە هەرچی بکەن بــەپێی سروشت ئەیکەن ، وە هەرگیــز لە سروشتی خۆیان لانــادەن ، بەڵام ئادەمیی بەسروشت بۆ ئەوە دروست کراوە کە ژیــریيو بیری بەرزی خۆی بەکار بێنێ لەڕێی چاکەو خواپەرستیدا ، کەوابوو هەردەمێك لەسروشتی خۆی لایدا ، گەلێ گەلێ لــە جانەوەرو دڕندە کەمتــرە (الا الذين آمنــوا) مەگەر ئەوانــەی کە بڕوایان هێناوە (وعملوا الصالحات) و کردەوە چاکەکانیان کردووە ، (فلهم اجر غير ممنون) بۆ ئەوان هەیە پاداشی بێبڕانەوە •**

**ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بەخوا ، وە بەو دەستوورو یاسایانەی کە دایناوە بۆ چاکەو خراپە ، وە هەمیشە بە گوفتارو کردار چاکە ئەکەن ، وە توخنی خراپە ناکــەوون ، ئەوانــە بەڕاســتی پایــەی ڕێــزو گــەورەییو ئــادەمێتی خۆیانیــان ڕاگرتووە ، وە ڕێگای سروشتی پاکیان وون‌نەکردووە ، لەبەرئەوە لە جیهانا پاداشی چاکەیان ئەدرێتەوەو بەڕێز ئەژین ، کە مردیشن لە میهرەبانی خوادا نوقوم ئەبن ، ئەمانە وەك پێغەمبەرانو ئەو کەسانەی کە لەسەر ڕێی ئەوانن ، وە ئەو کەسانەی کە خوا ، ڕێ نمــوونی کردوون بۆ دینی ڕاست لەنــاو هەموو گەلێــکا ، بەڕاستی ئەمانە پارسەنگی ئادەمێتی ، وە مایەی شانازیی ئادەمیین ، لەهەرلایەك لە جیهانا شوێنەوار «ئاثار»ێکی چاکە ببێ ئەوە هی ئەوانە ، ئنجا کە ئەمەت بە چاوی خۆت**

فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ ؟(٧) أَلَيْسَ اللهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ ؟(٨)

ئیتر چیبێ بڕوات ئەکا بە ئاین ؟(٧) ئایا خوا فەرمانڕەواتری هەموو فەرمان ڕەوایانێك نییە ؟(٨) •

دیی ، ئیتر (فما یکذبك بعد بالدین) چی وا هەیە ـ ئەی ئادەمیی ـ کە ببێ بە مایەی بێبڕواییت بە ئاین ، واتە هیچی وا نییە •

مەبەس لە دین لێرەدا پەیوەندیی دڵو دەروونە بە خواوە بە پاکیی ، وە خەریك بوونە بە کردەوەی چاکەوە ، لەپاش ئەوەی کە زانییت ئادەمیی دروست کراوە بەپێی سروشت بۆ چاکەو خوا پەرستیی ، وە ئەو کەسانەی کە خاوەنی بڕواو کردەوەی باشن ، مایەی شانازییو تاجی سەری ئادەمێتین ، ئیتر شتێکی وا نییە کە ببێ بە مایەی بێئایینیو بێبڕواییت (الیس الله باحکم الحاکمین) ئایا خوا فەرمانڕەواتری هەموو فەرمانڕەوایانێك نییە ؟ واتە بەڵێ وایە ، لەبەر ئەوە ئادەمییوا دروست کردووە کە بە سروشت ببێ بەسەرچاوەی ڕەووشتو خووی شیرین ، وە سەرمەشقی ڕەفتارو گوفتارو کرداری ڕەنگین ، بەلام بەهۆی دواکەوتنی هەوەسو ئارەزووی هیچوپووچەوە ، هەموو جارێك لەسەر پلەی هەرە بەرزی ئادەمێتی خۆیەوە دێتە خواری خوارەوە بۆ پلەی هەرە پەستی جانەوەران ، لەبەرئەوە خوا پێغەمبەرانی بۆ ناردن بە ڕەهبەرو پێشەوا ، لە «نوح»ەوە تا «محمد» دروودی خوایان لێبێ ، هەریەکەی بە دەستوورو ئایینێکەوە بۆ پاسی ڕەووشتو خووی بەرزیان •

# سوورەی ( علق )ە

مەککی‌یە ، ٢٠ ئایەتە ، ٧٢ ووتەیە

## بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر لەپێش پێغەمبەریەتی‌دا بە سێ ساڵ ، لەرەمەزانانا ئەچووە ئەشــکەوتی «حراء» بۆ خواپــەرستی‌و بیرکردنەوە لە خــاوەنی ئاسمان‌و زەویی •

ئەم چۆڵپەرستیی پێغەمبەرو خەڵوەکێشانەی لە پێش پێغەمبەریەتی‌دا ، شتێك بووە لە خواوە کە ناویەتە دڵی ، بۆ ئەوەی لە ئاژاوەی جیهان دووربکەوێتەوە ، وە لەگەڵ خــوای خۆیا خەریــك‌بێ ، وە بیربکاتەوە لــەم بوونەوەرە گــەورەیە ، وە نیشانەی خوای تیا بدۆزێتەوە ، وە گیانی پاکی لەگەڵ بوونەوەرا ، تێکەڵ ببێ ، وە لە نامەی کراوەی بێ‌پایانی جیهان ، هەر رۆژەی لاپەرەیەکی لێ‌بخوێنێتەوە ، تا تۆزێك لە زەویی دوور ، وە لە ئاسمان نزییك‌بکەوێتەوە •

بەم‌جۆرە ، خوا ویستی کە پێغەمبەر چەند ساڵێك لەپێش پێغەمبەریەتی‌دا ، بیربکاتەوە ، وە دەرس بخوێنێ لە قوتابخانەی بوونەوەرا ، بۆ ئەوەی ئامادە ببێ بۆ هەڵگــرتنی سپاردە «امانة»ی هەرە گەورەی خوا کە پێغەمبەریــەتی‌یە ، وە بۆ گۆرینی رێی مێژوو ، وە هێنانەوە سەر رێی ئادەمیی کە رێی لێ‌وون بووە • بەم چۆڵپەرســتی‌و خەڵوەی سێ‌ساڵە ، گیانی پاکی سییل‌کرا لە هەمــوو ژەنگ‌و چڵکێکی کۆنەپــەرستیی ، وە لە هەموو تەپوتــۆزێکی دەستوورو بــاوی باپیران‌و داپیران ، وە بوو ، بە چرایەکی پاك‌وتەمییزی ئامادە کە هەمییشە چاوەروانیی داگیرسانی ئەکرا •

پێغەمبەر ئەفەرموێ لەحەڵێکا کە لەئەشکەوتی «حراء» پاڵ‌کەوتبووم ، بە دڵ بێدار ، بەچاو نوستبووم ، فریشتەیەك لە شێوەی ئادەمیی‌دا هاتەبەردەمم پێ‌یووتم

سُورَةُ العَلَق

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

إقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الذِي خَلَقَ(١)

# سوورەی ( علق )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بخوێنە بەناوی پەروەردگارێکتەوە کە هەمووشتێکی دروست کردووە(١)

« اقرأ » واتە بخوێنە ، پێغەمبەر ئەفەرموێ منیش ووتم خوێندەوارنییم ، ئەفەرموێ کە وامپێ‌ووت گرتمی‌و گوشیمی بەسنگی‌یەوە تا هێزی لێبڕییم ، ئنجا بەری‌دامو پێی‌ووتم : بخوێنە ، ووتم خوێندەوار نییم ، دووبارە گوشیمی بە سنگی‌یەوە تا هێزی لێبڕییم ، ئنجا بەری‌دامو پێی‌ووتم : بخوێنە ووتم خوێندەوار نییم ، سێبارە گوشیمی بەسنگی‌یەوە تا هێزی لێبڕییم ، ئنجا بەری‌دامو پێی‌ووتم : بخوێنە ، منیش ووتم چی‌بخوێنم ؟ ووتی (اقرأ باسم ربك الذی خلق) تا گەیشتە «مالم یعلم» واتە بخوێنە بەناوی پەروەردگارێکتەوە کە هەموو شتێکی دروست‌کردووە ، واتە هەرچەند تائێستا تۆ خوێندەوار نەبوویت، بەلام ببە بە خوێندەوار بە فەرمانی خوا ، بەجۆرێك هەرچەند لەمەولا قورئانت بە سرووش بۆ هات ، بێتە بەرت‌و لەبیرت نەچێتەوە ، وە بەرەوانیی بتوانییت بیخوێنییتەوە بەسەر مەردوما ، واتە ئەو خوایەی کە بوونەوەر «کون»ی دروست کردووە بەم ڕێك‌وپێکی‌یە ، ئەتوانێ تۆ بکات بە خوێندەوار .

لەبەرئەوەی کە ئادەمیی لە هەموو دروست‌کراوێکی خوا بەرزترو گەورەترو بەنرخترە بۆیە بەتایبەتی ناوی بردو فەرمووی (خلق الانسان من علق) ئادەمیی دروست کردووە لەخوێنپارە ، واتە خوایەك کە بتوانێ ئادەمی‌یەکی وورپای ، ژیری ، زیرەکی ، گۆیا ، دروست بکات لە پارچەیەك خوێنپارە ، بەڕەنگێکی وا کە بتوانێ زۆر شت لە ئاسمان‌و زەویی رامی ژێردەستی خۆی بکات ، چۆن ناتوانێ

خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)

**ئادەمیی دروستکردووە لە خوێنپارە(٢) بخوێنە ، پەروەردگاری تۆ (لە هەمووکەس) بەخشندەترە(٣) ئەوەی کە (ئادەمیی) فێر (ی نووسین) کردووە بە قەڵەم(٤) ئادەمیی زانا کردووە بەو شتانەی کە نەیئەزانی(٥) ٠**

**ئادەمییەکی تـەواوی هەڵکەوتـووی وەك پێغەمبەر بکات بـە خوێندەوارێکیوا هەرچی بەسـەرا بخوێنرێتەوە بێتەبەریو بتوانێ وەك خوێنـدەوار بیخوێنێتەوە بەڕاستی ئـەم ئایەتە جلەوکێشی تەماشـاو ووردبوونەی ئادەمییە بـۆ ووردترین زانین ، کە زانینی ژیانو دروستکردنی ئادەمییە ٠**

**باوی خوایە لە جیهانا هەرکەسێك بییەوێ فێری خوێندنو خوێندنەوە ببێ ، ئەبێ ماوەیـەکی زۆر خەریکبێ ، وە هەموو دەرسێك کە ئەیخوێنێ ئـەبێ چەند جارێك بییلێتو بییلێتەوە تا چاووگوێو زمانی ڕاییو فێرئەبێ ، ئنجا لێرەدا لە جیاتی ووتنەوەی دەرسەکە لەلایەن پێغەمبەرەوە ــ کە سرووشە ــ خوا فەرمانەکەی خۆی ووتەوە ، فەرمووی (اقرأ وربك الاكرم الذی علم بالقلم) بخوێنە ، چونکە هەر پەروەردگاری تۆیە بەخشندەیەکی بێپایـانی ئەوتەو ، کە ئادەمیی تێگەیاندووە بەهۆی قەڵەمێکی بێگیانی بێزمانەوە ، واتـە خوایەك بتوانێ قەڵەمێکی ووشكو برنگی بێگیان بکات بەهۆی تێگەیاندن لەناو ئادەمییدا ، چۆن ناتوانێ تۆ بکات بە خوێندەوار ، ئنجـا بۆ بەهێزکردنەوەی پێشوو ، وە بۆ ئەوەی کە هیچ لـە دڵی پێغەمبەرا نەمێنێ ، فەرمـووی (علم الانسان مالم یعلم) ئادەمیی فێری ئـەو شتانە کردووە کـە نەیئەزانی ، واتە ئەو خوایەی کە فەرمانی داوە بە تۆ کـە ببیت بە خوێندەوار ، هەر ئەو خوایەیە کە ئادەمیی لە سادەییو هیچنەزانییەوە ، فێری ئەو شتانەی کردووە کە لە جیهانا پێیئەژیی ، ئنجا ئایا بەدووری ئەزانییت لەو خوایەوە کە تۆ فێـری خوێندنەوە بکات ، لەگەڵ ئەوەی کە ئێوە زۆر شتیتر ئـەزانن ، وە ئامادەن بۆ فێربوونی خوێندنەوەشو شتیتریش ٠**

بەڕاستی نووسینو قەڵەم گەورەترین بەخششی خوایە ، وە چاکترین بەھرەیە بۆ ئادەمیی ، چونـکە ھەر بەھۆی نووسینو قەڵەمەوەیە ، کە بیروبـاوەڕی ھەموو کەسێك یەکئەگـرێو پوختە ئەبێ ، تا ئەبێ بە نامێلکەو کتێب ، وە ھـەر بەھۆی نووسینو قەڵەمـەوەیە کە پێشینان کەلەپـووری زانیاریی خۆیـان بەجێدێڵن بۆ ھەزاران سـاڵ دوای خۆیـان ، وە ئەمان لە بیـروباوەڕی ئەوان ئەگـەن ، وە لە زانیارییان ، بەھـرەمەند ئەبـنو لێی زیاد ئەکـەن ، وە ھەمـوو بیروباوەڕێك ئەمێنێتەوە ، بەبێ ئەوەی شتێکی لێوون ببێ ، وە ھەر بەھۆی نووسینو قەڵەمەوەیە، کە ھەرچی دەستوورو ئاین ھەیە ھەمووی ئەمێنێتەوە ، کە گەورەترینیان قورئانی پیرۆزە ، کە ئەمە ھەزارو چوارسەد ساڵە لەسایەی نووسینو قەڵەمەوە ماوەتەوە ، وە ھەر بەھـۆی نووسینو قەڵەمەوەیـە ، کە بە ھـەزاران ملیۆن نامـەو نامێلکەو گۆڤارو ڕۆژنامە ، نووسراوونو لەچاپدراوون ، وە لە ھەموو شوێنێك تا بنمیچ ھەڵچنراوون ، کەوابـوو شایستەیـە بۆ خوای گـەورەی میھرەبان ، کـە لەیەکەم سرووشیا بۆ دواترین پێغەمبەر ، باسی خوێندنو نووسینو زانینو قەڵەم بکات ، وە شایستەیە بۆ مسڵمانان کە شانازیی پێوەبکەن ، جگە لەوە ، کە تێئەگەین کە ئەمانە لە ئیسلامەتیدا لە ھەمووشت لەپێشترن ، وە ئەبێ مسامان بەپێی فەرموودەی قورئان ، لەپێش ھەموو گەلێکا خوێندەوارو زانابێ ، وە بەپێی ڕۆژ بخوێنێ ، وە بە پلەی زانینو خوێندەوارییدا ، سەرکەوێ تا ئەگاتە سەر چڵەپۆپەی ھەرەبەرزی ژیان ٠

بەڕاستی لەکاتی ھاتنـە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ، قەڵەم ئەم پایـەو نرخەی نەبووە کە بەمجۆرە ناوببرێ ، بەڵام خوا خۆی نرخی قەڵەمی زانییوە ، بەمڕەنگە کە ناویبەرێ لە یەکەم سرووشیا ، لەگەڵ ئەمییشە کە ئەو پێغەمبەرەی ئەم ئایەتەی ھێناوە ، خۆی خوێندەوارو نووسەر نەبووە ، وە نرخی قەڵەمی بەم ڕەنگە نەزانیوە، کەواتە ئەگەر قورئان فەرموودەی خۆی بووایە ئەم ئایەتە وانەئەبوو ، یاخۆ ناوی قەڵەم بەمڕەنگە نەئەبرا ٠

لەسەرەتای ئیسـلامەتیدا چونـکە مسڵمانـان بەپێی قورئـانو فەرموودەی

كَلاَّ إِنَّ ٱلْإِنْسَانَ لَيَطْغَىٰ (٦) أَنْ رَآهُ ٱسْتَغْنَىٰ (٧)

بەڕاستی ئادەمیی یاخی ئەبێ(٦) کە خۆی ببینێ وا دەوڵەمەند بووە(٧)

پێغەمبەر ئەڕۆیشــتن ، ئەو هەمــوو زاناو دانــاو بزانو خوێنــدەوارو پێشەواو فەیلەسووفانەیان لێهەڵکــەوت ، کــە هەمــوو جیهانیــان پڕکرد لــە خوێندەوارو خوێندەواریی ، وە بە ملیۆنەها کتێبیان نووسیی ، وە گەلێ زانینیان دانا ، وە ئەم هەموو دەستوورو یاسایانەیان دەرهێنا لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر ، کە وەك دەریایەکی بێپایان شەپۆل ئەدات ، وە ئەمە هەزار ساڵە هەر کاوێژی قسەکانی ئەوان ئەکەینەوە ، وە هەر بە کەلەپوورەکەی ئەوان ئەژین ، بێئەوەی شتێکی لێ زیادبکەین ، وە بە پێی پێویستی ژیان هەوڵی فراوانکردنی زانیاریی جیهان بدەین، وەکو قورئان فەرمانی پێئەدا لەگەلێ شوێنا ، ئینجا ئەگەر بێدار نەبینەوە ، وە پەردەی نادانیو نەخوێندەواری دانەدڕین لە بەرماندا ، وە نەچینە ڕیزی گەلانی خواپێداو ، یاخوا هەر خۆمان بەخۆمانبین ٠

⊙ ⊙ ⊙

لەم ئایەتانەوە دەرکەوت کە خوا هەموو شتێکی دروست کردووە ، وە لەناو هەمووـیانا ئادەمیی بەرزکردۆتەوە ، وە فێری خوێندنو نووسینی کردووە ، کەوابوو هەرچی ئــادەمیی شکی ئەبــات هەمووی لەخــواوەیە ، کــەچی لەگەڵ ئــەم هەموو میهرەبانییەدا ، ئادەمیی کە پارەو دارایی ، یا ناوونیشانێکی بەخۆیەوە دیی ، خێرا یاخی ئەبێ ، وە خــوای لەبیر ئەچێتەوە ، وەکــو ئەفەرموێ (١) کلا ان الانســان لیطغی) بەڕاستی ئادەمیی یاخی ئەبێ (ان رآە استغنی) کە خۆی ببینێ بەدەوڵەمەند، واتە هەرچەند ئــەزانێ کە زۆر زەبوونە ، وە بەرگەی هەڵمو هاڵاوێــکی ڕۆزگار ناگرێ ، وە لە هەموو دەمێکا پێویستە بە یارمەتیو میهرەبانیی خوا ، کەچی لەگەڵ دەوڵەتو دەســەڵاتی بەخۆیەوە دیی ، لە خوا یاخی ئەبێ ، وە لە فەرمــانی ئەچێتە

(١) لە سەرەتای سوورەتەکەوە تائێرە یەکەمجار بە مرووش هاتۆتە خوارەوە ، لەپاش چەندساڵێکیتر ئنجا ئەوییکەیتری هاتووە ٠

إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الرُّجْعَىٰ (٨) أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَىٰ (٩) عَبْدًا إِذَا
صَلَّىٰ ؟!! (١٠) أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَىٰ (١١) أَوْ أَمَرَ
بِالتَّقْوَىٰ ؟! (١٢)

---

**بێگومان هەر بۆ لای پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوە(٨) ئایا دییت ئەو کەسەی کە جڵەوگیریی ئەکات(٩) لە بەندەیەك کە نوێژ بکات ؟!!(١٠) ئایا دییت ئەگەر (ئەو کەسە) لەسەر ڕێی ڕاست بووایە(١١) یا فەرمانی بدایە بە پارێزگاریی (باشتر نەئەبوو) ؟!(١٢)**

---

**دەرەوە ، وەدەست ئەکات بەدەستدرێژیی ، بۆ سەرو ماڵو ناموسی مەردوم ، وە وائەزانێ کە هەرگیز نامرێ ، وە هەر بە دەوڵەمەندیی ئەمێنێتەوە ، نەء ، وانی‌یە ، بەڵکو ئەمرێ ، وەکو ئەفەرموێ (ان الی ربك الرجعی) هەر بۆلای پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوە ، واتە هەموو کەسێك ئەمرێو ئەچێتەوە لای خوا ، وە تۆڵەی هەموو یاخی‌بونێکی لێ‌ئەسێنێ .**

⊙ ⊙ ⊙

**یاخی‌بوون تا یاخی‌بوون جیاوازیی هەیە ، ناشیرینترینیان ئەوەیە ، کەئادەمیی لەخوای خۆی یاخی‌ببێ، بەمڕەنگە بڕوای پێ‌نەهێنێ، بەندەیی‌و پەرستشی نەکات ، لەمەش خراپتر ئەوەیە گاڵتە بکات بەو کەسانەی کە نوێژو خواپەرستیی ئەکەن ، وە ئەگەر دەستی بوو ، جڵەوگیریی نوێژکەرو خواپەرستیش بکات ، وەکو ئەفەرموێ (ارایت الذی ینهی عبدا اذا صلی) ئایا دییت ئەوکەسەی کە جڵەوگیریی بەندەی خوا ئەکات ، لەکاتێکا کە نوێژ بکات ؟! ، واتە تەماشای ئەو جۆرە کەسانە بکە ، کە بە پارەو ژیانی جیهان یاخی ئەبن ، وە جڵەوگیریی نوێژکردنو خوا پەرستی ئەکەن ، تا بزانییت چەندە خراپن .**

**(ارایت ان کان علی الهدی) واتە پێم‌بڵێ ئەو یاخی‌یە ، ئەگەر لەسەر ڕێی چاکە بوایە (أو أمر بالتقوی) یا ئامۆژگاریی مەردومی بکردایە بە خواپەرستیی‌و لە خواترسان ، لەجیاتی ئەوەی کە نەیەڵێ نوێژبکەن چاکتر نەبوو ؟!**

أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى ؟!(١٣) أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللهَ يَرَى؟(١٤)
كَلاَّ لَئِن لَّم يَنتَهِ لَنَسْفَعاً بِالنَّاصِيَةِ(١٥) نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ
خَاطِئَةٍ(١٦) فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ(١٧)

---

ئایا دیبت ئەگەر بڕوای (بە ئایینی بەڕاستی) نەبێو پشتی لێ‌هەڵکات (ڕزگاری ئەبێ)؟!(١٣) ئایا نەیزانییوە کەخوا ئەی‌بینێ؟!(١٤) وانی‌یە (کە تێی‌گەیوە) بەڕاستی ئەگەر وازنەهێنێ ڕای‌ئەکێشین بە (مووی) پێشانیی(١٥) پێشانی‌یەکی درۆزنی بەهەڵەداچوو(١٦) ئنجا با ئەو ، بانگی هاوڕێکانی خۆی بکات(١٧)

---

(أرأیت ان كذب) پێم‌بڵێ ئەو کەسە ئەگەر بڕوا بە ئایین نەکات (وتولی) وە پشت هەڵکات لە چاکەو کردەوەی باش ، ئایا ناترسێ لەوەی ، کە کوتوپڕ تووشی گەرداوێکی گەورەی بکەین ، کە هەرگیز لێی ڕزگار نەبێ • جوابی هەر دوو شرطه کە فرێدراوە وەك دیبت بە قەرینەی ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێ (الم یعلم بان‌الله یری) ئایا نازانێ کە خوا ئەی‌بینێ ، ئنجا ئەگەر باش‌بێ ئەوا پاداشی باشی ئەداتەوە ، وە ئەگەر خراپیش بێ ئەوا دووچاری ڕۆژی ڕەشی ئەکات (کلا) با بەم سەرکێشی‌و یاخی‌بوونە نەمێنێتەوە (لئن لم ینته) سوێند ئەخۆم ئەگەر دەست هەڵنەگرێ لەم یاخی‌بوونە ، وە دەست هەڵنەگرێ لە جڵەوگیریی مسلمانان لە نوێژکردن (لنسفعا بالناصیة) ڕای‌ئەکێشین بە مووی پێشانیی ، چ پێشانی‌یەك ؟ (ناصیة کاذبة خاطئة) پێشانی کەسێکی درۆزنی بەهەڵەدا چوو •

درۆو هەڵە ، سیفەتی خاوەنی ناوچەوانە ، بەڵام لێرەدا بەناوچەوانە کە ئەڵێ درۆزن ، چونکە ، سەرکێشیی‌و یاخی‌بوون لە ڕوخسارو ناوچەوانا دەرئەکەوێ • خاوەنەکەی درۆزنە چونکە خۆی بەشتێکی زۆر بەهێزو بەدەسەڵات ئەزانێ ، لەکاتێکا کە زۆر زەبوونە ، وە بەرگەی شەپازللەیەکی ڕۆژگار ناگرێ . هەروەها بەهەڵەدا چووە چونکە یاخیی‌و سەرکێشە ، و ەلە فەرمانی خوا چۆتە دەرەوە ، وە بە ناڕەوا ئازاری چاکانو پیاوی خوا ئەدات •

(فلیدع نادیه) ئنجا بائەو یاخی‌یە بانگی هاوڕێکانی خۆی‌بکات بۆجڵەوگیریی

سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ(١٨) كَلاَّ! لاَتُطِعْهُ ، وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ(١٩)

**ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بەدەستئەکەین(١٨) نەء ، بەقسەی مەکە ، وە نوێژ بکەو (لە خوا) نزیکبکەوەرەوە(١٩) ٠**

**نوێژکەرانو خواپەرستان ، وەبۆئازاردانی دڵی پیاوچاکان (سندع الزبانیە) ئێمەش لە لەشکری بەهێزی بێپایانی خۆمان ، بانگی چەند فریشتەیەکی زەبر بەدەستی بۆ ئەکەین ، تا لەجیهانا لەناوی بەرن ، یا لە ڕۆژی دواییدا بیخەنە دۆزەخەوە (کلا) نەکەیت گوێ بدەیتە قسەی ئەوکەسەی کە ئەیەوێ ڕێی نوێژو خواپەرستی بگرێ (لا تطعە) بە قسەی مەکە (واسجد واقتـرب) وە سجدە ببە بۆ خوای خۆت ، وە بە نوێژو خواپەرستیی ، خۆتی لێنزییك بخەرەوە ٠**

سُورَةَ الْقَدْرِ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

إنَّا أَنْزَلْنَاه فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ(١)

## سوورەی ( قــدر )ە

به‌ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئێمه قورئانمان نارده خوارەوه لەشەوی بەڕێزا(١) ٠

## سوورەی ( قــدر )ە

مەککی‌یه ، ٥ ئایەته ، ٣٠ ووتەیه

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خوا له سوورەی «بقرە»دا به ئایەتی «شهر رمضان الذی انزل فیه القرآن»(١) نیشانی‌دا که له مانگی ڕەمەزانا دەست کراوه بەناردنه خوارەوەی قورئان ، واته لەو مانگەدا پێغەمبەر بووه به پێغەمبەر ، وه سرووشی بۆ هاتووه ٠ لەم سوورەتەشا ئەفەرموێ یەکەم سرووش لەشەوا هاتووه ، وه ئەڵێ (انا انزلناه) ئێمه دەستمان‌کرد به ناردنه خوارەوەی قورئان (فی لیلة القدر) له شەوێکی گەورەو بەڕێزو پیرۆزا ٠

بەڕاستی شەوێك که دەرگای خۆشیی‌و خۆشبەختی تیا بکرێتەوه له کۆمەڵی ئادەمیی ، وه بنیـاتی ئایینێکی جیهـانیی وەك ئایینی ئیسـلامی تیا دابنــرێ ، وه سەرەتای قورئانی پیرۆزو گەورەی تیا بێته خوارەوه ـ ئەمەنده گەورەیه بیری

(١) واته مانــگی ڕەمەزان ئەو مانگەیه که دەستی تیاکرا به ناردنــه خوارەوەی قورئان ٠

وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ؟(٢) لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣) تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا

**تۆ چووزانییت کە شەوی بەڕێز چی‌یە؟(٢) شەوی بەڕێز چاکترە لە هەزار مانگ(٣) لەوشەوەدا فریشتەو جبریلییش لەناویانا هاتنە خوارەوە ٠**

ئادەمیی دەرەقەتی نایەت ، وەکو ئەفەرموێ (وما ادراك ما ليلة القدر) تۆ چووزانییت کە شەوی بەڕێز چی‌یە ؟ (ليلة القدر) شەوی بەڕێز (خير من ألف شهر) چاکترو گەورەترە لەهەزار مانگ، واتە خێرێك لەو شەووڕۆژەدا بەقەد خێری هەزارمانگە ٠

مەبەس لە هەزار ، لەم جۆرە شوێنانەدا ژمارەکە نی‌یە ، بەڵکو زۆری‌یە ، وەك لە ئایەتی «يود أحدهم لو يعمر ألف سنة»دا(١) ، ئنجا بەم پێ‌یە شەوی بەڕێز نەك لە هەزار مانگ بەڵکو لە سەد هەزار مانگ‌و ساڵ گەورەترو بەنرخترە ، چونکە ئەو دەرگایانەی کە لەو شەوەدا کراونەتەوە لە کۆمەڵی ئادەمیی ، لەوەپێش لە هەموو عومری ئادەمیی‌دا نەکراونەتەوە ، کەواتە شەوێك کە چرای ڕێنموونیی خوای تیا هەڵکرێ ، وە شاڕێی کامەرانیی تیادەرکەوێ ، وە ئاسمان‌و زەویی دەست بکەنە ملی یەك ، وە خوای گەورەو مەزن بەچاوی خۆشەویستی‌و میهرەبانیی تەماشای هەموو ئادەمیی بکات ، وە ڕێنموونی گومرایانی بکات‌و نەخوێندەواری فێری خوێندن بکات‌و کاروباریان بۆ ڕێك بخات‌و نەقشەی خۆشیی‌و خۆشبەختی‌یان بۆ بکێشێ‌و ڕێی سەرکەوتن‌و بەرزبوونەوەیان نیشان بدات ــ بێ‌گومان ئەو تاقە شەوە لە هەموو عومری جیهان پیرۆزترو بەفەڕترو بەنرخترە ٠

قورئان لە باسی گەورەیی ئەو شەوەدا هەر بەمەندە وازی‌نەهێنا ، بەڵکو ناوی هاتنەخوارەوەی فریشتەو جبریلیش ئەبات ــ کە شتێکی غەیبیین ــ ئەفەرموێ (تنزل(٢) الملائكة والروح فيها) لەوشەوەدا فریشتەو جبریل هاتنە خوارەوە بۆ لای

(١) واتە حەزئەکات (هەموو) یەکێکیان کە خۆزگە هەزارساڵ بژیایە ٠

(٢) شێخ محمد عبده ئەفەرموێ : ئەم فعلی مضارعە بەمعنا فعلی ماضی‌یە وەك لە ئایەتی «وزلزلوا حتى يقول الرسول»دا ٠

بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ(٤) سَلامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ(٥)

بەفەرمانی پەروەردگاریان لەگەڵ هەموو کاروبارێك (ی ئایینی بەفەڕ)دا(٤)، ئەوشەوە (کاتی) ئاشتیی بوو تا هەڵاتنی شەبەق(٥) •

پێغەمبەر ، وە لەبەرچاوی ئاشکراو نمایان بوون •

«روح» ئەو فریشتەیەیە کە سرووش ئەهێنێ بۆ پێغەمبەران ، وە قورئان ناوی ئەبات بە جبرییل ، ئنجا فریشتەو جبرییل کە دەرئەکەوون بۆ پێغەمبەران (باذن ربهم) بە فەرمانی خوای خۆیانە واتە فریشتە بۆ هەموو کەسێك دەرناکەوێ مەگەر کەسێك کە خـوا نەفسێکی زۆر گەورەو پـاكو تەمییزو بەهێـزی دابێتێ ، لەپاشا ئامادەی کـردبێ بۆ بینینی ، کە ئەمەش بە هەموو کەسێك ڕەوا نابینـرێ مەگەر پێغەمبەران کە یەکە ، یەکەیەکێ لەناو هەزاران ملیۆن مەردوما ، کە بەمە ئەڵێن (اذن)ی خوا •

ئنجا ئەم هاتنی فریشتانە بۆ لای پێغەمبەر (من کل امر) لەگەڵ هەموو کارو بارێکی دینیـیـە ، کە خوا بییەوێ بیگەیەنێ بە بەندەگانی خۆی (سـلام هی حتی مطلع الفجر)ئەوشەوە ، شەوێکی پڕ لە ئاشتی بوو تا بەیانی ، وە دەرگای خۆشییو خۆشبەختی تیـا کرایەوە لە پێغەمبەرو کۆمــەڵی ئادەمیی ، وە پەردە لەســەر دڵی پێغەمبەر هەڵگیرا ، وە شاڕێی بەختیارییو کامەرانیو سەرفرازیی تیاکرایەوە •

بەڕاستیی شەوی بەڕێز ، گەورەترین شەوە ، کە بەسەر ئادەمییدا هاتووە ، شەوێکە کە خوای گەورەو میهرەبان ئاووڕێکی پڕ لە میهرەبانیی تیا داوەتەوە لە ئادەمیی ، وە لە خۆیان یەکێکی لێهەڵبژاردووە تا ـ وەك ڕادیۆ ـ ببێ بە ڕابەر لە ناوەندی ئاسمانو زەوییدا ، وە لەناوەندی خواو بەندەگانا ، تالەوەوە ، فەرموودەو فەرمانی خوایـان پێبگات ، وە هەر ساتەی جۆرە دەرسێکی لێوەرگـرن ، وە هەر ڕۆژەی دەستوورو باوێکی خواییان پێبگات •

بەڕاستی لـەو شەوی بەڕێزەوە ، تا کۆچی دوایی پێغەمبەر کـە ٢٣ ساڵە ، ماوەیەکی زۆر پیرۆزو بەفەڕ بووە ، چرای بڕوای ، لە دڵو دەروونی ئادەمییدا

هەڵگیرساند ، مسی قەڵبی دڵی کردن بەزێڕ ، مێژووی گۆڕین ، دەستوورێکی هەتا هەتایی ، بۆ دانان ، دەرگای زانینو زانیاریی بۆکردنەوە ، کەلەبەری بەندەییو نادانیی لێداخستن ، بەیداخی برایەتییو ئاشتیی هەڵدا لە هەموو گۆشەی جیهانا •

ئێمە کە مسلمانین پێویستە ئەمشەوەمان بیرنەچێتەوە ، وە هەموو ساڵێك ئاوای بکەینەوە بە چاکەو خواپەرستییو نزاو پاڕانەوە لەیەزدانی پاك ، کە لەسەر ڕێی ڕاست لانەدرێین ، وە بیرو بڕوامان تێك‌نەچێ ، وە سەرمان لێ‌نەشێوێ ، تا بتوانین ئاگاداریی ئەم کەلەپوورە گەورەیە بکەین •

# سوورەی ( بینه )یه

مەدەنی‌یه ، ٨ ئایەته ، ٩٤ ووتەیه

## بسم‌الله الرحمن الرحیم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لەپێش هاتنی پێغەمبەری ئیسلاما ، ئادەمیی زۆر پێویست بوون به ئایینێکی تازەو پێغەمبەرێـکی تازەو دەستوورو یاسایەکی تازە ، چونکه بێبـڕوایی ڕووی کردبووه خاوەن نامەکان ، وەك قورئان ئەفەرموێ «وقالت الیهود عزیر ابن الله • وقالت النصاری المسیح ابن الله»(١) التوبه/٣٠ «لقد کفر الذین قالوا : ان الله هو المسیح ابن مریم»(٢) مائده/٧٢«لقد کفر الذین قالوا : ان الله ثالث ثلاثة»(٣) مائده /٧٣ • وه ئەوەندە دەستکاریی دینەکەیان کردبوو ، وه به شتی پرۆپووچ دایان پۆشیی بـوو ، ئـەگەر مووســاو عیســا بهاتنایەتـەوه جیهان دینـەکەی خۆیانیان نەئەناسی‌یەوه ، ئەو چرایەی که پێغەمبەران هەڵیان‌گیرساندبوو ، بەگێژەڵووکەی دوای خۆیان کووژابووەوه ، وه تروسکەی نەمابوو ، مەگەر له دڵی یەکه یەکەیەکا نەبێ که خۆیان شاردبۆوه ، زانایانو پیاوانی دینی ، ئەوانەی که باش‌بوون ، له ئامۆژگاریی مەردوم کۆڵیان دابوو ، وه خۆیان پەنا دابوو له کەنشتەو کڵیسەکانا ، ئەوانەی که له گێژاوی ژیانیشا مابوونەوه ، لەگەڵ سەرۆکو کاربەدەسته بۆگەنەکانا ڕێکەوتبوون،وەدینیان خستبووه ژێرپێی‌ئەوانەوە• ئنجا لەترسی ئەوەی نەوەك کۆمەڵه

(١) واته جوولەکەکان ووتیان : عزیر کوڕی خوایه • گاورەکانیش ووتیان : مسیح کوڕی خوایه •

(٢) واته بەڕاستیی بێبـڕوابوون ئەوانـەی که ووتیان : مسیحی کـوڕی مریم خوایه •

(٣) واته بەڕاستیی بێبـڕوابوون ئەوانەی که ووتیان : خـوا سێهەمی سێکەسه (واته یەکێکه له سێ خوا) •

سُورَةُ الْبَيِّنَة

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَ الْمُشْرِكِينَ مُنْفَكِّينَ

# سوورەی ( بینە )یە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەوانەی کە بێبڕوابوون لە خاوەن نامە وبت پەرستەکان ، دەستیان هەڵنەگرت (لەو بێبڕوایی‌یە)

---

لە خەوی بێهۆشیی بێدار ببێتەوە ، وە لەژێر پەردەوە تروسکەی ڕۆژی ڕاستیی ببینێ ، ئەهاتن پەندو ئامۆژگاریی ، پڕوپووچانەیان ئەکردن ، وە پەردەی هیچو پووچیان بەسەر چاوو دڵیانا ئەهێنان ، وە پێیان ئەووتن : ئاینێ دوژمنی ژیریی‌و بییرە •

دینە گەورەکان بووبوون بە گاڵتە بەدەست خوێندەوارانی کەنشتەو کڵیسەوە ، بە ئارەزووی خۆیان یاریی‌یان پێئەکردن‌و هەڵیان‌ئەسووڕاندن ، نە گەلێکت ئەدیی لەسەر دینێکی بەڕاستی ، نە کۆمەڵێکت ئەدیی لەسەر ڕێگایەکی خواپەرستیی ، نە دەوڵەتێکت ئەدیی لەسەر بنیاتێکی دادو خواناسی •

خۆشەویستی لە هیچ دڵێکا نەمابوو ، هەر خوێنی مەردوم بوو بە ناڕەوا ئەڕژا، هەر ماڵی ئەم‌وئەوبوو بەخۆڕایی ئەبڕا، ئادەمیی لەم بێدینیی‌و بێبڕوایی‌یە نەئەگەڕایەوە ، وە لەم زۆرو ستەم‌و دەست درێژیی‌یە دوور نەئەکەوتەوە ، مەگەر بە ناردن‌و ڕەوانەکردنی پێغەمبەرێک‌و ئایینێکی تازەو نامەیەک‌و دەستوورو یاسایەکی تازەو معجزەیەکی تازەوە نەبێ ، وەکو ئەفەرموێ (لم یکن الذین کفروا) ئەوانەی بێبڕوابوون (من اهل الکتاب) لە خاوەن نامە (والمشرکین منفکین) وهاوبەش پەیداکەرەکانی عەرەب ، جیانەبوونەوە لەو بێبڕوایی‌یەی کە تێی

حَتَّى تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ(١) يَتْلُوا صُحُفاً مُطَهَّرَةً(٢) فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ(٣) وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ رَسُولٌ مِنَ اللهِ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ(٤)

---

**تا نیشانه ڕوونەکەیان بۆهات(١) (کە ئەویش) پێغەمبەرێکە لە خواوە ئەخوێنێتەوە (بەسەریانا) چەندپەڕەیەکی پاك (کە قورئانە)(٢) کە تیایانایە چەند نامە «سورة» یێکی بەنرخ(٣) وە جیانەبوونەوە ئەوانەی کە نامەیان بۆهاتبوو دوای ئەوە نەبێ کە نیشانە ڕووناکەکەیان بۆهات (کە پێغەمبەری ئیسلامە)(٤) •**

---

**کەوتبوون ( حتی تاتیهم البینة ) تا بەڵگەو نیشانە ڕوونەکەیان بۆ هات ، کە ئەویش (رسول من‌الله) پێغەمبەرێکی خاوەن نامەی ڕەوانەکراو بوو لەلایەن خواوە ، وەك پێغەمبەری ئیسلام بێ ، کە (یتلو صحفا مطهرة) ئەخوێنێتەوە بەسەریانا چەند ڕووپەڕەیەکی پاکی دوور لە هەموو دەستکاریی‌و ڕوبوچێك ، وەك قورئانی پیرۆزبێ ، کە (فیها کتب قیمة) تێیاندایە پوختەو پاڵاوتەی چەند نامەیەکی بەنرخی ئاسمانیی پێغەمبەرانی پێشوو(١) •**

**بەڵێ بە هاتنی پێغەمبەری ئیسلام پەردە لەسەر چاو هەڵگیرا ، شاڕێی ڕاست دەرکەوت ، بڕواو بێبڕوایی لەیەك جیابووەوە ، دروستو نادروست ئاشکرابوو ، ئەوانەی سروشتێکی پاکو دڵودەروونێکی چاکیان بوو ، دوای پێغەمبەر کەوتن ، لە جوولەکەو گاوورو بتپەرست ، وە بڕوایان پێهێنا ، بەڵام زۆرییشیان مانەوە لەسەر ئایینە هیچ‌وپووچەکەی خۆیان ، وە دوای پێغەمبەر نەکەوتن ، وەك دەرئەکەوێ لەم ئایەتەو ەکە ئەفەرموێ (وما تفرق الذین أوتوا الکتاب) ئەوانەی کە خاوەن نامە بوون لە گاوورو جوولەکەکان جیانەبوونەوە لە پێغەمبەرو پشتیان تێ نەکرد (الا من بعد ما جاءتهم البینة) دوای ئەوە نەبێ کە بەڵگەو نیشانە ڕاستەکەیان**

---

(١) یاخۆ ، تێیاندا هەیە چەند نامەیەکی بەنرخ وەك سوورەتەکانی خۆی بێ ، کە هەریەکێکیان نامەیەکی سەربەخۆی تایبەتییە •

وَمَا أُمِرُوا إِلاَّ لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ

**(لەگەڵ ئەمیشە) کە فەرمانیان پێنەدرابوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوابکەن ، لەکاتێکا کە بەدڵ سەری بۆ دابنەوێنن ،**

**بۆهات ، کە پێغەمبەری ئیسلام بوو ، کە لە نامەکانی خۆیانا باسکرابوو ، وە مژدە بە هاتنی درابوو ، واتە هەرکەسێکیتر حەقی ببوایە کە بڕوا بە پێغەمبەر نەهێنێ ، خاوەن نامەکان بەهیچ کلۆجێك حەقیان نەبوو ، چونکە خۆیان لەوەپێش خاوەن پێغەمبەرو نامەو ئاین بوون ، وە هاتنی ئەم پێغەمبەرەیان بەلاوە شتێکی تازە قەتلا نەبوو ، بەڵکو خۆیان ساڵەهای ساڵ بوو چاوەڕوانییان ئەکرد ، کەچی کاتێك کە هات لەپێش بتپەرستەکانا لێیهەڵگەڕانەوە(١) لەگەڵ ئەمیشە (وما امروا) کە ئەو گاوورو جوولەکانە لەلایەن پێغەمبەری ئیسلامەوە هیچ فەرمانێکیان پێنەدرابوو (الا لیعبدوا الله مخلصین له الدین) مەگەر بەوەی کە بەندەییو پەرستشی خوا بکەن ،**

(١) سەیر لەوەدایە ئێستاش کەوا هەزارو چوارسەد ساڵ بەسەر پێغەمبەری ئیسلاما تێپەڕیی ، وە ئایینەکەی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای گرتۆتەوە ، وە بناغەی دەستوورێکی هەمیشەییو تێکڕایی دانا ، بۆ هەموو ئادەمیی ، وە بانگی هەموویانی کرد بۆ بڕواهێنان بە خواو پێغەمبەران وە تا ئێستا بە هەزاران ملیۆن لە غەیری عەرەب مسڵمان بوونو بڕوایان پێهێنا ، وە معجزەیەکی علمی وەك قورئانیشی بەجێهێشت ، کە هەموو ڕۆژێك تازە ئەبێتەوە ، کەچی لەگەڵ ئەمانەشا هێشتا گاوورو جوولەکەکان خۆیان ئێخفال ئەکەن ، وە هەر بەتەمای دواترین پێغەمبەرن ، وە بەلایانەوە وایە کە پێغەمبەری ئیسلام هەر پێغەمبەری عەرەبە ·

لێرەدا ئەڵێین بە خاوەن نامەکان : ئەگەر پێغەمبەری ئیسلام بە پێغەمبەر ئەزانن با هەر بۆ عەرەبیش بێ ، خۆ نابێ پێغەمبەر درۆ بکات ، وە ئەم پێغەمبەرە خۆیو قورئانەکەی فەرموویانە کە پێغەمبەری هەموو جیهانیان ، وە دواترینی هەموو پێغەمبەرانە ، وە ئەگەر هەر بە پێغەمبەریشی نازانن ، چۆن ئەبێ دینی درۆزنێکی نەخوێندەوار، لەدینی هەموو پێغەمبەران بەرزترو جوانترو تەواوتربێ ؟!!!

حُنَفَاءَ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ (٥)
إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ

---

**وە لابدەن لە هەموو بیروباوەڕێکی خوارو خێچ ، وە نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن ، وە ئەمەیە ئایینی ڕاست(٥) ئەوانەی کە بێبڕوابوون لەخاوەن نامەو بتپەرستەکان**

---

**وە بەدڵ سەری بۆ دابنەوێنن ، وە هەموو گوفتارو کرداریکیان هەر بۆ خوا ، وە لە ڕێی خــوادابێ ، وە پاکبێ لە هەمووشتێکی‌تر (حنفاء) لابدەن لە هەمــوو بیرو باوەڕێکی خراپ (ویقیموا الصلاة) وە نوێژی بەهۆش‌وگۆش بکەن (ویؤتوا الزکاة) وە زەکات بدەن‌و دەستگیرۆیی هەژاران‌و لێقەوماوان بکەن (وذلك دین القیمة) وە ئەمەی کە ووترا لە خواپەرستیی‌و نوێژو زەکات ، ئایینی ڕاست‌و دروستە ، واتە ئەمەی کــە پێغەمبەر فەرمانی‌پێدان ، بنیــاتی هەموو ئایینێــکی ئاسمانی‌یە ، وە هەموو لــەم ئەندازەیەدا بەشدارن ، جیاوازی‌یەکیان ئەگەر ببێ لــە لق‌وپۆپایە ، کەوابوو حەق نی‌یە بڵێن : ئەم ئایینە ئەگەڵ ئایینەکەی خۆمانا جیاوازی‌یەکی وای نی‌یە ، چونکە ئەم بێ جیاوازی‌یە حەق وایە ببێ بەهۆی بڕواکردنیان نەك بەهۆی بڕوانەکردنیان •**

**بەڵێ پێغەمبەری ئیسلام دواترینی هەموو پێغەمبەرێکە ، پێش ئەو هەرچەند پێویست ببــوایە ، پێغەمبەرێکی تازە ئەهات بەدینێکی تازەوە ، وە مــەردومی بە ئەندازەیەك ئەگێــڕایەوە لەســەرکێشی ، لەبەرئــەوە هەمیشە هەل لــەدوای هەل هەڵ‌ئەکەوت ، وە ماوەی مەردوم بوو ، کە دوێنێ بەو پێغەمبەرە بڕوای نەبووبێ ، ئەمڕۆ بەمیان بڕوا بێنێ ، بەلام کەپێغەمبەری ئیسلام هات ، وەدەرگای پێغەمبەرێتی دوای ئەو داخرا ، ئیتر ئەو هەلە نەما ، وە ماوە هەڵگیرا ، ئنجا ئەوی مسڵمان ، وە ئەم هەلە بەهرەمەندبوو ، ئەوا بەختی‌یار ، وە باشترینی مەردومە ، وە ئەوی مسڵمانیش نەبوو ، یا مسڵمان بوو ، بەلام بیروباوەڕی گۆڕاو پشتی هەڵکرد ، ئەوا بەدبەخت ، و ەخراپ‌ترینی مەردومە ، وەکو ئەفەرموێ (ان الذین کفروا) ئەوانەی کە بێبڕوابوون بە پێغەمبەری ئیسلام (من اهل الکتاب والمشرکین) لە خاوەن نامەو**

فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ، أُولَئِكَ هُمْ شَرُّ الْبَرِيةِ (٦)
إِنَّ الذِينَ آمَنو وَ عَمِلوُا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيةِ (٧)
جَزَاؤُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَاتُ عَدْنٍ ، تَجْرِى مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ ،
خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ

---

**لە ئاگری دۆزەخــان تیائەمێننەوە بەئێجگاریی ئەوانە خراپترینی هەموو دروست کراوێکن(٦) ئەوانەی کەبڕوایان هێناو کردەوە باشەکانیان کرد ئەوانە چاکترینی هەموو دروستکراوێکن(٧) پاداشی ئەوان لای پەروەردگاریان چەند بەهەشتێکە کە جێی دانیشتنو مانەوەن ، چەند جۆگە ئاو بەژێریانا ئەڕوات ، تیا ئەمێننەوە بەئێجگاریی ، خوا لێیان خۆشنوودبوو ،**

---

**هاوبەش پەیداکــەرەکان بۆ خــوا (في نار جهنــم خالدين فيها) لە ئاگــری دۆزەخا ئەمێننەوە بەئێجــگاریی (اولئك هم شر البرية) ئەوانە خراپترینی هەمــوو دروست کراوێکن ، چونکە ڕێی ڕاستیان دیی‌و بە ئارەزوو لێیان لادا ، وە ڕووناکی‌یان بەدیی‌کردو چاویان لێقووچان ، وە دواترین هەل کە بۆیان هەڵکەوت لە دەستیاندا ، وە بوون بە سەرمەشقی خراپیی بۆ دوای خۆیان ٠**

**لەدوای ئەوەی کە باسی سزای بێبڕوایانی‌کرد ، ئنجا باسی پاداشی چاکان ئەکات ئەفەرموێ (ان الذين آمنوا) ئەوانەی کە بڕوایان هێنا (وعملوا الصالحات) وە کردەوە چاکەکانیان کرد (اولئك هم خير البرية) ئەوانە چاکترینی هەموو دروست کراوێکن ، چونــکە بە دۆزیینــەوەی ڕێی ڕاستو دواکــەوتنی ، ئادەمێتی خۆیان نیشاندا ، وە بــە کردەوەی باش‌و ڕەووشتو خووی چاکیان ، دەســتووری باشی‌و چاکی‌یان ڕاگرت لەناو کۆمەڵەدا ، وە خۆشیان کرد بەسەرمەشقی چاکیی بۆ دوای خۆیان (جزاؤهم عند ربهم) پاداشی ئەوان لای پەروەردگاریان (جنات عدن تجرى من تحتها الانهار) چەند بەهەشتێکە کــە جێی دانیشتنو مانەوەن کە جۆگە ئاوی زۆر بەژێریانا ئەڕوات (خالدين فيها ابدا) تیائەمێننەوە بەئێجگاریی (رضىالله عنهم) خوا لێیان خۆشنوود بوو ، چونکە لە ســنووری شەرع‌و ئایین نەچوونە دەرەوە ، وە لە**

وَرَضُوا عَنْهُ ، ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ (٨)

**وه ئەوان لەو خۆشنوود بوون ، ئەمە بۆ كەسێكە كە لە خوا بترسێ(٨) ٠**

دەستووروو باوی جیهانیی سەرپێچییان نەکرد (ورضوا عنه) وە ئەوانیش لە خوا خۆشنوود بوون ، چونكە تا لە جیهانا بوون بەدڵ ملكەچییان كرد بۆ ئەو شتانەی كە فەرمانیان پێدرابوو ، بێئەوەی كە لەسەر شانو دڵیان قورسو گران بێ ، لەڕۆژی دواییشا ئەمەندە پاداش ئەدرێنەوە كە هەرچی نارەزاییبێ نەیانبێ (ذلك لمن خشی ربه) ئەم خۆشنوودییو پاداشە بۆ كەسێكە ، كە لە پەروەردگاری خۆی بترسێ ، وە لە ترسی ئەو هیچ جۆرە خراپەیەكی نەكردبێ بەڵام ئەوانەی كە بەناو مسڵمانن ، وە بە دیمەن نوێژ ئەكەنو ڕۆژوو ئەگرن ، وە دڵیـان پڕە لە قینو كینەو فیزو ناپاكی لەگەڵ مسڵمانانا ، وە سەری زمانو بنی زمانیان درۆو دەلەسەو بوختانو دووزبانییە ٠ لەگەڵ هەژارانا بەدەعیەو دەمارو ، لەگەڵ گەورەو دەستدارانیشا ، وەك خاك وانە ، وە هەرچی ترسو بیمی خوابێ لەدڵیانا نییە ، ئەوانە بەم پاداشە ناگەن ، وە هەرگیز بەتەمای نەبن ٠

سُورَةُ الزَّلْزَلَة

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا(١) وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا(٢)

---

## سوورەی ( زلزلە )یە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**کاتێك زەویی هاتە لەرزە بە لەرزینی خۆی(١) وە زەویی هەرچی شتی قورسو گرانی (ناوی) هەیە هەمووی فڕێدایە دەرەوە(٢) •**

---

## سوورەی ( زلزلە )یە

**مەدەنی‌یە ، ٨ ئایەتە ، ٣٥ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**زۆر لــە مسلمانەکان لە سەرەتای ئیســلامەتی‌یەوە ، وایان‌ئەزانی کــە خوا تەماشای خێــرو چاکەی کەم نــاکات ، وە پــاداشی لەسەر ناداتــەوە ، وە گوناهی بچکۆلەش ناخوێنێتەوەو ، تۆڵەی لەسەر ناسێنێ ، ئنجا بۆ لابردنی ئەم بیروباوەڕە ئەم سوورەتــە هاتە خوارەوە ، وە تێی گەیــاندن کە چاکەو خراپەو خێــرو گوناه هەرچەند بچووك‌بن ، فەرامۆش ناکرێن ، وە پاداش‌و تۆڵەیان لەسەر ئەدرێتەوە ، فەرمووی (اذا زلزلت الارض زلزالها) کاتێك زەویی لەبەر نەمانی هێزی کێشندە ، یا لەبــەر هەرشتێکی‌تر ، هاتە لــەرزەو جووڵەجووڵ بــە جۆرە لەرزینێــکی‌وا کە شایستەی قورسیی‌و گەورەیی زەوییی‌بێ •**

**دیارە کاتێ کە زەویی لە شوێنی خۆی ترازا ، خۆشی لەیەك ئەترازێ ، وە هەرچی لەناویــابێ دەرئەکەوێ ، وەکو ئەفەرموێ (واخــرجت الارض اثقالها) وە**

وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا ؟(٣) يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا(٤) بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا(٥) يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتاً لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ :(٦)

وە ئادەمیی لەورۆژەدا ئەڵێ : ئەوە زەویی بۆ وایلێهات ؟(٣) لەو ڕۆژەدا (زەویی) دەنگوباسی خۆی ئەگێڕێتەوە(٤) کە پەروەردگاری تۆ (وای) سرووش بۆکردووە(٥) لەوڕۆژەدا مەردومان ئەگەڕێنەوە بەپەراگەندەو پەشێویی تاکردەوەی خۆیان نیشان بدرێ(٦)

---

زەویی هەرچی شتی قورسو گرانی ناویبوو هەمووی فڕێدایە دەرەوە لە کانو نەوتو ئاوو خەزنەو هەزاران شتیتر ٠

وێنەی ئەمە زۆرجار ئەبیەینو ئەبیینین ، کە بوومەلەرزەی بەهێز ، شاخو کێوی لەتکردووە ، وە ئەوی لەناویا بووە ، فڕێیداوەتە دەرەوە ، وەك لە سالی ١٩٠٩م لە ئیتالیا کە بیرێکی ئاگرین لە «ڤیزۆڤ» هەلقولا ، وە شاری «مەسینا»ی بەجارێ قووتدا ، وە زەلامێکی تیانەهێشت ٠

بێگومان لەوحەلەدا ئادەمیی هەموو سەرسام ئەبنو ترسیان لێئەنیشێ ، وە هەرکەسە لەبەرخۆیەوە ئەلێ : ئای ئەمە چیبوو ؟ وەکو ئەفەرموێ (وقال الانسان مالها) ئادەمیی لەو ڕۆژەدا ئەڵێ : ئەوە زەویی بۆ وایبەسەرهات ؟ ، ئنجا (یومئذ) لەوڕۆژەدا کە ئەمانە ڕوویدا ، زەوی بە زبانی حاڵ (تحدث اخبارها) دەنگوباسی خۆی ئەگێڕێتەوە بۆ مەردومو تێیئەگەیەنێ کە ئەم جوولە جوولو ترازانەی ، سەرەتای ڕۆژی دوایی‌و جیهان وێرانبوونە ، وە ئەو چۆنیەتی‌یەی کە بەسەریا دێ ، لەبەر ئەو شتانە نییە کە تا ئێستا خوا دایناوە بۆ وێستانی زەویی ، بەلکو (بان ربك اوحی لها) لەبەرئەوەیە کە پەروەردگاریتۆ وایسرووش بۆکردووە کە وێران بێ ، وە هۆیەکی بۆ ڕەخساندووە ، وەکو نەمانی هێزی کێشندە ، یا لێکەوتنی ئەستێرەیەکی گەورەتربێ لەخۆی ، ئنجا (یومئذ) لەو ڕۆژەدا کە ئەمانە ڕوویدا ، وە ئەم جیهانە ڕێكوپێکە تێكچوو ، دیارە ئەوحەلە ڕۆژی دوایی دەست پێئەکات ، وە جیهانێکیتر دێتە پێشەوە بە خۆیو دەستوورو باوییەوە ، وە هەرچی مردوو هەیە زیندو ئەبنەوە ، هەرکەسە چاوەڕوانیی بەری کردەوەی خۆی ئەکات ، وەکو ئەفەرموێ : لەو ڕۆژەدا (یصدر الناس اشتاتا لیروا اعمالهم) مەردومان ئەگەڕێنەوە

فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً ، يَرَهُ(٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ(٨)

ئنجا هەرکەسێك بەقەد هەرە ووردیلەیەك چاکەی کردبێ ئەیبینێتەوە(٧) وە هەر کەسێك بەقەد هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێ ئەیبینێتەوە(٨)

بە پەشێویی‌و پەرش‌و بڵاویی بۆ ئەوەی کە بەری کردەوەی خۆیان نیشان بدرێ (فمن یعمل مثقال ذرة خیرا ، یره) ئنجا هەرکەسێك بەقەد هەرە ووردیلەیەك چاکەی کردبێ لەجیهانا ، ئەمڕۆ بەرەکەی ئەبینێ ، مسڵمان بێ یا بێ‌بڕوابێ ، واتە چاکەی هیچ کەسێك وون نابێ ، وە هەموو کەسێك لەسەر کردەوەی چاکی خۆی پاداشی ئەدرێتەوە ، با بێ‌بڕواش بێ،وەك لەسوورەی «انبیاء»دا ئەفەرموێ «ونضع الموازین القسط لیوم القیامة فلا تظلم نفس شیئا ، وان کان مثقال حبة من خردل اتینا بها وکفی بنا حاسبین»(١) خولاسە خاوەن نامەیەك سەدهەزار خواپەرستیی بکات لەسەر دینی خۆی بەهرەی لێ‌وەرناگرێ لەڕۆژی دوایی‌دا چونکە بناغەی بڕواکەی تەواو نی‌یە ، بەڵام ئەگەر بۆ خوا وە لەڕێی خوادا دەستگیرویی لێ‌قەوماوێکی کرد ، خوا پاداشی ئەوەی ئەداتەوە •

شێخ محمد عبدە ئەفەرموێ : بەڵام ئەوەندە هەیە چاکەو خێری بێ‌بڕوا هەرچەند قازانجی ببێ بۆ بێ‌بڕواکە ، وە باری گوناهی سووك بکات ، بەڵام گوناهی بێ‌بڕوایی‌یەکەی هەرگیز لانابات ، وە لەسەر ئەم گوناهە زلەی بە ئێجگاریی ئەمێنێتەوە لەسزادا،ئەو ئایەتانەی کە ئەفەرموون خێرو چاکەی بێ‌بڕوا لەناوئەچێ‌و با ئەیبات ، معنای وایە کە لەسزای بێ‌بڕوایی ڕزگاری ناکات ، نەك هەر لێی بەهرەمەند نابێ (ومن یعمل مثقال ذرة شرا ، یره) وە هەرکەسێك بەقەد هەرە ووردیلەیەك بەدیی کردبێ ئەیبی‌نێتەوە ، با مسڵمانیش بێ هیچ شتێك گوناح

(١) واتە ترازووی ڕاست‌و دروست دائەنێین لەڕۆژی دوایی‌دا ، وە هیچ‌کەسێك هیچ جۆرە ستەمێکی لێ‌ناکرێ ، وە ئەگەر (کردەوە) بەقەد دانەی خەرتەلەیەك بێ ئەیهێنیین ، وە تەنیا زانینی ئێمە بەسە بۆ هەموو پرسینەوەیەك •

ناشۆرێتەوە ، تۆبەی بەڕاستیی نەبێ ، هەموو گوناحێکیش وە نەبێ تۆڵەی ئاگری دۆزەخ بێ ، بەڵکو گوناحی گەورەی وا هەیە ئەبێ بە مایەی چوونە دۆزەخ ، وە گوناحی بچکۆڵەی واش هەیە کە ئەبێ بەهۆی نزمیی پایە ، لەچاو یەکێکی‌ترا کە ئەو گوناحەی نەبووبێ ٠

سُورَةَ الْعَادِيَاتِ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمِ

وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحاً(١) فَالْمُورِيَاتِ قَدْحاً(٢) فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحاً(٣)

---

# سوورەی ( عادیات )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند بە ئەسپانی تاودەر (کە ئەپرمێنن) چۆن پرمەیەك(١) وە بە ئاگر هەڵگیرسێنەران لەبەرد بەناڵی سمیان(٢) وە بە (ئەسپانی) هێرشبەران لەبەیانیانا(٣)**

---

# سوورەی ( عادیات )ە

**مەککی‌یە ، ١١ ئایەتە ، ٤٠ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**خوا لەم سوورەتەدا سوێند ئەخوات بەشتێکی گرنگی وا کە نیشانەی زیندوێتی گەل‌و کۆمەڵەیە ، وە هەر گەلێك تا زیندوو تر بێ باشتر پەسەندی ئەکاتو بە تەنگی‌یەوە ئەبێ ، وە تا بێ‌نرخ‌بێ ، بەبێ‌نرخی تەماشا ئەکات ، کە ئەو شتەش سواریی‌و ڕاگرتنی وولاخی چاکە ، ئەفەرموێ (والعاديات ضبحا) سوێند بەو ئەسپانەی کە بەتاو دێن‌و دەچن‌و ئەپرمێنن لەکاتی جەنگ‌کردن لەگەڵ دوژمنانی ئایین‌و نیشتمان (فالموريات قدحا) ئنجا ئاگر هەڵگیرسێنەرن لەکاتی پرتاوا بەناڵ‌و بزماری ژێر سمیان کە بەتوندی لەبەرد ئەکەوێ (فالمغيرات صبحا) وە هەڵمەت‌بەرن**

فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعاً(٤) فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعاً(٥)

که بەوە تەپوتۆز هەڵئەستێنن(٤) وە بەو تەپوتۆزەوە ، خۆیان ئەدەن بەناوەڕاستی کۆمەڵی دوژمنا(٥)

لەدەمەدەمی بەیانیانا بۆ سەر دوژمن (فاثرن به نقا) ئنجا بەو پرتاوو هەڵمەتە لە بەیانیانا تەپو تۆز بەرپا ئەکەن (فوسطن به جمعا) وە بەو تەپوتۆزەوە خۆیان ئەدەن بەناوجەرگەی کۆمەڵی دوژمنا ، وە پەرش‌و بڵاویان ئەکەنەوە •

خـوا سوێندی خوارد بەو ئەسپانەی کە ئەم سیفەتانەیان بێ ، وە ئەم کردەوانەیان کردبێ ، بۆ ئەوەی بەرزیان بکاتەوە لەپێش چاوان،وە خۆشەویستیان بکات لەدڵی مسڵمانانا ، تا هەووڵ بدەن لەمناڵی‌یەوە بۆ ڕاگرتنی ووڵاخی چاک‌و فێربوونی سوارێی‌و بێداریی‌و هەڵمەت‌و شەبەیخوون‌و جەنگ‌کردن لەگەڵ دوژمنانی ئایین‌و ووڵاتـدا ، وە ببن بە قۆڵێکی بەهێزو ئەندامێکی ئیشکـەری بەکەڵک لە کۆمەڵەدا ، وە بتوانن لەرۆژی هێرش‌هێنانی دوژمنا بچن بە گژیانا ، وە بەرهەڵستی زۆرو ستەمیان بوێستن •

لەم ئایەتەوە ، وە لەباسی ئەسپ ، بەتایبەتی لەئایەتی : «واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدوالله وعدوكم/انفال/٦٠»(١) دەرئەکەوێ کە ئاینی ئیسلام تا چ ئەندازەیەك سوارێی‌و ووڵاخ ڕاگرتنی مەبەستە ، وە ئەیەوێ کە گیانێکی وەرزش‌و لاوچاکیی‌و ئازایی‌و ئیشکردن‌و هـەووڵدان‌و کۆڵنەدان لەناو مسڵمانانا بـڵاو ببێتەوە ، وە هەمـوو کەسێك بە خوێندەوارو نەخوێندەوارو پیرو جـوان‌و ژن‌و پیاوەوە ، مەردێکی ئـازای چـالاکی‌ووریای ئیشکەری دانای قاڵی دەرهاتووی نەبەزی جەنگاوەربێ بۆ ڕۆژی ڕەش‌و تەنگانە •

زۆر نەنگ‌و بەدناوی‌یە بۆ گەلێك کە ئەم قورئانە بەرزە ، نامەی ئایینیی‌و سەرمەشقی ڕەووشت‌و خـووی بێ ، کەچی سـواربوونی ووڵاخی بەلاوە شـتێکی بێ‌نرخ‌بێ ، تا هەرچی ووڵاخی ڕەسەنیان بوو بەرەبەرە هەموو ڕۆین بـۆ ووڵاتی

(١) واتە چی‌تان لەدەست دێ ئامادەی بکەن لەچەك‌و لەئەسپی بەستراوەی ڕەسن ، تا دوژمنانی خواتان‌و خۆتانی پێ‌بترسێنن •

إِنَّ الْإِنْسَانَ لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ(٦) وَإِنَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ(٧) وَإِنَّهُ
لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ(٨) أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ(٩)
وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ(١٠) إِنَّ رَبَّهُمْ بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَخَبِيرٌ(١١)

---

**بەڕاستی ئادەمیی بۆ پەروەردگاری ناسوپاسە(٦) وە خۆی لەسەر ئەم ناسوپاسی‌یە ئاگادارە(٧) وە ئادەمیی بۆ خۆشەویستی ماڵی دنیا زۆر بەگیرە(٨) ئایا نازانی کاتێك کە مردووی ناو گۆڕەکان زیندووکرانەوە(٩) وە ئاشکرا بووڕازی ناو دڵان(١٠) بێ‌گومان پەروەردگاریان لەو ڕۆژەدا ئاگادارە بە کردەوەیان(١١)**

---

**بێگانان ، وە خۆیان سواری‌یان ئەبیرچووەوە ، واتە سوێند بەو ئەسپانەی کە باس کران (ان الانسان لربه لکنود) بێ‌گومان ئادەمیی ناسوپاسە بۆ پەروەردگاری خۆی ، لەسەر ئەو بەهرانەی کە پێی داوە ، چونکە بەشی زۆری ئادەمیی لەگەڵ کەوتە خۆشی‌یەوە ، ئیتر ڕابوردووی لەبیر ئەچێتەوە ، وە ئاگای لەپاشەڕۆژ نامێنێ ، نازانێ لەمەولا چی دێتە ڕێی ، تا خۆی لێ‌بپارێزێ ، وە هەروا بە سەرخۆشیی ئەمێنێتەوە ، تا ڕۆژگاری ناهەموار بە سیخورمەی خۆی بێداری ئەکاتەوە لەخەوی بێ‌ئاگایی ئنجا ئەو دەمە ، پڕ بەدڵ پەشیمان ئەبێتەوە ، وە دان بە هەڵەکەی خۆیا ئەنێ ، بەڵام چ سوود ، وەکو ئەفەرموێ (وانه علی ذلك لشهید) وە ئەو لەسەر ئەو ناسوپاسی‌یەی شاهدە ، وە ئەزانێ کە هەڵی لەدەست خۆی داوە (وانه لحب الخیر لشدید) وە ئەو لەخۆشەویستی دنیاو پارە پەیدا کردنا زۆر بەگیرو نووزە درێژە ، کەچی بۆ ئیشی چاکە ناتەوانو بێ‌هێزە (افلا یعلم) ئایا نازانێ ئەو سپڵەی پێ‌نەزانە ؟ (اذا بعثر ما فی القبور) کاتێك کە زیندووکرانەوە مردوی ناو گۆڕەکان (وحصل ما فی الصدور) وە ئاشکرا کرا ڕازی ناو دڵان (ان ربهم بهم یومئذ لخبیر) خوای ئەوان ئاگادارە بە گوفتارو کرداریان ، واتە تۆڵەیان لێ‌ئەسێنێ •**

**ئەم تەعبیرە وەك ئەوە وایە کە بە یەکێك بڵێیت لەڕووی هەڕەشەوە کە ئیشێکی خراپی کردبێ : ئاگام لێتە •**

سُورَةُ الْقَارِعَةِ

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

أَلْقَارِعَةُ(١) مَاالْقَارِعَةُ؟(٢) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ؟(٣)

---

## سوورەی ( قارعه )یه

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ڕۆژی داچڵەکێنەر(١) ئاخۆ چۆن‌بێ ئەو ڕۆژە؟(٢) تۆ چووزانیت ئەو ڕۆژە چی‌یە؟(٣)

---

## سوورەی ( قارعه )یه

**مەککی‌یە ١١ ئایەتە ، ٣١ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

(القارعة) قارعه : ناوێکه لەناوەکانی ڕۆژی قیامەت وەك «حاقة»و «صاعقة»و «طامة»و «غاشية» ، ئەوڕۆژە ناوبراوە بەم‌ناوە چونکە هەرچی دڵ‌هەیە لەوڕۆژەدا تیا دائەچڵەکێ‌و ئەکەوێتە گورپەگورپ ، وەك بکوترێتەوە بەشتێکی ڕەقی قورس یەك لەسەریەك وایە ، واتە ئەو ڕۆژی دوایی‌یەی کە هەرچی دڵ هەیە دای‌ئەخورپێنێ بە شاخەو شریخەی خۆی ، ئنجا بۆ نیشان‌دانی سام‌و گەورەیی ئەو ڕۆژە ، فەرمووی (ما القارعة) ئاخۆ چۆن بێ ئەو ڕۆژە ؟ واتە ئەوەندە بە سامە کەس نازانێ چۆنە ، دووبارە بۆ نیشاندانی گەورەیی ئەو ڕۆژە فەرمووی (وما ادراك ما القارعة) تۆ چووزانییت ئەو ڕۆژە چی‌یە ؟ واتە کەس نازانێ چۆنە تا نەی‌بینێ ، ئنجا باسی

يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ(٤) وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ
الْمَنْفُوشِ(٥) فَأَما مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ(٦) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ(٧)
وَأَما مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ(٨) فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ(٩) وَمَا أَدْرَاكَ مَاهِيَهْ(١٠)
نَارٌ حَامِيَةٌ(١١)

---

ڕۆژێکە مەردومــان وەك پەپوولەی پەراگــەندە بلاوئەبنەوە(٤) وە شــاخەکان وەك خــوریی‌شییکراوەیان لــێ‌دێ(٥) ئنجا ئــەوی کێشی قــورس‌وگران‌بێ(٦) ئەوا ئەو کەسە لەگوزەرانێکی پەسەندا ئەبێ(٧) وە ئەوی کێشی سووك‌بێ(٨) جێی ئــەو «هاویە»یە(٩) تۆ چــووزانییت «هاویــە» چی‌یە؟(١٠) ئاگــرێکی‌هەڵگیرساوە(١١)

---

هێندێك لەچــۆنێتی ئەو ڕۆژەمان بۆ ئەکات ، ئەفەرموێ : ئەو ڕۆژە (يــوم يكون الناس كالفراش المبثوث) ڕۆژێکە مەردوم وەك پەپوولەی پەرش‌وبلاو ، سەرگەردان ئەبن ، نازانن چی‌بکەن ، وە چی‌یان بەسەردێ ، وەك لەئایەتێکی ترا ئەفەرموێ «كانهم جراد منشر»(١) (وتكون الجبال كالعهن المنفوش) وە کێوەکان وەك خوریی شییکراوەیان لێ‌دێ کە بە بایەکی سووك بلاو ئەبێتەوەو ئەچێ بە حەوادا ، دیارە ئەو حەلە سەرەتای ڕۆژی دوایی‌یە ، کە هەموو کەسێك کردەوەی خۆی تیا دێتەوە ڕێ ، وەکو ئەفەرموێ (فاما من ثقلت موازينه) ئنجا ئەو کەسەی کێشانەی قورس‌و گران‌بێ ، وە لە ترازووی ڕێزو مــورك «قەدرو اعتبار»دا سەنگین‌و بەنــرخ بێ (فهو في عيشة راضية) ئەوا ئەو کەسە لەگوزەران‌و ڕابواردنێکی وا خۆشا ئەبێ ، کە خۆی پەسەندی بکات (واما من خفت موازينه) وە ئەو کەسەی کە سەنگ‌و کێشی سووك بێ ، وە لەترازووی ڕێزو مورکــدا بێ‌نرخ بێ (فامه هاويــه) جێگای ئەو «هاویە»یە (وما ادراك ماهية) تۆ چووزانییت «هاویە» چی‌یە ؟ (نار حامية) ئاگرێکی هەڵگیرساوە کە دۆزەخە ٠

ئەم تەعبــیری سووکیی کێشانــەیە ، وەك ئەوە وایە کە بەیەکێــك بڵێیت : فیسار کەس پیاوێکی سەنگین‌و گرانە ، یا عەیارێکی قورس یا سووکی هەیە ، واتە

---

(١) واتە ئەڵێی کوللەی بلاوو پەراگەندەن ٠

ئەگەر کردەوەی شیرینو جوانی لەوانــە بێ بخرێتە تای ترازووەوەو بکێشــرێ قورس دەرئەچێ ، یا سووك دەرئەچێ • هەر لەجیهانا ئەوانەی کە شــەرم لەخواو لەکۆمەڵە نەکــەن ، وە لەهیچ خراپەیەك خۆیان نەگێــڕنەوە ، وە لەهیچ چاکــەو پیاوەتییەکا بەشدار نەبن ، وە شتی پەستیان پێ نەنگ نەبێ ، ئەوانە لەناو مەردوما لەپووش برنج سووکترو بێنرخترن ، ئنجا ئەم جۆرە کەسانە لەڕۆژی دوایی ، وە لەبەر بارەگای خوای گەورەدا ئەبێ چ نرخێکیان بێ ، دیارە گەلێ بێنرخن ، وە هەرچی سەنگینیو گرانیی بێ لەترازووی خوادا نییانە ، قورئان خۆی ئیشارە بۆ ئەم مەعنایە ئەکات لەسوورەی «کهف»دا کە ئەفەرموێ : «فحبطت اعمالهم فلا نقیم لهم یوم القیامة وزنا»(۱) •

ئادەمیی بە ئادەمێتی خۆیەوە لەجیهانا گەلێ جۆرە ترازووی هەیە ، هێندێکیان قورسیو گرانیو ، هێندێکیان ساردییو گەرمیو ، هێندێکیان تەڕییو ووشکیی هەواو ، هێندێکیان بەرزییو نزمیو ، هێندێکیان سستیو خێرایی پێئەکێشرێ ، کەوابوو با لەڕۆژی دواییشا خوا چاکییو خراپییو دڵپاکییو دڵپیسیی مەردوم بە خۆیانو بە ئەندازەی زۆرو کەمییانەوە نیشانی مەردوم بداتو بۆی بکێشێ بەجۆرە کێشانێك کە هەر خوا خۆی ئەزانێ ، ئێمە کە مسلمانین ئەبێ بڕوامان بێ کە بە قەد سەری موویەك چاکەو خراپە لەخوا وون نابێ ، وە هەرکەسێك هەرچێکی بێ لەکردەوەی چــاك یا خراپ ، بەپێی ئەوە ، پاداش ئەدرێتەوە ، وە بەقــەد سەری موویەك ستەمی لێناکرێ •

---

(۱) واتە هەرچی کردەوەیان هەیــە ، هەمووی بــوو بەهیچ ، وە هیچ نــرخو سەنگینییەکیان نادەینێ لەڕۆژی دواییدا •

سُورَةَ التَّكَاثُرُ

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ (١) حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ (٢) كَلاَّ! سَوْفَ
تَعْلَمُونَ (٣) ثُمَّ كَلاَّ! سَوْفَ تَعْلَمُونَ (٤)

## سوورەی ( تکاثر )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئێوەی بێئاگا کردووە شانازیی‌تان بە زۆریی سامانەوە(١) تا ئەمرن و ئەچن بۆ گۆڕستان(٢) وا مەکەن ! لەمەولا تێئەگەن(٣) دووبارە وامەکەن ، لەمەولاتێئەگەن(٤)**

## سوورەی ( تکاثر )ە

**مەککی‌یە ، ٨ ئایەتە ، ٢٨ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(الهاكم التكاثر) ئێوەی خەریك کردووە شانازیی کردنتان بە زۆریی دارایی‌و سامانەوە ، واتە هەموو ئاواتێکتان هەر ئەوەیە کە لەیەکتریی دەوڵەمەند ترو دەست‌دار تر بن ، وە شانازیی پێوە بکەن بەسەر یەکتریی‌دا ، وە ئەمە لایداوون لە خزمەتی تێکڕایی‌و دەست‌پێشکەریی لەچاکەو یارمەتی‌دانا (حتى زرتم المقابر) تا ئەمرن‌و ئەبن بە گۆڕنشیین ، واتە تامردن هەر خەریکی ئەم جۆرە شتانەن ، وە وا ئەزانن کە مەبەس لەژیان ئەوەیە (كلا) وانی‌یە ، بەڵکو مەبەس لەژیان یارمەتی‌و ئیشی باش‌و خزمەت‌کردنە ، ئنجا ئەگەر وا نەکەن (سوف تعلمون) لەمەولا تێئەگەن کە چیتان بەسەردێ .**

**لەبەر ئەوەی کە ئادەمیی لەم ڕووەوە زۆر بێئاگایە ، وە هەوەس‌و ئارەزوو پەردەی هێناوە بەسەر چاوو دڵیا ، بۆیە ئەم ووتارەی دووبارە کردەوە ، فەرمووی (ثم كلا) دیسان ئەڵێم پەشیمان‌بنەوە لەم بێئاگایی‌یە (سوف تعلمون) لەمەولا**

كَلاَّ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ(٥) لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ(٦)

**وانی‌یە (وەکو خـۆتان ئەیـزانن) ئەگەر (ئەنجامی خۆتان) بزانیایـە بەزانینێکی بەڕاستی (وابێ‌ئاگا نەبوون)(٥) بێ‌گومان دۆزەخ ئەبینن(٦)**

تێ‌ئەگەن کە خراپتان کردووە •

ئەم پارەپەرستانە هەرچەند ، یەکێکی خێرخواە بەسەریانابێ‌و ئامۆژگاری‌یان بکات ، وەسەرەنجامی کردەوەکەی خۆیانیان تێ‌بگەیەنێ ، ئەوان وانیشان‌ئەدەن کە ئەمانە هەمـووی ئەزانن ، وە لەوسەری دێنەوە ، ئنجا خوا بەدرۆیـان ئەخاتەوە ، ئەفەرموێ (کلا) وا نی‌یە وەکو خۆتان ئەڵێن ، وە ئەوەی کە ئەیزانن گومانێکەو هیچی تر،ئەویش کاتێك بیرتان ئەکەوێتەوە کە تووشی چورتمێك یا نەخۆشیی‌یەك بن ، یا دۆستێکی خۆشـەویستتان بمرێ‌و لەبەر چاوتان بکرێ بەژێر گڵـەوە ، گومانیش وەك بڵقی سەر ئاو وایە ، بایەخی پێ‌نی‌یە ، چونکە ئەو گومانە تا هەیە پووچە ، کە ئەما ئەبێ بەهیچ ، بەڵام ئەوی کە بایەخی پێ‌ببێ،زانینی ڕاستەقینەیە، ئەو زانینەی کە لەگەڵ بیرو باوەڕا تێکەڵە ، وە لەسەر بناغەو بنیاتە ، مەردوم کە پایەی زانینی گەیشت بەم ئەندازەیە ، ئیتر لغاوی خۆی لەدەست بەرنابێ ، وە لەسـنووری خێرخواهیی‌و خزمەتگوزاریی ، ناچێتـە دەرەوە ، وە لەجیاتی ئـەم ڕژدیی‌و پارەپیسیی‌یە بەخزمەتی تێکڕایی‌یەوە خەریك ئەبێ ، وە سەروماڵی خۆی بەخت ئەکات لەڕێی قازانجی گشتی‌دا،وەکو ئەفەرموێ (لوتعلمون علم‌الیقین) ئەگەر ئەنجامی کاروباری خۆتانتان بزانیایە بەزانینێکی بەڕاستی ، لەپیناوی دنیاداریی‌دا هیچ چاکەیەکتان لەدەست نەئەدا •

ئنجا باسی هێندێك لەئازاری ئەو کەسانەمان بۆ ئەکات لەڕۆژی دوایی‌دا ، ئەفەرموێ (لترون الجحیم) سوێند بەخوا دۆزەخ ئەبینن ئەی بەدکردارینە •

لەبەر ئەوەی کە زۆرکەس خۆی بەمسڵمان ئەزانی ، وە وا ئەزانێ کە بڕوای بەڕۆژی دوایی هەیە ، وە هەمیشە دڵخۆشیی خۆی ئەداتەوە بە لێخۆشبوونی خوا ، چونکە بە ناو مسڵمانە ، با لەهیچ گوناهێکیش نەسڵەمێتەوە،وە هەموو کردەوەیەکی

ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ(٧) ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ(٨)

**دووبارە بەچاوی ڕاستەقینە ئەیبینن(٧) لەپاشا لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو بەهرەیەکتان لێ ئەکرێ(٨)**

**پێچەوانەی فەرموودەی قورئان بێ ، خێرا خوا بیروباوەڕەکەی بردنە دواوە ، بە ووتنەوەی هەڕەشەکەی پێشوو ، فەرمووی (ثم لترونها عين اليقين) سوێند بە خوا دووبارە بەچاوی خۆتان ئەبینن کە ئەچنە دۆزەخەوە ، کەوابوو لەخوا بترسن ، وە لەسنووری مەچنە دەرەوە ، وە ئەو ماڵەی کە بە دەستتانەوەیە ، بەماڵی خوای بزانن ، کە بە سپاردە «امانة» لای داناوون ، بەشی خۆتانو ماڵو منالتانی لێخەرج کەن ، ئەوییکەی تری بەخت بکەن لەخزمەتی خواو هەژارانا •**

**دیسان هەڕەشەیەکی تریان لێ‌ئەکات،ئەفەرموێ(ثم لتسألن يومئذ عن النعيم) سێ‌بارە سوێند بەخوا پرسیارتان لێ‌ئەکرێ لەڕۆژی دواییدا ، لەو دارایی‌یەی کە لە جیهانا شانازیی‌تان پێوە ئەکرد : ئایا چۆنتان دەستکەوتووە ؟ لەڕێی شەرعەوە یا لەڕێی شەیتانەوە؟ وە چۆنتان بەختکردووە؟ لەڕێی خوادا یا لەڕێی ئارەزووی خراپا ؟ ئنجا ئەگەر لەڕێی شەرعەوە پەیدا نەکرابێ ، وە بەپێی فەرموودەی خوا خەرجتان نەکردبێ ، ئەو حەلە خۆشیی‌یەکەیتان لێ ئەبێ بەتاڵاوو زووخاو •**

# سوورەی ( عصر )ە

**مەککی‌یە ، ٣ ئایەتە ، ١٤ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لەهەموو شت بەنرختر لەجیهانا ، کاتە ، چونکە ژیان خۆی هەر زنجییرەیەکە لەکات ، هەر هەناسەیەك کە ڕۆی ، ناگەڕێتەوە کەوابوو هەرچێکی تیا بکـەیت لە کاری بەکەڵك ، بۆت ئەمێنێتەوە ، کە تیاشیا نەکەیت لەکیست ئەچێ ، زۆرجار ئیشکردنێکی کەم ، بووە بەمایەی دەســتکەوتێکی زۆر گــەورە ، یا هەوولدانی یەکێك ، یا چەندکەسێك ، لەچەند دەمێکا ، بووە بەمایەی زیندووبوونەوەی گەلێکی مردوو ، یا بییرکردنەوەی هەڵکەوتوویەك بووە بەمایەی خۆشییو حەسانەوەیەکی هەموو کۆمەڵی ئادەمیی ، لەبەرئەوە کات ، لای مەردومی تێگەیشتووە ، لەهەموو شت بەنرخترو بەڕێز تــرە ، هەمووشتێك ئەگەر قەزاکــردنەوەیەکی ببێ ، کــات هەرگیز قەزا ناکرێتەوە ، هەرساتێکی کە لەدەستچوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە ٠

بەڕاستیی ئەو دەستمایەیەی کە تێکۆشەر کۆیئەکاتەوە لەژیانیا ،کۆمەڵەیەکە لەکات کە ئەبێ بەزێڕ کە ئەگونجێ بۆ هێندێکی تر ببێ بەدووکەڵی جگەرە ، یا بە پرخەی خــەو یا بەیاریی چایخانەکان ، یا بە چەقەو قسەکردنی بێهــوودە ، یا بە گەڕانو هاتوچۆی خۆڕایی ٠

گەلانی خواپێداو ــ چونکە لەمە گەیشتوون ــ یەکهەناسە لەکاتیان لەدەست نادەن ، چونکە بەلایانەوە وایە کە کات وەك ئیکسیر وایە ، مسی قەڵب ئەکات بە زێڕ ، هەژار دەوڵەمەند ئەکاتو نەخوێندەوار ئەکات بەخوێندەوارو هەزاران شتی بەکەڵکی تیا ئەدۆزرێتەوە ، وە هەزاران شتی بەفەڕی تیا دروست ئەکرێ ٠

گەلی بەدبــەختی نەخوێنــدەواریش ، کاتی ، لەتەنەکــەی ژەنگاویی لــەلا بێ‌نرخترە ، بەڵکو بەدوژمنی خۆی ئەزانێ ، وە هەمیشە ئەیەوێ بی‌کوژێ ، لەگەڵ

سورة العصر

بسم الله الرحمن الرحيم

وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ

# سوورەی ( عصر )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**سوێند بەکات(١) ئادەمیی لەزیانایە(٢) مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێ‌و کردەوە باشەکانیان کردبێ ،**

ئەمیشە زۆرکەس جنێو ئەدەن بە کات ، وە وانیشان ئەدەن کە ڕۆژگار خراپە ، وە ئەڵێ ڕۆژی ڕەش ، یا کاتی بەد ، یا ساڵی شووم ، لەگەڵ ئەمیشە کە کات هیچ جۆرە گوناهێکی نی‌یە ، گوناھ ئەگەر ببێ هەر هی خۆمانە ، کە درێغو کۆتاهیی تیا ئەکەین وە بە فیڕۆ لە دەستی ئەدەین ، ئنجا بۆ لابردنی ئەم بیرە ناقۆڵایە وە بۆ دەرمانی ئەم دەردە کوشندەیە ، خوا ویستی بیروهۆشمان ڕاکێشێ بەلای کاتا ، وە نرخێکی زۆری بداتێ ، بەم ڕەنگە سوێندی پێ‌بخوات ، تا تێمان بگەیەنێ کە کات سەرچاوەی هەموو خۆشیی‌و خۆشبەختی‌یەکە ، فەرمووی (والعصر) سوێند بەکات (ان الانسان لفی خسر) هەرچی ئادەمیی گەورەو تەواو هەیە ، کە لە منالیی تێ‌پەڕیی‌بێ ، وە هۆش‌و گۆشی لەجێی خۆی بێ ، لەزەرەرو زیانایە (الا الذین امنوا) مەگەر ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێنابێ (وعملوا الصالحات) وە کردەوە چاکەکانیان کردبێ ، واتە بڕوایان ببێ بەچاکەو خراپە ، وە لەیەکیان جیا بکەنەوە ، وەك لەئایەتێکی ترا فەرمووی «وصدق بالحسنى» وە بزانن کە خوایەکی دادپرس هەیە ، لەکردەوەی چاك خۆشنوودو لەکردەوەی خراپ ناڕازی‌یە ، لەپاشا ئەم بڕوایەیان گەیشتبێتە پایەیەك نەیەڵێ لغاوی هەوەس‌و ئارەزوویان لەدەست

وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ، وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣)

**وە ئامۆژگاریی یەکتری‌یان کردبێ بەئایینی ڕاست ، وە ئامۆژگاریی یەکتری‌یان کردبێ بەخۆڕاگرتن(٣)**

بەربێ ، وە کارێك نەکەن کە ڕێکی بڕوآیان نەبێ ، وە زیان بەکەس نەگەیەنن‌و لە کردەوەی چاك دوا نەکەوون ، وە بەم ڕەنــگە سەرانسەر قازانجبن بۆ خۆیان‌و کەس‌وکارو گەل‌و وولاتیان ، بەڵکو بۆ هەموو ئادەمیی •

هەر لەکردەوەی چاکە ، بانگ‌کردنی مەردوم بۆحەق‌پەرستیی‌و ئامۆژگاری‌یان بۆ ســەبرو خۆڕاگــرتن ، ئنجــا لەبەرئــەوەی کــە ئــەم دوو ڕەووشــتە جوانە ، مایەی هەموو خۆشیی‌و خۆشبەختی‌یەکە ، وە ســەرچاوەی هەموو کارێکی باشــە ، بۆیە بەتایبەتیی ناوی بردن‌و فەرمووی(وتواصوا بالحق)وە ئامۆژگاریی یەکتریی‌یان کردبێ بەگرتنی ڕێی ڕاست‌و دروست (وتوصوا بالصبر) وە ئامۆژگاریی یەکتریی‌یان کردبێ بەخۆڕاگرتن لەبەر هەموو بــارێکی ڕۆژگــارا ، نەخوازەلا ئــەو ئــازارو سزایانەی کە لەڕێگای ئامۆژگاریی‌دا تووشیان ئەبێ ، واتە مەرجی ڕزگاربوون لە زەرەروزیانی هەردو جیهان ، ئەوەیە کە مەردوم ڕاست‌پەرست بێ ، وە لەگوفتارو کرداری ڕاست لانەدات ، وە خاوەنی سەبرو خۆڕاگرتن بێ لەبەرباری ڕۆژگارا ، بەڕەنگێکی وا کە لەترسی خوا لەفەرموودەو فەرمانی ، وە لەدەستوورو باوی نەچێتە دەرەوە ، لەپاشــا ئنجا بــانگی مەردوم بکات بۆ ڕاست‌پەرستی‌و خۆڕاگــرتن ، وە ئامۆژگاری‌یان بکات لەسەر ئەم دوو ڕەووشتە بەرزە ، وە لــەم ڕێگایەدا هەمــوو ئازارو ناخۆشی‌یەك بچەژێ •

لەم ئایەتانــەوە دەرئەکەوێ هــەروەك پێویستە لەسەر مەردوم کــە ڕاست پەرست‌و خاوەن سەبر بێ ، پێویستیشە لەســەری کە ئامۆژگاریی مەردوم بکــات لەسەر حەق‌پەرستیی‌و خۆڕاگرتن لەبەر باری ڕۆزگارا ، وە هەرکەسێك ـ با خۆشی ڕاست پەرست‌و خاوەن سەبربێ ـ کە ئامۆژگاریی مەردوم نەکات لەسەر ئەم دوو ڕەوشتە بەرزە ، هەر زەرەرمەندو ماڵوێرانە •

ئەم سوورەتە بەم کورتی‌یە هەموو کەسێك ئەگرێتەوە ، لە پیاوان‌و ژنانی خاوەن هۆش‌وژیر ، ئنجا پێغەمبەرێتی پێغەمبەری پێ‌گەیشتبێ یا پێی نەگەیشتبێ ، ئەگەر پێی‌گەیشتبێ ، بڕوای پێ‌هێنابێ‌و کردەوەی چاك‌و ئامۆژگاریی مەردومی کردبێ بۆ ڕێی ڕاست‌و خۆڕاگرتن ، کە ئەمە ڕزگاری ئەبێ لە ڕۆژی دوایی‌دا ، یا بڕوای پێ‌نەهێنابێ ، کە ئەمە ڕزگاری نابێ ، وە ئەگەر پێشی نەگەیشتبێ ، بڕوای ببێ بە چاکەو خراپەو لەیەکیان جیابکاتەوە بە سروشت ، کە ئەمەش ڕزگاری ئەبێ ، یا بڕوای پێ‌نەبێ‌و لە خراپە خۆی نەگێڕابێتەوە ، کە ئەمەش ڕزگاری نابێ •

ئنجا تەماشاکەن گەلێك ئەگەر هەموو کەسێکی خاوەنی هەموو کردەوەیەکی باش‌و ، ڕاست‌پەرست‌و ، خاوەن سەبربێ ، وە هەموو لایەکیان بۆ یەکتریی لەلەو ئامۆژگارێکی دلسۆزبن ، وە بە هەموو زبانێك خەریکی ئەوەبن ئەگەر یەکێکیان لایدا ، لە ڕێی ڕاست ، بی‌هێننەوە سەر ڕێ ، ئنجا ئەگەر گەلێك وابێ ، ئەبێ چ گەلێکی نموونەیی «مثالی» بەرزو بێ‌هاوتابێ لەجیهانا •

ئەگێڕنەوە ئەڵێن هەرچەند دوان لە هاوڕێکان «اصحاب»ی پێغەمبەر بەیەك بگەیشتنایە ، دەستیان ئەنایە ناودەستی یەکەوە ، وە ئەم سوورەتەیان بەسەریەکا ئەخوێندەوە ، وە پەیمانیان لەسەر بەجێ‌هێنانی فەرموودەی ئەم سوورەتە تازە ئەکردەوە ، ئنجا جیائەبوونەوە •

# سوورەی ( همزه )یە

مەککی‌یە ، ٩ ئایەتە ، ٣٠ ووتەیە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتــە وێنەیــەکی تایبەتییمــان نیشــان ئــەدات ، کــە لەسەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە زۆربووە ، کە ئەویش وێنەی ناکەسی ، پەستی ، بێ‌نرخە ، کە پارەو دارایی بەلاوە هەمووشتێکە ، وە لەگەڵ پارەدا هیچ نەنگێك لەلای نانوێنێ ، هەروەك لەگەڵ هەژاریی‌دا هیچ بەهرەو جەوهەرێك لای دەرناکەوێ ٠

ئەم جۆرە کەسانە ، پێ‌یان وایە ، کە پارە خوایە،لەگەڵبووی ئەتوانێ هەموو شتێکی پێ‌بکات ، مردنی پێ‌بگێڕێتەوەو سەرنقیشت «قضاء وقدر»ی پێ بباتە دواوە، بەڵکو پارەو دارایی بەلاوە ، گەزێکە ، کە ئەبێ هەمووشتێك هەر بەو بپێورێ،لەبەر ئەوە هەمیشە بەکۆکردنەوەو ژماردنی‌یەوە خەریکە تا زۆر ئەبێ ، کە لەگەڵ زۆر بوو ، ئیتر پلە بەپلە خۆی بەلاوە گەورە ئەبێ‌و بەرزئەبێتەوە ، وە مەردومی لەلا بچووك ئەبێ‌و نزم‌ئەبێتەوە ، ئنجا هەموو کەسێکی بەسووکو بێ‌نرخ دێتە پێش‌چاو، وە گاڵتەیان پێ‌ئەکات ، بەدەم، یا بەدەست ، یا بەسەر ، یا بەچاو ، یا بەزبان ، کە ئەم وێنەیە هەموو ڕۆژ ، وە لە هەموو شوێنێك ڕووئەداو دووبارەبات ئەبێتەوە ، لەبەرئەوەی کە ئیسلام شتی پەستی نامەردانەی زۆر پێ‌ناخۆشــە ، لــەزۆر شوێن قورئان جڵەوگیــریی ئەکات لە گاڵتەکردن بــە مەردوم ، بەڵام هیچیــان وەك ئێرە توندو تییــژو قــورس‌و گــران نی‌یــە ، ئــەبێ شتێك بــووبێ لەلایــەن هاوبەش پەیداکەرەکانەوە بەرانبەر بەپێغەمبەرو مسلمانان کەوا بەم جۆرە ئەدا بە دەمیانا،

سُورَةُ الهُمَزَة

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم

وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ(١) أَلَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ(٢) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ(٣) كلاَّ! لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ(٤) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةِ؟(٥) نَارُ اللهِ الْمُوقَدَةُ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الأَفْئِدَةِ(٧)

# سوورەی ( همزه )یە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سزاو لەناوچوون بۆ هەموو نەنگ‌گرێـکی بەدگۆ(١) ئەوەی کە هەر دارایی تۆنەکاتەوەو ئەیژمێرێ(٢) وائەزانێ کە دارایی‌یەکەی هەر ئەیهێڵێتەوە(٣) با وا نەزانێ ، بێ‌گومان فرێ‌ئەدرێتە ناو ئاگرێکی تێشکێنەرەوە(٤) تۆ چووزانییت ئەو ئاگرە چی‌یە ؟(٥) ئاگرێـی هەڵگیرسـێنراوی خوایی‌یە(٦) کە دێ بەسەر دڵانا(٧)

وە هەڕەشەیان ئێ‌ئەکات ئەفەرموێ (ویل لکل همزة لمزة) سزاو لەناوچوون بۆ ئەو کەسانەی کە نـاوی مەردوم ئەبەن بەخراپە ، وە هەووڵ ئەدەن بـۆ سووک‌کردنو ریسواکردنیان بەدەم ، یا بەدەست ، یا بەسەر ، یا بەزبان ، کە ئەمەش ڕەووشتی (الذي جمع مالا وعدده) ئەوکەسەیە کە هەمیشە خەریکی کۆکردنەوەی دارایی‌و ژماردنیەتی ، واتـە ئەوانەی کە ناوی مەردوم ئەبەن ، کەسانێکن کـە دەوڵەمەندو پارەدارن ، وە لەبەر دەوڵەتو دارایی خۆیان ، کەس بەهیچ نازانن ، وە گاڵتە بەمو بەو ئەکەن ، وە هەرگیز لە مردنو ڕۆژی دوایی ناترسن ، چونکە پارە مردنی لەبیر بردوونەتەوە (یحسب ان ماله اخلده) وائەزانێ کە دارایی‌یەکەی نایەڵێ بمرێ ، وە هەر ئەیهێڵێتەوە بەئێجگاریی (کلا) با وانەزانێ (لینبذن في الحطمة) بەڕاستیی فرێ ئەدرێتە ناو ئاگرێکی بەتینی تێ‌شکێنەرەوە (وما ادراك ماالحطمة) تۆ چووزانییت کە ئەو ئاگـرە چۆنە ؟ واتە ئەمەندە بەتیـنو تەووژمە هەرچێکی تێ‌کـەوت تێکی ئەهاڕێ ، ئنجـا بـاسی ئاگـرەکە ئەکات ، ئەفەرمـوێ (نارالله الموقـدة) ئاگرێکی هەڵگیرسێنراوی خوایی‌یە (التی تطلع علی الافئدة) کە هورووژم ئەباتە سەر دڵان ،

إنهَا علَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ(٨) فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ(٩)

**بێ‌گومان ئــەو ئاگرە داخــراوە لەسەریــان (و دەرچوونیان نی‌یــە)(٨) (پابەندن) لەناو چەنــد کۆتێکی ڕاکشاوا(٩) •**

**واتە جێگای بیروباوەڕی پیس‌و خراپیان ئەسووتێنێ (انها علیهم مؤصدة) بێ‌گومان ئەو ئاگرە دەورەیان ئەداو ، دایان‌ئەگرێ لە هەمــوو لایەکەوە بەڕەنگێکی‌وا ، کە ڕێی دەرچوونیان نەبێ ، لەگەڵ ئەمیشە کە هەموو ئەبەسترێنەوە (في عمد ممدة) لەناو چەند کۆتێکی قورسی درێژی ڕاکشاوا •**

# سوورەی ( فیـل )ە

مەككی‌یە ، ٥ ئایەتە ، ٣٠ ووتەیە

بسم الله الرحمن الرحيم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

دەملاودەم وەرگیراوە كە «ئەبرەهە»ی حەبەشیی ، سەرۆكی لەشكری یەمەن ، دوای‌ئەوەی كـە دەوڵەتی حەبەشە ، یەمەنی گرتو دەوڵەتی فـارسی لێ‌دەركرد ، كەنیسەیەكی گەورەی دروستكرد لە «صنعاء» بۆ ئەوەی كە لەوەولا حەجی لێ‌بكرێ ، وە ویستی «كعبە» بروخێنێ تا جارێكی‌تر كەس نەچێ بۆ مەككە بۆ حەجكردن ، بە خۆی‌و لەشكرێكی زۆر گەورەوە چووە سەر شاری مەككە ، وە بۆ ترس‌و سام چەند فیلێكی پێش لەشكرەكەی خۆی‌خست ، تا هاتنە نزیك مەككە ، لەوێ لەشكرەكەی بڵاوبوونەوە ، وە هەرچی حوشترو ئاژاڵی مەككە بوو هەموویان برد ــ كە دووسەد سەری ــ عبدالمطلبی باپـیری پێغەمبەری تیابوو ، «ئەبرەهە» پیاوی نارد بـۆ لای گەورەكانی مەككە كـە من بۆ جـەنگ نەهاتووم لەگـەڵ ئەوانا ، بەڵكو هـەر بۆ ڕووخاندنی «كعبە» هاتووم ، وە بەتایبەتی عبدالمطلبی دی‌و پێ‌ی‌ووت ، ئەمیش ووتی : ئێمە دەرەقەتی ئەم لەشكرە نایەین، وەجەنگی لەگەڵ ناكەین، وە عبدالمطلب لەگەڵ فرستادەكەی ئەبرەهەدا چوو بۆ لای ئەبرەهە بۆ تكای حوشترەكانی خۆی ، عبدالمطلب پیاوێـكی زۆر جوان‌و بەسەروســیما بووە ، كە ئەبرەهــە ئەی‌بینێ زۆر حورمەتی ئەگـرێ ، لەپاشا لێ‌ی‌ئەپـرسێ ئیشت چی‌یە ؟ ئەمیش ئـەڵێ دووسەد حوشترم بـراوە هاتووم كە بم‌دەنەوە ، ئەویش ئەڵێ تۆ تكا بۆ حوشـترەكانی خۆت ئەكەیت‌و بۆ كعبەی ناكەیت كە مایەی شانازیتانە ؟ ئەمیش ئەڵێ : من هەر خاوەنی حوشترەكانی خـۆمم ، بەڵام كعبـە خاوەنی خـۆی هەیە كە ئەیپـارێزێ ، ئەبرەهە حوشترەكانی ئەداتەوە ، عبدالمطلب كە ئەگەڕێتەوە بە دانیشتووانی مەككە ئەڵێ : لەشار بچنە دەرەوە بابزانین خوا چی‌ئەكات ، خەڵقی مەككە هەموو لەترسانا شار بەجێ‌دێڵن ، وە ئەدەنە شاخەكانی مەككە ، لە ڕۆژی دوایی‌دا بە فەرمانی خوا دەردی

سُورَة الْفِيل

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابَ الْفِيلِ؟!(١)

# سوورەی ( فیــل )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئایا نەتدیی کە پەروەردگاریتۆ چیکرد بەخاوەن فیلەکان؟!(١)**

ئاولە ئەکەوێتە ناو لەشکرەکەی ئەبرەههوە ، وە هەرچی لەشیان هەیە بەرە بەرە دائەوەشێ ، وە پارچە پارچە ئەکەوێتە خوارەوە ، لەشکرەکە بەرودوا دەستئەکات بەگەڕانەوەو لێمردن ، تا ئەبرەهە خۆشی تووش ئەبێ ، وە لە «صنعاء» ئەمرێ(١) ، ئنجا بــەم سوورەتە ئەم سەرگوروشــتەمان بۆ ئەگێڕێتــەوە ، تا پێغەمبەرو هەموو مسڵمانان تێبگەن ، کە خوا لە هەمووکەسێك گەورەترو بەدەسەڵاتترە ، وە ئەتوانێ لە شەوڕۆژێکا هەزاران زۆردارو ستەمکار سەرەنگــرێ بکاتو ، لەناویان ببات ، ئەفەرموێ (الم‌تر کیف فعل ربك باصحاب الفیل) ئایا نازانییت کە پەروەردگاری تۆ چیکرد بەخاوەن فیلەکان ؟ وەك «ئەبرەهە»و لەشــکرەکەی بێ ، واتە بــەڵێ ئەیزانییت ، چونکە هەرچەندە خۆت بییرت نایەت ، بەڵام سەرگورشتەیەکی زۆر

(١) لە کتێبی «معجم القرآن» ، نووسراوی عبدالرؤفی مصری ، چاپی دووهەم لە چاپخانەی حجازی ، لەقاهرە ئەڵێ مێژوونووسی رووومانیی «پرۆکۆپیوس»PROCOPE کە لەسالی ٥٠٠م دا لەدایك بووە ــ ئەڵێ : یەکەم ئاولە کە پەیدابوو لەمصر لــە سالی ٥٥٤م دابوو ، کەئەو حەلە مصر بەدەست دەوڵەتی روومانەوە بوو ، لەساڵی ١٥٦٩ ئەو میکرۆبە پیسانە گەیشتنە شاری قسطنطینیە ، کە هەر ئەو ساڵەش ئاولە بڵاوبووەوە لەناو لەشکری ئەبرەههدا .

مێژوونووسەکانی عەرەب ئەڵێن : ئەمە یەکەم ئاولــەیە کە لەعەرەبســتان پەیدابووە .

أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ؟!(٢) وَ أَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ(٣) تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ(٤) فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ(٥)

---

ئایافڕوفێڵەکەیانی بەهیچ دەرنەکرد؟!(٢) وەناردیبەسەریان باڵندەی زۆر پۆلپۆل(٣) تێیانئەگرتن وورده زیخی گڵیین(٤) ئنجا وەك کای خوراوی لێکردن(٥)

---

بەناوبانگـە ، بەڕەنگێکی وا کە کراوە بەسـەرەتای مێژوو ، وە لـەو کەسـانەت بیستوون کە خۆیان دییویانە (الم يجعل كيدهم في تضليل) ئایا خوا فڕوفێڵەکانیانی بەهیچ دەرنەکرد ؟ واتە بەڵێ هەموو ئەزانن کە خوا چۆنی لەناوبردن ، ئنجا باسی لەناوبردنەکەیان ئەکات ، ئەفەرموێ (وارسـل عليهم طيرا ابابيل) پۆلپۆل باڵندەی زۆری نارده سەریان (ترميهم بحجارة من سجيل) وورده گلمتکی ڕەقی تێئەگرتن (فجعلهم كعصف ماكول) تا کردنی بە وێنەی کای خوراو کە کرمو مۆرانە تێیبداتو ڕێزەرێزەی بکات •

خوای گەورە هـەزاران هەزار لەشکری هەیە لەمێشـو مێشوولەو گـەلێ جانەوەرو باڵندەیتر ، لەوانەی کە بەچاو ببینرێن یا نەبینرێن ـ بۆ نەخۆشخستن یا لەناوبردنی ئەوکەسانەی کە خوا بییـەوێ ، وەك قورئان ئەفەرموێ «وما يعلم جنود ربـك الا هو»(١) المدثـر/٣١ • بەم ڕەنـگە بەهۆی باوە میکـرۆبی دەردێك هەڵئەگرێ لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر ، وەیا بەهۆی قاچوقولو پەڕوباڵی مێشو مێشوولەوە ، ئەیانگـەیەنێ بـە شوێنی خـۆی ، وەك لە ئایەتێـکیترا ئەفەرموێ «وارسلنا عليهم ريحا وجنودا لم تروها»(٢) احزاب/٩ •

شێخ محمد عبده «ڕەزای خوای لێبێ» ئەفەرموێ : ئەم سوورەتە نیشانمان ئەدات کە ئەو ئاوڵەیە ، پەیدا بووە بەهۆی خاكوخۆڵێکەوە کە کەوتووە بەسەر ئەو

---

(١) واتە ئاگای لە لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نییە خوا خۆی نەبێ •

(٢) واتە ناردمانە سەریان باو لەشکرێك کە تۆ نەت ئەبینی •

لەشکرەدا ، بەهۆی چەند پۆلە باڵندەیەکەوە کە خوا لەگەڵ بـادا ناردوونی ، هیچ دوورنی‌یە کە خوای گەورە بەپێی دەستوورو یاوێك کە داینـاوە لەجیهانا ، باو گێژەڵووکە خاكو خۆڵی پیسی میکرۆباویی ، بەمیکرۆبی ئاوڵەی بردبێ بەئاسمانا وە بەهۆی ئـەو باڵندانەوە گەیشتبێ بەجەستەو ئەندامی ئەو لەشـکرە ، هەروەك هەمیشە بەچاو خۆمان نموونەی ئەم جۆرە شتانە ئەبینین •

لەئاهەنـگی ئەمسوورەتەوە وا دەرئەکـەوێ کە خوای گـەورە بەتایبـەتی ویستوویەتی چاودێریی کعبەو خانەی خۆی بکات ، وە بی‌پارێزێ لەدەست زۆرداری ستەمکار ، تا ببێ بە بەست بۆ مەردوم ، وە بەشوێن هەڵقوڵینی سەرچاوەی پاکی ئایینی ئیسلامو ، دەرکەوتنی دواترینی پێغەمبەران ، بۆیە وا بە ئاشکرا وە بەبێ پەردە هێزو دەسەڵاتی خوای گەورە هاتەڕوو ، وە لەشکرێکی نهێنی خۆی ناردە سەر ئەوانەی کە بەناڕەوا ، چوونە سـەر مەککە بۆ ڕووخاندنی ، ئـەو کعبەیەی کە باوەگەورەی پێغەمبەران : ابراهیمی خلیل دروستی کرد ، لەگەڵ اسماعیلی کوڕیا ، بە فەرمانی خوا ، بۆ ئەوەی کە ببێ بەمایـەی دڵنیاییو ئاسایشی مەردوم ، ئەگینا ئەگەر وانی‌یە بۆچی بەتایبەتیی لەو حەلەدا ئەم باڵندانە ئەنێرێ بە میکـرۆبی ئاوڵەوە ، وە بە تایبەتیی لەو شوێنەدا ئەیدا بەسەر ئەو لەشکرەدا ، بەڕەنگێکی وا کە هەموو تووشی ئەو دەردە ببن زۆر بەقورسییو گرانی ، وە بەجۆرێکی وا کە هەموو ئەندامیان بکەوێتە خوارەوە ، بێ‌ئەوەی یـەکێکی تر لەدانیشتووانی ئـەو ناوچەو مەڵبەندە تووشی ئەو دەردە ببن •

وا بڵاوە کە پێغەمبەر دوای ئەو ڕووداوە ، بە هەشتمانگ لەدایك بووە واتە لەکاتی ئەو ڕووداوەدا پێغەمبەر لەسکی دایکیا بووە ، وە بە دەستەوە بووە کە بەو زووانە ڕۆژی ڕوونـاکی پـڕ لەخۆشییو خۆشبـەختییو فاڵی پڕ لـە خێروفەڕی هەڵبێ لـە دانیشـتووانی سـەرزەویی • ئـەو پێغەمبـەرەی کە بـاوە گەورەی پێغەمبەران حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل ـ دوای دروستکردنی کعبە ـ بەئایەتی : «ربنا وابعث فیهم رسولا منهم یتلوا علیهم ایاتك ویعلمهم الکتاب والحکمة ویزکیهم انك انت العزیز الحکیم» پاڕاوەتەوە لەخوا کە پێغەمبەرێکی خاوەن نامە بنێرێ لەناو

نەوەکانیا کە لەدەوروبەری کعبە ئەکەونەوە •

بەڵێ خوا بەنزای ئیبراهیم‌و ئیسماعیل دوای هەزاران ساڵ حەزرەتی محمدی نارد لەشــاری مەککــە ، وە لەنــەوەی ئیبراهیم‌و ئیســماعیل ، ئنجا چــۆن ئەبێ پێغەمبەرێکی وا گەورەو خاوەن پایەوشکۆهـ بەم ناووداوەوە بێت ، ورحمة للعالمین بێ ـ بەم جۆرە پێشوازیی بکرێ ، کە لەشکــرێکی بێدینی بێبڕوای هاوبەشــ پەیداکەر «مشرك» بێ بەسەر ئەو شارەی کە کعبەی تیایە،وە دواترینی پێغەمبەرانی بەو زووانە تیا لەدایك ئەبێ ؟! وێرانی بکاتو کەعبە بڕوخێنێ ؟!! •

کەواتە ئەم ڕووداوە ، خۆڕایی نەبووە ، خوا بەم ســوورەتە ، منەت ئەنێ بەسەر قورەیشا کە لەکاتی زەبوونیی‌و بێدەســەڵاتی‌یانا ، وە لەوەختێکا کە نەیان توانییوە بەرانبەری لەشکری ئەبرەهە بکەن ، خوا لەسەری هەڵدانێ‌و کعبەی بــۆ پاراستن ، کەوابوو ئەبوایە ئەوانیش لەسوپاسی ئەم میهرەبانی‌یەدا ، ئەمڕۆ بڕوایان بێنایە بە پێغەمبەرەکەی خواو بە ئایینەکەی ، ئایا نازانن ئەو خوایەی کە دوێنێ ئەو لەشکرە بەهێزەی لەناوبرد ، ئەمڕۆش ئەوانەی کە بەرانبەری پێغەمبەرو ئایینەکەی بوێستن لەناویان ئەبات •

# سووڕەی ( قریش )ە

مەککی‌یە ، ٤ ئایەتە ، ١٧ ووتەیە

## بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

دوای ئەوەی کە ابراهیمی خلیل بەفەرمانی خوا کعبەی دروستکرد ، وە دەوروبەری پاك کردەوە بۆ خواپەرستان ـ لەخوا پاڕایەوە کە ئەو شوێنە بکات بە شارێکی پڕ لەئاسایش‌و دڵنیایی ، وە ڕۆژیی خۆی برێـژێ بەسەریانا فەرمووی «رب اجعل هذا بلدا امنا وارزق اهله من الثمرات» بقرە/١٢٥ • واتە خوایە ئەم شوێنە بکە بەشارێکی پـڕ لەئاسایش‌و دڵنیایی ، وە ڕۆژیی دانیشتووانی بدە لـە میوەهات‌و هەموو جۆرە خواردەمەنی‌یەك •

خوا نزاکەی گیراکرد ، وە مەککەی پاراست لەهەموو زۆرو ستەمێك ، لەبەر ئەوە خێڵی قورەیش ـ کە لە مەککـە ، دائەنیشتن ـ دوو ڕێی بازرگـانی زۆر گرنگیان کردەوە ، یەکێکیان لەزستانانا بۆ یەمەن‌و ئەویتریان لەهاویننانا بۆ شام ، لەم سەفەرانەدا شتی خۆیان ئەبرد بۆ ئەو شوێننانە ،ئەیانفرۆشت ، لەوسەرییشەوە گەلێ شـتیان ئەهێنایـەوە بـۆ مەککـە بە قـازانج ئەیـانفرۆشت ، بـەم ڕەنگە بازرگانیی مەککەیان ڕاگرتبوو ، لەو حەلەدا هەرچەند هـۆزی عەرەب ژیانیـان لەسەر تالان‌و بـڕۆبوو ، وە کەسـ لەسەروماڵی خۆی دڵنیا نەبـوو ، بەڵام کەس دەستدرێژیی بۆ خێڵی قورەیش نەئەکرد ، چونکە دانیشتووی شاری مەککە ، وە دراوسێی خانەی خـوابوون ، وە حورمەتی کعبە بۆ ئـەوان بووبوو بەقەڵغـان‌و سوپەر ، ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوانیش نەیان‌ئەتوانی ئەو هاتووچۆیە بکەن ، وە ئەبوو هەرکەسە لەماڵی خۆی دابنیشتایە تا ئەمرد لەبرسانا ، چونکە ووڵاتەکەیان ووڵاتی کشت‌وکاڵ‌و پیشەسازیی نەبوو ، وە شتی وایان نەبـوو کە مەردوم لـە دوورەوە بۆی بچن ، وە لەکونی ژوورەوە بی‌یان‌دۆزنەوەو شتیان لێ‌بکڕن ، بەڵام لەسایی ڕێز «حورمەت»ی کعبەوە ، ئەوان بۆ خۆیان ئەهاتن‌و ئەچوون بەبێ‌ترس‌و

سُورَة القریش

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِیم

لِإِیلاَفِ قُرَیْشٍ(١) إِیلاَفِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّیْفِ(٢) فَلْیَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَیْتِ(٣) أَلَّذِی أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ

# سوورەی ( قریش )ە

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(لەشکری ئەبرەهەی لەناوبرد) لەبەر هۆگریی قورەیش(١) هۆگرییان بەهاتوچۆی زستانانو هاوینانەوە(تا لێیان تێکنەچێ)(٢)باپەرستشی خاوەنی ئەم خانە«کعبە»یە بکەن(٣) ئەو خوایەی کە لەبرسێتیدا خواردەمەنی بۆ ناردنو**

**بییم ، نەخوازەلا دوای ئەوەی کە ئەبرەهەو لەشکرەکەشی نەیانتوانی دەستدرێژیی بکەن بۆ کعبە ، وە هەموو بە شپرزەیی گەڕانەوەو قڕبوون ، وە ئەم قڕکردنەش بۆ ئەوە بوو کە ڕێزی کعبە لەشوێنی خۆی بمێنێ ، وە قورەیش ئەم هاتوچۆیەیان لێ‌تێك نەچێ تا دواترین پێغەمبەر ــ کە لە خێڵی قورەیشە ــ دێتە جیهان ، وە ئاگاداریی کعبە ئەکات وەکو ئەفەرموێ : لەشکری ئەبرەهەمان لەناوبرد (لایلاف قریش) لەبەر هۆگریی قورەیش (ایلافهم رحلة الشتاء والصیف) هۆگرییان بە هاتوچۆی زستانان بۆیەمەنو هاوینان بۆ شام ، واتە تا ڕێزی کعبە پایەداربێ ، وە ئەوان لەو ڕێزە بەهرەمەندبن ، وە بتوانن بەبێ‌ترس بێنو بچنو پێ‌بژییوی خۆیان پەیدا بکەن (فلیعبدوا رب هذا البیت) جا کەوابوو با لەسوپاسی ئەم میهرەبانی‌یەدا خاوەنی ئەم خانەیە ــ کە خوایە ــ بپەرستن (الذی اطعمهم من جوع) ئەو خوایەی کە بەهۆی ئەو بازرگانی‌یەوە خواردەمەنی دانێ ، وە لەبرسێتی تێری‌کردن ، واتە ئەگەر کعبە نەبوایە لەبەر کرێنیی شوێنەکەیانو ڕاووڕووتی ناوخۆیان ، ئەبوو**

وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ(٤)

**لەترس ، دڵنیای کردن(٤)**

هەمیشە ڕەش‌وڕووت‌و برسی بوونایە ، بەڵام خوا بەسایی کعبەوە ڕۆژیی خـۆی ڕشت بەسەریانا (وامنهم من خوف) وە دڵنیای کردن لەترس‌و دەست‌درێژیی پیـاو خراپان ، واتە بەسایی خانەی خواوە کەوتنە ئاسایش‌و دڵنیایی‌یەوە ، بە ڕەنگێکی وا کە بێ‌ترس بەهەموو عەرەبستانا بگەڕێن ، وە کاروانیان هاتوچۆ بکات بۆ شام‌و یەمەن ، بێ‌ئەوەی یەکێك ڕێگایان پێ‌بگرێ ، یا دەست‌درێژی‌یان بۆ بکات ، کەواتە با شەرم بکەن لەخاوەنی ئـەم کعبەیەی کە ئەم میهـرەبانی‌یە گەورەیەی لەگـەڵ کردوون ، وە با هەر ئەو بپەرستن‌و هاواری لێ‌بکەن ، وە ئیتر ئەو بتە تاشراوە بێ‌گیانانە نەپەرستن کە بەدەستی خۆیان دروستی ئەکەن ، وە هەرچی قازانج بێ نی‌یانـە ٠

سُورَةُ الْمَاعُونْ
بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم
أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ(١)

## سوورەی ( ماعون )ە

ئایا دییت ئەوکەسەی کە بڕوای بەئایین نی‌یە ؟(١) ٠

## سوورەی ( ماعون )ە

**مەککی‌یە ، ٧ ئایەتە ، ٢٥ ووتەیە**

## بسم‌الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**لە هەموو کاتێکا زۆری واهەن کە نوێژ ئەکەن‌و ڕۆژوو ئەگرن‌و هێندێك خوا پەرستیی‌وا ئەکەن کە پارەی تێ‌ناچێ ، لەبەرئەوە خۆیان بە خاوەنی ئایین ئەزانن ، وە وائەزانن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی هەیە ، لەگەڵ ئەمیشە کە ئەو بیروبڕوایە هەرچی بەربێ نی‌یەتی ، بەڵکو ئەگەر بیشی‌بێ بەری پیس‌و خراپ ئەگرێ ، نابینییت بەشی زۆری نوێژکەران لەسەر شتی هیچ‌وپووچ ئەکەونە کێشەی بەربەرەکانی ، یا زۆرداریان ، زەبوون قووت‌ئەداتو ، دەوڵەمەندیان خوێنی هەژار ئەمژێ ، دەستداریان بەزەیی بەهەتیوان‌و لێقەوماوانا نایەتەوەو ، تیریان ئاگای لەبرسی نی‌یە ، ئنجا خوا ویستی تێ‌یان بگەیەنێ ، کە کێ بڕوای بە ئایین نی‌یە ، کە لەمەشەوە دەرئەکەوێ ، کەکێش خاوەنی بڕواو ئایینە ، فەرمووی (ارأيت الذي يكذب بالدين)(١) ئایا زانییوتەو ناسییوتە ئەوکەسەی کە بڕوای بە ئایین**

---

(١) دین : بڕوایەکی پاك‌و تەمییزە بەخواو ڕۆژی دوایی‌و پرسیینەوەو بەهەشت‌و دۆزەخ ، بەجۆرێکی‌وا کە مەردوم ڕابگرێ لە سنووری خۆی ، وە نەیەڵێ مووبەیەك لابدات ، وە لەهەموو گوفتارو کردارێکیا بەری ئەو بیروباوەڕەی دەرکەوێ ، کە یەکێك لەوان بەزەیی هاتنەوەیە بەهەتیوان‌و هەژارانا ، وە دەست‌گرتنیانە بۆڕزگارکردنیان لەپلەی‌پەست‌و، بەرزکردنەوەیان بۆپلەی‌بەرز٠

فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ (٢) وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ (٣)

**ئەوە كەسێكە كە پاڵ بەهەتیوەوە ئەنێ(٢) وە هانەهانەی مەردوم نادات بۆ خواردەمەنیدان بە هەژاران(٣) •**

**نییە ؟ ئەگەر نازانییت ئەوە كێیە ، بزانە (فذلك الذي يدع اليتيم) ئەوە كەسێكە كە هەتیو دەرئەكاتو پیا هەڵئەشاخێ ، وە بەزەیی پیا نایەتەوە ، ئنجا هەروەك خۆی دەستی هەتیوو هەژارو لێقەوماو ناگرێ (ولا يحض على طعام المسكين) هانەهانەی مەردومیش نادات لەسەر بەخێوكردنو خزمەتكردنیان ، دیارە یەكێك بەمەردوم نەڵێ بۆ یارمەتی هەتیوان ، وە چرووكیی بكات بەسەر كیسەی مەردومەوە ، خۆشی یارمەتییان نادات •**

**بەڕاستیی هەتیو نموونەی تەواوی كەساسییو زەبوونییو بێكەسییە ، بێگومان هەركەسێك بەزەیی بەهەتیوا نەیەتەوە ، وە بە هێزو تەوانایی خۆی بخوڕێ ، ئەوە بڕوای بە ئایین نییە ، ئەگینا لەخوا ئەترسا ، وە لەترسی خوا یارمەتی هەتیوی ئەدا •**

**لەم ئایەتەو ئایەتی سوورەی «فجر»ەوە كە فەرمووی «كلا بل لا تكرمون اليتيم ولا تحاضون على طعام المسكين»(١) دەرئەكەوێ كە ئایینی ئیسلام زۆری مەبەسە یارمەتییو دەستگرتنی هەتیوانو هەژارانو ڕزگاركردنیان لە كەساسییو ، نزیك خستنەوەیان لە كۆمەڵەو گەل ، بەڕەنگێكیوا هەم دەستگیرۆییان بكەیت ، وە هەم هانەهانەی مەردوم بدەیت بۆ دەستگیرۆییان ، كە ئەمە شێوەی كۆمەڵانی فریادڕەسییە ، وە هەر مسڵمانێك وانەبێ ئەوە چرای بڕوا لە دڵو دەروونیا كووژاوەتەوە ، با نوێژیش بكات ، چونكە ئەگەر بڕوای ببوایە ئەیزانی كە نوێژو هەموو جۆرە خواپەرستییەك بۆ ئەوەیە كە خوا بیری مەردوم بخاتەوە ، وە هەمیشە**

(١) واتە نەء ! بەڵكو ئێوە حورمەتی هەتیو ناگرن ، وە هانەهانەی یەكتریی نادەن لەسەر خواردەمەنیدان (و دەستگیرۆیی) هەژاران •

فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ(٤) الذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ(٥)

ئنجا وای بۆ نوێژکەران(٤) ئەوانەی کە لەنوێژەکەیان بێئاگان(٥)

گەورەیی ئەوی لەبەرچاو ، وە ترس‌و بیمی ئەوی لەدڵابێ ، تا لەترسی خوا دەست لە هەموو خراپەیەك هەڵگرێ ، وە بەزەیی بێتەوە بە هەتیوان‌و هەژارانا ، وە هەووڵ بدات بۆ ڕزگارکردنیان ، هەر مسڵمانێك وانەبێ ئەوە بڕوای بە ئایینەکەی نی‌یە ، وە هەر نوێژو خواپەرستیی‌یەك بکات یا لەڕووی چاولێکەری‌یەوەیە ، وە یا بۆ ڕووپامایی مەردومە ، وەکو ئەفەرموێ (فويل للمصلين : الذين هم عن صلاتهم ساهون) سزاو لەناوچوون بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە بەدڵ لە نوێژەکەیان بێئاگان ٠

بەشی زۆری نوێژکەر نازانێ نوێژ چی‌یە ، وە بۆچی ئەیکات ، وە چۆنی ئەکات ، وە بۆکێ‌ی ئەکات ؟ ئەم هەموو قورئانەی کە تیا ئەخوێنێ ، وە ئەم هەموو پاڕانەوەیەی کە تیا ئەکات ، وە ئەم هەموو سجدەو رکووعەی کە تیا ئەبات ، لە هەمووی بێئاگایە ، بەڵکو خووی پێوەگرتووە ، وەك خووگرتنی بە ڕۆین‌و هەنگاونانی‌یەوە ، واتە چۆن هەنگاو بەهەنگاو قاچ بەرز ئەکاتەوەو دای‌ئەنێتەوە ، بێ‌ئەوەی لە هەموو هەنگاوێکیا بزانێ بۆچی ئەو هەنگاوە ئەنێ ، نوێژەکەشی هەر وایە ، بەڵکو زۆرکەس کە نوێژی دابەست ، ئیتر بیری ئەچێتەوە کە نوێژ ئەکات تا سلاو ئەداتەوە ٠

توخوا یەکێك بەلای کەمەوە ، شەوڕۆژی سی‌وچوار جار سەجدە بەرێتە بەر خوای گەورە ، وە ناوچەوانی بەندەیی بنێتە سەر خاك بۆ خاوەنی ئاسمان‌و زەویی، چۆن لەفەرمانی ئەچێتە دەرەوە ؟ وە بەزەیی بە بەندەگانی خـوادا نایەتەوە ؟ وە بەشێکی تایبەتیی لەدارایی‌یەکەی ، وە لەڕێزو دەستڕۆینەکەی ، وە لەدەسەڵات‌و گەورەیی‌یەکەی ، بەخت ناکات لەڕێی خزمەتی هەتیوان‌و هەژارانا ؟ بەڵام ئەوانەی کە بەدرێژایی ساڵ نوێژ ئەکەن ، کەچی نە جارێك ئەیان‌گێڕێتەوە لەخراپە ، وە نە ئەیانبا بۆ سەر چاکە ، ئەوانە مسڵمانی بەڕاسیتی نین ، وە هەر نوێژێك بکەن ،

أَلَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ (٦) وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ (٧)

ئەوانەی کە ڕووپامایی ئەکەن(٦) وە یارمەتی مەردوم نادەن(٧) •

هەر بۆ ئەوەیە کە پێیان بڵێن نوێژ ئەکەن ، وەکو ئەفەرموێ (الذین هم یراءون) ئەوانەی کەرووپامایی ئەکەن ، وە لەبەرچاوەی مەردوم نوێژ ئەکەن (ویمنعون الماعون) وە هەموو جۆرە یارمەتی‌یەك ئەگێڕنەوە لەمەردوم •

واتە ئەوانەی کە بەدییمەن نوێژ ئەکەن ، بەڵام هەرچی دڵسۆزیی بێ نی‌یانە لەگەڵ هەتیوانو هەژارانا ، وە هەرچی کەڵك بێ نی‌یانە بۆ لێقەوماوانی کۆمەڵەو گەل ، ئەمانە بەدڵ بڕوایان بە ئایین نی‌یە ، ئەگینا وەك یارو یاوەرەکانی پێغەمبەر سەروماڵی خۆیان بەخت ئەکرد لەڕێی یارمەتییو دەستگرتنو پێشکەوتنو بەرزبوونەوەی یەکتریی‌دا •

سُورَةَ الْكَوْثَرَ
بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم
إِنا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ(١)

## سوورەی ( کوثر )ه

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئێمە پێمان بەخشییت شتێکی زۆر گەورەو بەفەڕ (کە پێغەمبەریەتی‌یە)**

## سوورەی ( کوثر )ه

**مەککی‌یە ، ٣ ئایەتە ، ١٠ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحيم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێغەمبەر هەرچەند کوڕێکی ببوایەو بمردایە ، گەورەکانی قورەیش ئەیان ووت «محمد» بەبێ‌وەجاخ مایەوە ، وە هەردەمێ بمرێ ، دوابڕاو ئەبێ،وە ئەمەیان بە نەنگێك ئەزانی بۆ پێغەمبەر ، هەروەك هەژاریی‌و بێ‌دەستی مسلمانەکانیشیان بە نەنگ دائەنا ، وە هەمیشە گاڵتەیان پێ‌ئەکردن ، وە ئەیان‌ووت : ئەگەر ئـەم دینە ڕاست بووایە ، ئەمانە بەهێزو دەوڵەمەند ئەبوون ، وەك هەموو پارەپەرستێکی نادان کە لەهەموو کاتێکا ئەمە بیروباوەڕیانە ، مسلمانە هەژارەکانیش کـە تازە مسلمان بووبوون ، هەرچەند تەنگانەیەك ڕووی‌تێ‌ئەکردن‌و درێژەی ئەسەند ، دڵ تەنگ ئەبوون،وە نائومیدیی ڕووی‌تێ‌ئەکردن ئنجا خوا ویستی دڵخۆشیی پێغەمبەرو مسلمانەکان بداتەوە ، وە تێ‌یان بگەیەنێ ، ئەو پێغەمبەریەتیی‌و ئیسلامەتی‌یەی کە بێ‌بڕوا بە کەمی ئـەزانێ ، شتێکی ئێجگـار زۆرە ، وە هـەر پێغەمبـەرو یارانی سەرئەکەون ، وە ناویـان ئەمێنێ بە ئێجگاریی ، وە هەر دوژمنـەکانی پێغەمبەر بێ‌ناوونیشان ئەمێننەوەو دوابـڕاو ئەبن ، فەرمووی (انا اعطيناك الكوثر) ئێمـە**

پێمانبەخشییت شتێکی زۆرگەورەو بەفەڕ ، کە پێغەمبەریەتیی‌و ئیسـلامەتی‌یە ، هەرچەند بێبڕواکان ئەمە بەکەم ئەزانن ، بەڵام ئێجگار زۆرە ، وە سەرمایەیەکی ئێجگار گەورەیە بۆ هەردوو جیهان •

چی لە پێغەمبەریەتی‌و پەیوەندیی لەگەڵ خوای مەزن ، گەورەتر هەیە ؟ چی لەقورئان‌و دەستووری ئیسلام گەورەتر هەیە ؟ کە هەرچی بەڕێی ئەوانا بڕوات ، بەخۆشیی هەردوو جیهان ئەگات ، وە هـەرچی لێی لابدات گومڕاو سـەرگەردان ئەبێ ؟!!!

چی لەمە گـەورەتر هەیە کە ناوی خـوا بەبێ ناوی پێغەمبەر نەبرێ ، وە هەرچەند ئەو ناوببرێ ئەمی لەگەڵا ناوببرێ ؟!!!

چی لەمە گەورەتر هەیە ، کە ئەمە ١٤٠٠ ساڵە هەموو شەوڕۆژێك بەهەزاران ملیـون جار نـاوی پێغەمبەر ببـرێ‌و سڵاواتی لێبدرێ ، وە شـەهادەت لەسـەر پێغەمبەریەتی بدرێ ، وە بەهەزاران ملیۆن مەردوم دوایکەوون ، وە لەسەر ، ڕێی ئەو بڕۆن تا ئەمرن ؟!

چی لەمە گەورەتر هەیە کە بەهۆی ئەوو تایینی ئەوەوە ، چاکەو خێرو فەڕو بەرەکەت بباریێ بەسەر هەموو ئادەمیی‌دا ، ئنجا ئەو ئادەمیی‌یە ئەمە بزانێ‌و بڕوای پێببێ ، یـا نەیزانێ‌و بەڵام هەر بەسـەریا برژێ بەهۆی ئەوانەی کـە بەسەریانا ڕژاوەو ئەڕژێ ؟!!!

ئەم خێرو بەرەکەتە ئەوەندە زۆرە ، نە زمان دەرەقەتی دێ‌و نە قەڵەم ، لەبەر ئەوە خواش لێرەدا بەبێ‌سنوور ناوی‌برد ، تا نیشان‌بدات کە لەبرانەوەدا نی‌یە •

لەدوای‌ئەوەی کە خوا پێغەمبەری دڵنیا کرد بەمەی کە ئەوی‌داوێتێ گەورەترین بەهرەو چاکەو میهرەبانی‌یە ، وە هەرچی بەهرەو چاکەی تر هەیە لەچاو ئەوا هیچ نی‌یە ، ئنجا داوای سوپاسی لێئـەکات ! لەبەرئەوەی کە چاکتـرین سـوپاسیش بەندەگیی‌و پەرستنی خوایە بەپاکیی ، دوای ئەوە ئنجا دەستگیرۆیی هەژارانە ،

فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ(٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ(٣)

ئنجا نوێژبکە بۆ پەروەردگارت وە قوربانیی بۆسەرببڕە(٢) بێگومان هەر ناحەزت دوابڕاوە(٣) •

بۆیە فەرمووی (فصل لربك وانحر) هەر نوێژێك ئەکەیت هەر بۆ خوای بکە ، وە هەر قوربانیێك ئەکەیت هەر بۆ خوای سەربڕە ، چونکە هەر ئەوە پەروەردگارت ، وەك لە سوورەی «انعام»دا فەرمووی «قل ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين»(١) •

لە دوای مزگێنیدان بە پێغەمبەرو داوای سوپاس لێکردنی ، ئنجا گەڕایەوە سەرتوانجی بێبڕواکان، فەرمووی (ان شانئك هو الابتر) بەڕاستی هەر ناحەزەکانت دوابڕاوون ، چونکە دوای مردنیان نە ناوێکی چاك بەجێدێڵنو نە کردەوەیەکی پاك، بەڵکو یاهەر ناویان ئەپێچرێتەوە، وەیا لەگەڵ نەفرینێکی ئێجگاریدا ناوئەبرێن•

بەڵام ناوی پێغەمبەرو یارانی لەگەڵ پیاوچاکانی ئومەتی هەر پایەدارە ، وە هەر پایەدار ئەبێ لە دڵی چاکانو خواپەرستانا ، وە هەر ئەمەشە وەجاخڕوونی •

بەڕاستی خـوا ڕاستی فەرموو کە ناوی دوژمنەکانی پێغەمبـەر پێچرایەوەو نەما ، وە ناوی پێغەمبەرو یارانی درێژبووەوە لەسەر ڕووپەڕەی جیهان لەگەڵ بەرز بوونەوەو پەرەسەندنا ، وە ئەمڕۆ ئێمە ئەمە بەچاوی خۆمان ئەبینین لەکاتێکا کە لە زەمانی پێغەمبەرا ئەمە بەم ڕەنگە نەبینراوە •

(١) واتە بڵێ : بێگومـان نوێـژمو خواپەرسـتیمو ژیـانمو مـردنم بـۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە ، هیچ هاوبەشێکی نییە ، وە بەمە فەرمانم پێدراوە، ومن یەکەمینی فەرمانبەرانم •

# سوورەی ( کافرون )ە

مەککی‌یە ، ٦ ئایەتە ، ٢٩ ووتەیە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

عەرەب نەپێش پێغەمبەرا بڕوایان بە خوا بووە ، بەڵام بتی زۆریشیان داناوە بە هاوبەشی خوا ، لە وێنەی پیاوچاکانو پیاوانی گەورەی خۆیانا ، یا لە وێنەی فریشتەدا ، وە لایان وابووە کە خوا ژنی لە جنۆکە هێناوە ، وە فریشتەی لێ‌بووە ، هەروەك لایان وابووە کە ئەم بتانە لەخوایان نزیك‌ئەخەنەوە ، وەك قورئان لێیان ئەگێڕێتەوە ، ئەفەرموێ : «ما نعبدهم الا لیقربونا الی الله زلفی» واتە ئەم بتانە ناپەرستین بۆ ئەوە نەبێ کە لەخوامان نزیك‌بخەنەوە ، وەك بەشی زۆری مسڵمانانی ئەمڕۆ ، کە لەبەردەمی گۆڕێك یا پیرێك یا جێ‌نزرگەیەکا ئەوێستن ، وە داوای شتی‌وایان لێ‌ئەکەن کە لەخوا نەبێ لەکەسی‌تر داواناکرێ •

ئەم عەرەبانە لایان وابووە کە لە سەردینی ئیبراهیم پێغەمبەرن ، وە ئەوان لە خاوەن نامەکان باشترن ، چونکە جوولەکە عوزەیرو گاوور عیسا بە کوڕی خوا ئەزانن ، هەروەك خۆشیان فریشتە بە کچی خوا ئەزانن بۆیە ئەی‌پەرستن ، وە ئەم پەرستنەی خۆیان پێ‌باشتر بووە ، چونکە فریشتە بەخوا نزیکترە لە عوزەیرو عیسا ، بەڵام بەڕاستی ئەمانە هەمووی هاوبەش پەیداکردنن بۆ خوا ، وە لە دینی ئیسلاما ئەمانە هەموویان بێ‌بڕواین •

کاتێك کە پێغەمبەر هاتو فەرمووی : دینی من دینی ابراهیمە ، عەرەبەکان ووتیان : ئێمەش لەسەردینی ئیبراهیمین، کەوابوو بیروباوەڕی ئێمە لەبیروباوەڕی محمدەوە نزیکە ، وە هیچ پێویست نی‌یە کە ئێمە دەست لە دینەکەی خۆمان هەڵگرینو دوای محمد بکەوین ، وە زۆر هەوڵیاندا لەگەڵ پێغەمبەرا ، کەڕێك بکەوون ، بەم ڕەنگە ئەو سجدە ببات بۆ بتەکانی ئەمان ، وە ئەمانیش سجدە ببەن

سُورَةَ الْكَافِرُون

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ(١) لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ(٢) وَلاَ أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ(٣)

---

# سوورەی ( کافرون )ە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**بلێ : ئەی بێبڕواینە(١) من ئەوە ناپەرستم کە ئێوە ئەیپەرستن(٢) وە ئێوەش ئەوە ناپەرستن کە من ئەیپەرستم(٣)**

---

**بۆ خوای ئەو •**

**ئنجا بۆ ئەوەی ئەم بیروباوەڕە بڕووخێنێ ، وە نیشان بدات کە ئەم جۆرە سەوداو مامەڵەیە نی‌یە لە ئایینی ئیسلاما ، ئەم سوورەتە هاتە خوارەوە بەم توندو تیژی‌یە ، وە بەم ڕەپ‌وڕاستی‌یە ، فەرمووی (قل یا ایها الکافرون) بلێ ئەی بێبڕواینە (لا اعبد ماتعبدون) من ئەو خوایە ناپەرستم کە ئێوە ئەیپەرستن ، چونکە ئێوە بەلای خۆتانەوە خوایەك ئەپەرستن کە تکاکەری لا هەیە ، یا کوڕی هەیە ، یا لەشێوەی ئادەمی‌یەکا خۆی ئەنوێنێ ، بەڵام من خوایەك ئەپەرستم کە لەمانە بەدووره ، واتە نە تکاکەری لەلا هەیە ، نە کوڕی هەیە ، نە لە وێنەیەکی تایبەتی‌دا خۆی نیشان ئەدات (ولا انتم عابدون ما اعبد) وە ئێوەش ئەو خوایە ناپەرستن کە من ئەیپەرستم ، چونکە بەلاتانەوە وایە ئەو خوایەی کە ئەیپەرستن واسطەی لەلا هەیە ، وە تا حورمەتی واسطە بگرن لەخواکەتان نزیك‌ئەکەونەوە ، بەڵام خوای من واسطەی لەلا نی‌یە ، وە هاوارکردن لەیەکێکی‌ترو هانا بۆبردنی ، لەلای خوای من بێبڕوایی‌یە ، کەوابوو ئەوەی کە ئێوە ئەیپەرستن ئەو خوایە نی‌یە کە من ئەیپەرستم ، وە ئێوە خواپەرستیی خواکەی من ناکەن ، بەڵکو بێفەرمانیی ئەکەن**

وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ (٤) وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ (٥)
لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ (٦)

---

وە من ئەو خوا پەرستی‌یە ناکەم کە ئێوە ئەیکەن(٤) وە ئێوەش ئەو خواپەرستی‌یە ناکەن کە من ئەیکەم(٥) ئایینی خۆتان بۆ خۆتانو ئایینی خۆم بۆخۆم(٦) •

---

(ولا انا عابد ماعبدتم) وە من ئەو خواپەرستی‌یە ناکەم کە ئێوە ئەیکەن ، چونکە خواپەرستی من هەر بۆ خوایە ، وە بەشی کەسی‌تری تیا نی‌یە (ولا انتم عابدون ما اعبد) وە ئێوەش ئەو خواپەرستی‌یە ناکەن کە من ئەیکەم ، چونکە خواپەرستی ئێوە هاوبەشی لەگەڵا تێکەڵە ، واتە منو ئێوە نە لەخوادا یەکین ، نە لە خواپەرستی‌دا (لکم دینکم) ئایینی خۆتان بۆخۆتانەو پەیوەستیی بەمنەوە نی‌یە ، وە وامەزانن کە من لەسەر ئەو ئایینەم (ولی دین) وە ئایینی منیش بۆخۆمە ، وە پەیوەستیی بەئایینی ئێوەوە نی‌یە ، وە وامەزانن کە ئێوە لەسەر ئایینەکەی منن ، یا پەیوەستیتان هەیە لەگەڵ ئایینی منا •

# سوورەی ( نصر )ە

مەدەنی‌یە ، ٣ ئایەتە ، ١٦ ووتەیە

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

مسلمانەکان لەسەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە زۆرکەم ، وە هەژارو کەم‌دەست بوون ، وە بێ‌بڕواکان ئیجگار زۆر ، وە دەوڵەمەندو دەستدارو زۆردار بوون ، ئنجا هەرچەند ئازاری مسلمانەکانیان ئەداو تەنگیان پێ‌هەڵ‌ئەچنین ، مسلمانەکان زۆر خەفەتبار ئەبوون ، پێغەمبەریش لەلایەکەوە تەماشای ئەکرد ، ئەوا گەلەکەی بڕوای پێ‌ناهێنن ، وە هەمیشە قسەکانی بەدرۆ ئەزانن‌و چاڵی بۆ هەڵ‌ئەکەنن ، وە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆیانەوە هەرچی ئەم بناغەی بنایە خێرا ئەوان ئەیان‌ڕووخان ، لەلایەکی‌تریشەوە ، ئەم هەموو ئازارو دەردی‌سەریی خۆی‌و هاوڕێکانی لەولاوە بوێستێ ، ئنجا هەرچەند ئەمانەی ئەدیی ئاهو هەناسەی ساردی هەڵ‌ئەکێشا بۆ نەفامیی گەلەکەی ، هەروەك هێندێ‌جاریش کە سەغلەتی‌یان درێژ ئەبووەوە ، نائومێدیی رووی تێ‌ئەکردن ، وە ناوبەناو بەبێ ئارەزووی خۆیان بەدڵیانا ئەهات کە کوا یارمەتیی خوا ؟ وەك هەموو پێغەمبەرەکانی‌تر ، کە خوا لێ‌یان ئەگێڕێتەوە ، ئەفەرموێ «وزلزلوا حتی یقول الرسول والذین آمنو معه متی نصرالله»(١) بقرة/٢١٠ • ئنجا هەرچەند پێغەمبەر لەم تەنگانانە ڕزگاری ئەبوو ، پەشیمان ئەبووەوە ، لەو نائومێدی‌یەی کە ڕووی تێ‌ئەکرد ، وە ئەیزانی کە ئەوە گوناهە ، بەلام ئەمە بەنەنگ دانانرێ بۆی ، چونکە دیارە کە پێغەمبەر ئادەمیی‌یە ، وە ئاگای لەوانە نی‌یە کە خوا لەودیو پەردەی نهێنی «غیب»یەوە بۆی‌هەڵگرتووە ، ئنجا بەم سوورەتە خوا فەرمانی پێ‌ئەدات بەپەشیمانبوونەوەو ، داوای لێ‌بووردن ،

---

(١) واتە خرانە چرکەچرك تا پێغەمبەرو ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵیا ئەیانووت : کەی ئەم یارمەتیی خوایە ئەبێ •

سورة النصر

بسم الله الرحمن الرحيم

إذا جاء نصر الله والفتح(١) ورأيت الناس يدخلون في دين الله أفواجاً(٢) فسبح بحمد ربك واستغفره، إنه كان تواباً(٣)

## سوورەی ( نصر )ە

### بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**کاتێك کە هـات کۆمەکیی خواو کردنـەوە (ی دەرگای سـەرکەوتن)(١) وە مەردومت دی کە پۆل‌پۆل‌د ێنە ناو ئایینی خواوە(٢) ئەوجەلە پەروەردگارت بەپاك ڕابگرە بەهۆی ستایشی‌یەوە وە داوای لێبووردنی لێبکە ، چونکە بێگومان ئەو زۆر گیراکەری پەشیمانی‌یە(٣) ٠**

**بەڵام لەگەڵ مژدەی سەرکەوتن‌و زاڵبوونا ، ئەفەرموێ (اذا جاء نصرالله والفتح) کاتێك کەکۆمەکیی خواو کردنەوەی دەرگای سەرکەوتن‌و زاڵبوونتان بۆهات (ورایت الناس یدخلون في دین الله افواجا) وە مەردومت دیی پۆل‌پۆل‌و دەستە دەستە مسڵمان بن‌و بێنە ناو ئایینی خواوە ، واتە کە ئەمانەت دیی بەچاوی خۆت (فسبح) ئنجا بە پاکوتەمیز ڕابگـرە پەروەردگارت ، واتە بیریی‌وای دەربارە نەکەیت ، کـە گۆیا یارمەتیی ڕێی‌ڕاست‌و ئایینی ڕاست نادات ، وە بەڵێنی خۆی ناباتە سەر ، وە ئەم خوا بەپاك ڕاگرتنـەشت (بحمد ربك) بەهۆی ستایشی پەروەردگارتـەوەبێ ، کە خاوەنی دەسەڵاتێکی وایە کەس بەسەریا زاڵ نابێ ، وە دانایەکی وایە کە هەموو کارێکی بـەپێی دەستـوورو باوێکی تایبـەتی‌یە ، ئەگـەر چەند ڕۆژێـك مۆڵەتی بێبڕوایان بدات ، ئەوە بۆتاقی‌کردنەوەی بیروباوەڕی مسڵمانان‌و خاوەن بڕوایانە، وە بۆ جیاکردنەوەی پاك‌وپیسە لەیەك ، ئەگینا نە پاداشی چاکان‌و ئیش‌کەران وون ئەکات ، وە نەفـروفێڵی ناپاکانیش ئـەباتە سەر (واسـتغفره) وە داوای بووردنی لێبکە بـۆ خۆت‌و هاوڕێکانت لەو ساردبوونەوەو دوودڵی‌یەی کە ناوبەنـاو ڕووی تێ‌ئەکردن (انه کان توابا) چونکە بێگومان ئەو خوایە زۆر گیراکەری پەشیمان**

بوونەوەیە ، وە پــەروەردگارێکە کە پەروەردەی بەندەگانی خۆی ئــەکات بەخەمو خەفەتی ڕۆزگــار ، وە هــەرچەند ساردی‌یــەك ڕوویان تێ‌بــکات ، گەرموگوڕیان ئەکاتەوە ، تا ئەیانگەیەنێ بە پلەی هەرە بەرزی خۆیان ، پێغەمبەرانو پیاوانی گەورەی خوایی دوای هەموو پلەیەك لەم پلە سەختانەی کە ئەی‌بڕن ، تۆبەیەك ئەکەن لەو شتانەی کە لەو ماوەیەدا بەدڵیانا هاتووە ٠

ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی‌تریشەوە ئەمە کاتی زاڵبوونو سەرکەوتنە ، کاتی شانازیی‌و لەخۆبایی بوونە ، ئنجا بەم داوای لێبوردنە لەم‌کاتەدا ، ئەیەوێ لووتیان بێنێتەوە بەرخۆیان ، وە دان بنێن بە درێغو کۆتاهیی خۆیانا ، تا بایی نەبن ، وە دەست‌درێژیی نەکەن بۆ ئەوانەی کە تا دوێنێ دوژمنیان بوونو ئەمڕۆ بەزەبوونیی کەوتوونەتە ژێردەستیانەوە ٠

ئەمە پەروەردەی تەربی‌یەی خوایە بۆ پێغەمبەران ، ئەوە «یوسف» پێغەمبەر دوای ئەوەی کە خوا لەبیر دەری‌هێناو لە زیندان ڕزگاری‌کردو کردی بە وەزیری دارایی میسر ، وە خەوەکەی هاتە دیی ، وە باوكو دایكو براکانی هاتن بۆ لای ، وە هەموو بەجــارێك کوڕنــووشیان بۆبــرد ، وە براکانی لێی‌پاڕانــەوەو داوای لێبووردنیان لێکرد ، لەو حەلەدا لەجیاتی ئەوەی کە کەیفخۆش ببێ ، وە بە هەوای سەرکەوتنو زاڵبوون لەخۆی بایی ببێ ، کەچی وەك مرۆڤێکی لەخواترس لەوددەمەدا سوپاسی خوای کــرد ، وە لێی‌پاڕایەوە کە ئاگاداریی بیروباوەڕی بــکات ، وە بە ئیسلامەتی بی‌باتەوە بۆ بارەگای خۆی ، وە لەگەڵ چاکانی بارەگادا حەشری بکات ، وە فەرمووی «رب قد آتیتنی من الملك وعلمتنی من تأویل الاحادیث ، ناطر السماوات والارض ، انت ولی في الدنیــا والاخرة ، توفنی مسلما والحقنی بالصــالحین» واتە خوایە بەڕاستی لەخاوەنداریی بەشتدام، وەفێری تەعبیری خەوت کردم، ئەی‌دروست کەری ئاسمانــانو زەویی ، تــۆیت کارسازی من لەمــە جیهانو لەوە جیهانــا ، بە مسلمانیی بم‌مرێنەو بم‌گەیەنە بەکاروانی چاکان ٠

ئەوە «سلیمان» پێغەمبەر دوای ئەوەی کە تەختی پاشای «سباء»یان بۆ هێنا، وە لەبەردەمیا دایان نا ، سوپاسی خوای کردو فەرمووی «هذا من فضل ربی لیبلونی

أأشكر أم أكفر • ومن شكر فانما يشكر لنفسه ، ومن كفر فان ربي غني كريم»(١)

ئەوە حەزرەتی محمد لەدوای ئەوەی کە سیانزە ساڵ لەمەککە بەردەباران کراو دەرکرا ، وە شــەو لەناو ، کۆچی کردو دەربــازبوو ، لەپاشا عێلجاڕییــان لێکردو بە دەهەزار چەك بەدەستەوە ، چوونە سەری لەمدینە ، لەپاشا ئەم هەموو جەنگەیان لەگەڵکرد ، وە ئەم هەموو مسلمانانەیان کوشت ، دوای ئەمانە کە خوا زاڵی کردو مەککەی گرت ، وە بە دەهەزار کەسەوە چووە ناو شاری مەککە لەترسی خوا سەری نایە سەرپشتی وولاخەکەی ، وە سەری بەرزنەکردەوە تا دابەزی ، وە بە زمانیش سوپاس‌و ستایشی خوای ئەکرد ، وە داوای بووردنی لێ‌ئەکرد •

---

(١) واتە ئەمە لەمیهرەبانیی پەروەردگاری منە تا تاقییم بکاتەوە ، ئایا سوپاسی ئەکەم یا ناسوپاسیی ئەکەم ، وە هەرکەسێك سوپاسی کرد لەمە زیاتر نی‌یە کە سوپاس ئەکــات بۆ خۆی ، وە هەرکەســێکیش ناســوپاسی کرد بێ‌گــومان خوای من بێ‌نیازو گەورەیە •

# سوورەی ( لهب )ە

**مەککی‌یە ، ٥ ئایەتە ، ٢٧ ووتەیە**

## بسم‌الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

لە سەرەتای ئیسلامەتی‌دا ، خوا بە ئایەتی « وانذر عشيرتك الاقربين »(١) فەرمانی‌دا بە پێغەمبەر کە لەپێش هەموو کەسێکا خزمەکانی خۆی بانگ بکات بۆ بڕواهێنان بەخواو بە پێغەمبەریەتی خۆی ، پێغەمبەر «درودی خوای لێ‌بێ» چووە سەر کێوی «صفا» ــ کە لەناوەڕاستی شاری مەککەدایە ــ وە هەرچی هۆزی قورەیش بوو بانگی‌کردن ، هەموو بەدەنگی‌یەوە چوون ، لەپاشا پێغەمبەر پێی‌فەرموون : ئەگەر پێتان بڵێم لەداوێنی ئەم گردەوە لەشکرێك هەیە بەتەمایە لەناکاو بدات بەسەرتانا ، ئایا پێم باوەڕ ئەکەن ؟ هەموو ووتیان : بەڵێ ، چونکە تا ئێستا هیچ درۆیەکمان لێ‌نەبیستوویت ، ئنجا پێغەمبەر پێی‌ووتن : من پێغەمبەرم نێراووم لە خواوە بۆ سەر ئێوەو هەموو ئادەمیی ، ابولهبی مامی پێی ووت : «تبا لك الهذا دعوتنا» واتە لەناوچییت ئەوە بۆ ئەمەت بانگ‌کردیین ؟

لەو ڕۆژەوە ابولهب لەهەموو کەس زیاتر دوژمنایەتیی پێغەمبەری دەست پێ‌کرد ، تەنانەت دوای پێغەمبەر ئەکەوت لەهەر لایەك باسی پێغەمبەرێتی خۆی بکردایە ، خێرا بەدرۆی ئەخستەوە ، وە بێ‌شەرمانە ئەیووت : درۆئەکات ، وە هەمیشە دڵی مەردومی لێ‌سارد ئەکردەوە .

ژنەکەشی ــ کە ناوی «ام جميل»، وە خوشکی ابوسفیان بوو ــ لەمێردەکەی پیسترو خراپتر بوو ، بەشەوو بەڕۆژ خەریکی بوختانو هەڵبەستنی درۆودەلەسە بوو بەدەم پێغەمبەرەوە ، وە ماڵەو ماڵ ئەگەڕاو شتی ناشرینی بۆ هەڵ‌ئەبەست ، وە بە هەموو هێزو تەوانایی خۆی‌و مێردەکەیەوە ئاگری فیتنەو فەسادو دوژمنایەتیی

---

(١) واتە هۆزە نزیکەکەت بترسێنە (وە ڕێی بڕوایان نیشان بدە)

سُورَةُ اللَّهَبِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ(١)

# سوورەی( لهب )ە

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**لەناوچێ دوودەستەی ئەبولەهەب وە تیاشا چوو(١)**

هەڵئەگیرساند ، نەخوازەلا کە ماڵەکەشیان بەتەنیشت ماڵی پێغەمبەرەوە بوو ، وە بە هەموو ڕەنگێك ئـازاری پێغەمبەریان ئەدا ، وە ئەم ژنو مێـردە بووبوون بە نوێنەری شەیتـان ، وە دوژمنایەتیی ڕێی ڕاستیان ئەکرد ، لەبەرئـەوە خوا بەم سوورەتە ، نەفرینێکی نێجگاریی دادروو بەسەرشانی ابولهبو ژنەکەیا ، وە تاجیهان جیهان بێ هەر بخوێنرێتو بخوێنرێتەوە ، نەك لەبەر ئەوەی کە دوژمنی پێغەمبەر بوون چونکە پێغەمبەر گەلێك دوژمنیتری بـووە ، بەڵکو لەبەرئەوەی کە زۆر بە توندو تیژیی دوژمنی ڕێی ڕاستبوون ، تابن بەپەند بۆ ئەوانەی کە بەئارەزووی دڵیشەیتان بەرهەڵستی ئایینی ڕاست ئەوێـستن ، فەرمووی (تبت یـدا ابیلهب) لەناوچێ دوو دەسـتی ئەبولەهـەب ، واتە خـۆی نەمێنێ ، چونـکە هەموو ئیشو کـارو هەڵمەتێـکی ئـادەمیی هـەر بەدەسـتێتی کـە دەسـتی نەمـا وەك خـۆی نەمێنێ وایە ، لەبەرئەوە لەزبانی عەرەبیدا نزاکردن لەیەکێك بەنەمانی هـەردوو دەستی ، بریتییە لەنەمانی ئادەمییەکە خۆی ، لەگەڵ ئەمییشە کە ئەمە هەر نزا نییە ، بەڵکو زووبەزوو دەرکەوت کە فەرمـانی خوایە لەسەرئەوەی کە نەمێنێ ، وەکو ئەفەرمـوێ (وتب) وە لەناویش چوو ، واتە تیاچوونی لەمـولای ئەوەنـدە بێگومانە هەروەك بووبێ وایە ، بەڕاستی واش بووە ، لەدوای جەنگی«بدر»بەچەند

مَا أَغْنَى عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ(٢) سَيَصْلَى نَاراً ذَاتَ لَهَبٍ(٣)
وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ(٤) فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِنْ مَسَدٍ(٥)

سوودی پێ نەدا دارایی یەکەی و ئەوی کە کردی (لەدوشمنایەتیی پێغەمبەرا)(٢) لەمەولا ئەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدار(٣) لەگەڵ ژنەکەیا ، کە هەڵگری داروچاووگە (بۆ نانەوەی ئاژاوە)(٤) (ئەڵێیت) گوریسێك لەپووشی خورما وا لەگەردنیا(٥)

ڕۆژێك بە گەڕۆڵیی مرداربووەوە (ما اغنى عنه ماله وماكسب) قازانجی پێ نەدا ، نە ئەو دارایی یەی کە بووی ، وە نە ئەو هەوڵ و تەقەلایەی کە ئەیدا لە ڕێی دوژمنایەتی پێغەمبەرا • ئەمە تۆڵەیەتی لەجیهانا ، وە لێ تۆڵەی لەڕۆژی دوایی دا ئەمەیە کە ئەفەرموێ (سيصلى نارا ذات لهب ، وامراته) لەمەولا ئەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدار لەگەڵ ژنەکەیا (حمالة الحطب) کە هەڵگری چاووگی ئاژاوەیە ، واتە دووزمانێکی خاوەن فیتنەو فەسادە لەناوەندی پێغەمبەرو مەردومانا (في جيدها حبل من مسد) وە ئەڵێیت گوریسێکی ئەستووری بادراو لەپووشی خورما ، وا لەملیا ، وە هەمیشە کۆڵەداری وابەشانەوە ئەیباو ئەیهێنێ بۆ خۆشکردنی ئاگری دووزبانیی و ئاژاوە نانەوە •

واتە ئەو ژنە لەمەدا کە خۆی زۆر سزا ئەدات ، وە زۆر لەخۆی ئەکات بۆ دووزبانیی و هەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکیی و ئاژاوە ، ئەڵێیت کەسێکە گوریسێکی زبری ئەستووری بادراوی ناشرینی لەملایە بە کۆڵێك هەژگ و چاووگ و دڕکەوە بۆ ئاگرکردنەوە ، واتە ئەو دار هەڵگری گوریس لەملە ، چەند دیمەنێکی ناشرینی هەیە ، نەخوازەلا کە ژنیش بێ ، ئەم ژنەش لەدووزمانیی و هەڵگیرساندنی ئاگری ناکۆکیی و ئاژاوەداوایە •

⊙ ⊙ ⊙

بەم سوورەتە برایەتی دینیی دەرئەکەوێ زۆر بەجوانیی ، تەماشاکەن ئەمە نرخی ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەرو ئەوەش نرخی سلمانی فارسی کە ئاگرپەرستێکی

ئێرانی بووە ، کە پێغەمبەر دەربارەی ئەفەرموێ : «السلمان منا یا أهل بیتی» واتە سەلمان لەئێمەیە ئەی کەس‌وکارەکانم • یاخۆ بلێین ئەمە نرخی ئەبوولەهەبو ئەوەش نرخی بــلالی حەبەشی کە بەندەیەکی ڕەشی زەڕخریدە بووە ، ئەویان تا دنیــا دنیابێ مسلمانان لە ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا ، وە شەوو ڕۆژ بەم سوورەتە نەفرینی لێ‌ئەکەن ، ئەوەش بلالی حەبەشی کە پێنج‌فەرزە لەسەر منارەی عالەمی ئیسلامی‌یەوە فاتحەی بۆ ئەنێررێ لەگەل پێغەمبەرا •

سُورَةَ الإخلاَص

بِسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيم

قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ(١) أَللهُ الصَّمَدُ(٢)

---

## سوورەی ( اخلاص ) ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بلێ : ئــەوە ، خوای تاکوتەنیا(١) ئەو خوایەی جێی نیازو ئومێدە(٢)

---

## سوورەی ( اخلاص ) ە

**مەککی‌یە ، ٤ ئایەتە ، ١٥ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**(قل) بلێ ئەی محمد بە مەردوم : (هو) خەبەری بەڕاستیی بێ‌گومان ئەمەیە کە ئەفەرموێ (الله احــد) ئەو خوایەی کــە بوونی پێویســتە ، تاکوتەنیایە لــە هەموو ڕوویەکەوە (الله الصــمد) هەر خوایە جێی هیواو ئومێد ، واتە لەهەمــوو کارێکا پێویستە هەر هاوار لەو ، وە هەر داوا لەو بکرێ لەو ئیش‌وکارانەی کە بەدەست ئادەمیی نین ، وە دەرمەقەتی نایەن ، بەلام ئەو ئیش‌وکارانەی کە دەرمەقەتی دێن ، دروستە داوای یارمەتی تیا بکرێ لەم‌ولەو ٠**

**لەم دوو ئایــەتی پێشوودا ، دووشتی بۆ خوادانا ، یەکەم : کە خــوا تاکو تەنیایە ، وە هیچ هاوبەش «شریك»ێکی نی‌یە ، دووهەم : کە هەر خوایە جێی هیواو ئومێد ، ئنجا وەك یەکێك لێرەدا پرسیار بکات بلێ : بەلگەت چی‌یە لەسەر ئەم دوو**

لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ(٣) وَلَمْ يَكُن لَهُ كُفُواً أَحَدٌ(٤)

کەسی لێنەبووەو لەکەس نەبووە(٣) وە کەس هاوتای نییە(٤) •

قسەیە ؟ ئەمیش وەرامی یەکەم ئەداتەوە ئەفەرموێ (لم یلد) کەسی لێنەبووە (ولم یولد) وەلەکــەس نەبووە • وە وەرامی دووهەم ئەداتەوە ئەفەرموێ (ولم یکــن له کفوا احد) وە کەس وێنەی نییە لە خوایەتییو پەروەردگارییدا •

ئەم سوورەتە بەم کورتییە قسەی ئەو گەلانەی بردە دواوە کە لە تاکوتەنیایی خوادا بەهەڵەداچــوون ، وە توانیی هەمــوو جۆرە هاوبــەشییەك بۆ خــوا بەتاڵ بکاتەوە ، جارێ لەدوای ئەوەی کە هەموو جۆرە تاکو تەنهایییەکی بۆ خوا دانا بە ئایەتی «الله احد» ئنجا دای بەدەمی ئەوانەی کە واسطە دائەنێن لە ناوەندی خواو بەندەگانا ، فەرمووی «الله الصمد» ، دوای ئەوە گەڕایەوە سەر ئەو گەلانەی کە بڕوایان بەخوا هەیە ، بەڵام بەلایانەوە وایە کە خوا کوڕ یا کچی هەیە فەرمووی «لم یلد» •

هەروا زۆر لــە گەلان بەلایانەوە وایە کە خوا لە خوایەکیتــری پێش خۆی کەوتۆتەوە ، کە پێیئەڵێن شەیتان ، وە شەیتانیان بەلاوە ئەزەلییەکی کۆنە ، کە سەرەتای هەرگیــز نەبووە ، وە خوا لەو بــووە ، وە ئەم کوڕە لە هەمــوو کارێکیا پێچەوانەی باوکی ئیش ئەکات ، وە لە خوایەتییدا ملەملەی لەگەڵ ئەکات ، ئنجا ئەم سوورەتە ئەمەشی بردە دواوە فەرمووێ «ولم یولد» •

دەستەیەکیتر ماوە کە بەلایانەوە وایە کە خوا هاوبەشی هەیە لەخوایەتییدا ، وە هــەردوولا وەك یەك وانــە ، وەك «مانەویی» کــە دان ئەنێن بــە ڕووناکییو تارییکییدا ، وە بــە یەکەمیان ئەڵێن : خوای چاکەو بەدووهەمیان ئەڵێــن : خوای خراپە ، وە بەلایانەوە وایە کە ئەم دوو خوایە وەك یەك وانە لە خوایەتییدا ، ئنجا دەمێك ئەمیان زاڵ ئەبێ بەسەر ئەویاناو دەمێك ئەویان زاڵئەبێ بەسەر ئەمیانا ، ئنجا ئەم سوورەتە ئەمەشی بردە دواوە کە فەرمووی «ولم یکن له کفوا احد» •

سُورَةُ الْفَلَقِ

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمِ

قُلْ: أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ(١) مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ(٢)

---

## سوورەی ( فلق ) ە

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**بڵێ : پەنا ئەگرم بە دروستکەری بوونەوەر(١) لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە(٢)**

---

## سوورەی ( فلق ) ە

**مەککی‌یە ، ٥ ئایەتە ، ٢٣ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**ئەم سوورەتەو سوورەتی دوایی ، ئامۆژگارین لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرو مسڵمانان ، کە پەنا بگرن بەخوا ، لە هەموو ترس‌و بییمێکی ئاشکراو پەنهان ، وە پشت ببەستن بەخـوا ، لە پاراستنیان لە هەموو چەپاڵەیەکی ڕۆزگـار ، فەرمووی (قل : أعوذ برب الفلق) بڵێ : پەنا ئەگرم بەو خوایەی کە پەردەی نەبوونیی لەت کردووەو بوونەوەری لێ‌دەرهێناوە (من شر ما خلق) لە هەموو شەڕو ئازارێك کە تووشی مەردوم ببێ لەهەر شتێکەوە کە خوا دروستی کردووە ٠**

**لەبەرئەوەی کە زیانی هێندێك لەو شتانە ئێجگار زۆرە ، وە پارێزگاری‌یان زۆر بە گران لێ‌ئەکرێ ، هات بەتایبەتیی ناوی بردن ، فەرمووی بڵێ : پەنا ئەگرم بە خوا ٠**

وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ(٣) وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ(٤)
وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ(٥)

**وە لە زیانی تاریکی کاتێك کەدابێ(٣) وە لەزیانی فووکەران بەگرێ‌یاندا(٤)وە لەزیانی حەسوود کاتێك کە حەسەدبەرێ(٥)**

١ ـ (ومن شر غاسق اذا وقب) لەزیانی شەو کە بەتاریکی خۆی دێ بەسەر مەردوما بەڕەنگێك کە ڕزگاربوون نی‌یە لێ‌ی ، وە ئەبێ بەمایەی ترس‌و بیمێکی ئێجگار گەورە ، چونکە ئەگەر لەڕێ‌وبانایت ئەگونجێ ڕێگا وون‌کەیت ، یادڕندەیەك ڕێگات پێ‌بگرێ ، یا جانەوەرێك پێتەوە بدات ، وە ئەگەر لەماڵی خۆشتایت ئەگونجێ دوژمن هەلی بۆ هەڵکەوێ بۆ کوشتنت ، یا بردنت ، یا تاڵان‌کردنت ، یا گەلێ شتی تری وا کە ئەگونجێ هەر بەهۆی تاریکی شەوەوە تووشت ببێ ٠

٢ ـ (ومن شر النفاثات في العقد) وە لەزیانی ئەو دوو ڕووی دووزمانانەی کە هەمیشە بە درۆو بوختان خەریکن بەینی باوك‌و کوڕ ، یا ژن‌و مێرد ، یا خزم‌و خوێش،یا دۆست‌و برادەر تێك ئەدەن‌و لەیەکیان ئەکەن،ئەڵێ‌ی ئەو جادووگەرانەن ، کە بەدیمەن جادوو ئەکەن لەژن‌ومێردو گرێ‌یان بۆ لێ‌ئەدەن‌و فوویان بۆ پیا ئەکەن ٠

بەڕاستی بوختان‌و دووزبانیی شتێکی زۆر خراپە ، وە دووڕووی دووزبان ، ئەڵێ‌ی جادووگەرە ، بەدووقسەی ناشیرین برایەتیی سەدساڵە تێك ئەدات ، وە سەر لەهاوڕێ ئەشێوێنێ ، هیچ‌کەسێك ناتوانێ خۆی بپارێزێ لەزیانیان ، چونکە بەڕوویەك ، دێ بۆلای تۆو بەڕوویەکی تر ، ئەچێ بۆلای برادەرەکەت ، بەزبانێك لەگەڵ تۆدا قسە ئەکاو بەزبانێکی تر قسە لەگەڵ ئەوا ئەکات ، وە تۆ نازانییت لە پاش ملەی تۆ چی‌ئەکات‌و چی‌ئەڵێ ، لەبەرئەوە مەردوم پێویستە بەیارمەتی‌دانی خوای گەورە ، کە بی‌پارێزێ لەبوختانی بوختان‌کەران‌و دووڕوویی‌و دووزبانی‌یان٠

٣ ـ (ومن شر حاسد اذا حسد) وەلەزیانی ئەو حەسوودانەی کەحەسەدبەمەردوم

ئەبەن ، وە هەمیشە خەریکی زیانپێگەیاندنیانن بە دزییەوە ، ئەمانە لەهەموو کەس زیاتر ئیش‌ئەکەن بەپەنهانیی ، وە کنە ئەکەن لەیەکێکا ، کە نانێك یا ناوو شۆرەتێکی ببێ بۆ ڕووخاندنی ، ڕازیی‌کردنی ئەم جۆرە کەسانە لەتەوانای کەسا نییە ، کەوابوو هیچ چارەیەك نییە بۆ خۆپاراستن لە ئازار یان تەنیا پەناگرتن نەبێ بە خوا ، کە بیانپارێزێ لە ئازاری حەسوودان •

سُورَة النَاس

بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَاس(١) مَلِكِ النَّاسِ(٢) إِلَهِ النَّاسِ(٣)

## سوورەی ( ناس )ە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**بلێ : پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری مەردومان(١) پادشای ئادەمییان(٢) پەرستراوی مەردومان(٣)**

## سوورەی ( ناس )ە

**مەککییە ، ٦ ئایەتە ، ٢٠ ووتەیە**

بسم‌الله الرحمن الرحیم

## به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**لەم سوورەتەدا خوا فەرمانمان پێئەدات بە پەناگرتن بە خوا لەزیانێکی تر، کەپەنهانو نادیارە ، چونکە لەئارەزووی دڵودەروونەوە هەڵئەقوڵێ، وە هەمووکەس بەشتێکی باشیئەزانێ ، وە ناتوانێ خۆی لێبپارێزێ بەئاسانیی ، فەرمووی (قل اعوذ برب الناس) بلێ : پەنا ئەگرم بەخوای پەروەردگار کە پەروەردەی بەندەگانی خۆی ئەکات لەسکی دایکییەوە تا مردنی ، دەمێ بەخۆشییو دەمێ بەناخۆشیی (ملك الناس) ئەو خوایەی کە پاشای ئادەمییانە ، وە ئاگای لەکردەوەیانە (الـه الناس) پەرستراوی مەردومانە بەڕەنگێکی وا کە لەهەموو تەنگانەیەکا هەر ئەو ئەناسن،وە هەر هاوار لەوئەکەن ،ئنجا لەکاتێکا کە ئادەمیی هیچجۆرە پەروەردگارو خاوەنو پاشاو پەرستراوێکی بەڕاستی نەبوو تەنیا خوا نەبێ ، کەوابوو با هەر پەنا**

مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ(٤) اَلَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ
النَّاسِ(٥) مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ(٦)

**لەزیانیوە سوسە پەیداکەری خۆپەنهانکەر(٤) ئەوی کە وەسوەسە ئەخاتە دلی مەردومەوە(٥) لە جنۆکەو لە ئادەمیی(٦) •**

بەو بگرێ (من شر الوسواس) لەزیانی ئەوانەی کە قسەی خراپ ئەخەنە دلی مەردومەوە ، کە ئەوانەش رەووشتیان وایە (الخناس) خۆشارەوەو خۆوونکەرن ، واتە ئەگەر دووزبانێك ویستی بوختانێك بکات لای یەکێك ، وە ئەم یەکە بروای پێنەکرد ، وە دایەوە بەدەمیا ، خێرا ئەوکەسە پەشیمان ئەبێتەوەو قسەکەی خۆی قووتئەدانەوە ، وە پاشەوپاش ئەگەڕێتەوە ، وەك بیەوێ خۆی بشارێتەوە ، وایە •

هەر بەم رەنگە ئەگەر ئارەزوو ، یەکێکی هێنایە سەر کارێکی خراپ ، وە ئەو کەسە بەژیریی‌و بیرێکی قوول ، لەو کارە ووردبیێتەوەو سەرەنجامی لێكبداتەوە ، ئەو ئارەزووە لەخۆیەوە ئەچێتە دواوەو خۆی ئەشارێتەوە •

ئەم سیفەتی «الخناس»ەی بۆ باسکردین تا تێبگەین کە ئەو بوختانکەرانەی دووزبانانە ، زۆر هیچ‌وپووچ‌و بێنموودن ، ئەگەر مەردوم تۆزێ مەردانە بەرانبەریان بوێستێ ، زۆر زوو پەشیمان ئەبنەوە ، کەوابوو ، خوایە پەنا ئەگرین بەتۆ لەزیانی بوختانکەری دووزبان (الذی یوسوس فی صدور الناس) ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دلی مەردومەوە (من الجنة والناس) لە جنۆکەو لە ئادەمیی •

ئەوانەی کە وەسوەسە ئەخەنە دلی مەردومەوە دووجۆرن :

یەکەم :ـ پێیان ئەلێن جنۆکە کە شتێکی وونو نادیارن لەئێمەوە ، وە نازانین چین ، بەلام ئەوەندە ئەزانین کە ناوبەناو هێندێك بیری خراپمان بەدلا دێ ، کە ئەمانە لەوانەوە ئەزانرێن •

شێخ محمد عبده ئەفەرموێ «هەموو کەسێك شەیتانێکی هەیە ، کە ئەو شەیتانە هێزێکە ئارەزووی خراپەی هەیە ، وە بیری خراپ بەدل‌و دەروونا ئەهێنێ •

خوا ئەم هێـزەی دروست کـردووە بـە دوژمن لەگـەڵ ئادەمـا ، وە دەوری کردۆتەوە بۆ وەچەو نەوەشی ، بەڵام ئادەمیی بەرەڵلانەکردووە بۆ ئەم هێزە ، بەبێ چەكو قەڵغان ، بەڵکو سێ جۆرە چەکی داوەتێ کە بەرانبەریی ئەو هێزە خراپەی پێبکات ، یەکەم بڕوا • دووەهەم یادی خوا • سێهەم پەناگرتن بەخوا ، هەرحەڵێك ئادەمیی ئەم چەكو قەڵغانەی بەکار نەهێنا ئەوحەلە خۆی درێغمەندو گوناهبارە» •

دووەهەم :ـ مەردومی خراپە ، کە هەمیشە بەچاو ئەیانبینین ، وەخەریکی تێکدانی دڵی مەردومن لەیەکتریی ، بەڕاستی هاودەمی خراپ لە شەیتان خراپترە ، هەر هاودەمی خـراپ نییە کە مەردوم لەخشـتە ئەباتو گوناهی پێئـەکات ؟ هەر هاودەمی خراپ نییە ، کە کاربەدەستان تێكئەدەنو یاخییان ئەکەن ، وە لەئادەمێتی ئەیانشۆنەوە ، وە ئەیانکەن بە جانەوەرێکی دڕندە ، وە جیهانێکیان پێپیس ، وە وڵاتێکیان پێوێران ئەکەن ؟ هەر هاودەمی خراپ نییە کە دڵی ژنو مێردو باوكو فرزندو خوشكو براو خزموخوێشو دۆستو برادەرو ئاشناو ڕۆشنا لەیەك ئەکەن ؟

بەم سوورەتە خوا ڕێنموونیی کردین کە هەمیشە پەنا بگرین بە خوا لە شتی خراپ ، وە داوای یارمەتیی لێبکەین ، هەروەك لە سوورەی «فاتحە»دا پێی ووتین کە سەرچاوەی هەموو چاکەیەك ڕووکردنە خوایەو هاوار لێکردنیەتی •

کەوابوو ، خوای گەورەو میهرەبان ، هاوارە بۆ دەرگاو ، هانایە بۆ قاپی تۆ کە خۆمـانو مسڵمانان بپارێزییت لە هەموو جۆرە زیانێك ، نەخـوازەلا ، زیانی مەردومی دووڕووی دووزبانی بوختانکەری لەخوا نەترس ، کە هەمیشە بەدزییەوە خەریکە دڵی مەردوم لەیەك بکات •

پێغەمبەر هەرچەند بەشەو چووبێتە سەر جێگا بۆ نوستن ، سوورەی «قل هو الله»و هەردوو «قل أعوذ»ووی خوێندووە ، وە فووی کردووە بەناو هەردوو دەستیا ، وە دەستی هێناوە بەسەر سەرو ، دەموچاوو ، هەرچی دەستی گەیشتبێتێ ، لەلەشی •

بە یارمەتی خوا ئەمجارەش تەفسیری جزمی «عم»ەم نووسیو تەواووم‌کرد لە شەوی پێنجشەممە ۱۸ی مانگی ڕەمەزان ، ساڵی ۱۳۷٦هـ ، بەڕێکەوتی ۱۸/٤/۱۹٥۷م لە شاری مووسڵ کە لەوکاتەدا قازیی یەکەم بووم لەوێ •

## ناوەرۆکی جزمی « عم »

## ستوونی چەوتو ڕاست

| ل | د | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ١٠ | ٩ | بکۆلەن | بچکۆلەن |
| ١٧ | ٢٠ | مانگخك | مانگێك |
| ١٧ | ٢١ | پێشی | پێش |
| ١٨ | ٧ | کەبووین | ئاياکەبووین |
| ١٨ | ٢٢ | ئنسقانی | ئێسقانی |
| ٢٠ | ٢ | الا ِعلی | الأعلی |
| ٢٣ | ١٣ | الطاقة | الطامة |
| ٢٨ | ١٦ | پیرێکی | بیرێکی |
| ٣٦ | ٢٤ | يواری | يتواری |
| ٣٧ | ٦ | پیيسی | پیيس |
| ٤٠ | ٢٢ | سرووشی | سرووش |
| ٤١ | ٨ | راستەکدا | راستەکەدا |
| ٤٢ | ٢ | کاتنـك | کاتێك |
| ٤٥ | ٢ | وان عليکُم | وان عليکمہ |
| ٤٥ | ٧ | (في صورة | (فياىصورة |
| ٤٩ | ١٠ | چوونکە | چونکە |
| ٥٢ | ١٢ | (بلانقلوبهم | (بل ران علی قلوبهم |
| ٥٩ | ١٨ | خی | خۆی |
| ٦٠ | ١٥ | لەمانادا | لەمانەدا |
| ٩١ | ١ | خريع | ضريع |
| ٩٢ | ١ | تسمع | لاتسمع |
| ٩٢ | ١٣ | يومئن | يومئذ |
| ٩٩ | ٢١ | (ثمود)ی ئوممەتی (صالح) | «ثمود»ی ئوممەتی «صالح» |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠١ | ١٦ | باری | باوی |
| ١٥٠ | ١١ | جحا | جما |
| ١١٢ | ٨ | (ولسان | (ولسانا |
| ١١٢ | ١٧ | پێشخستن | پێش‌خستنی |
| ١١٧ | ٣ | کەهەورو | کەهەورەو |
| ١١٩ | ٧ | چزیانێکی | چزیا نێك |
| ١١٩ | ٩ | سوورەتەەدا | سوورەتەدا |
| ١٣١ | ١١ | «جنوب»ەوە | «جنوب»وەوە |
| ١٣١ | ١١ | «شمال»ەوە | «شمال»وەوە |
| ١٣٧ | ٤ | حالێك | حەلێك |
| ١٤٠ | ١١ | (قدس) | «قدس» |
| ١٦٨ | ١٤ | تەماشائەکات | تەماشای ئەکات |
| ١٧١ | ١٣ | قورس | قورسی |
| ١٧٧ | ١٥ | بەزێر کە ئەگونجێ | بەزێر بۆهێندێکو ئەگونجێ |

## ناوی تالیفەکانی شێخ محمدی خاڵ

### چاپکراوەکانی

١ ـ فەرهەنگی خاڵ لەسێ بەرگا . بەکوردیی
٢ ـ پەندی پێشینان ، چاپی یەکەمو دووهەم •
٣ ـ ژیانی بیتوشی بە عەرەبی •
٤ ـ ژیانی شێخ معروفی نۆدەمی بەرزنجی بە عەرەبی •
٥ ـ ژیانی مفتی زەهاویی بەکوردیی •
٦ ـ مەولوود نامەی نەوئەسەر ، یا تأریخی پێغەمبەر بەکوردیی ، چاپی یەکەمو دووهەم •
٧ ـ تەفسیری خاڵ بەکوردیی ، جزمی یەکەمو دووهەمو سییەهەم •
٨ ـ تەفسیرێکی سوورەی «فاتحە» بەدوورو درێژیی وە بەکوردیی •
٩ ـ تاریخ الامارة الافراسیابیة ، أو حلقة مفقودة من تأریخ البصرة ، بەعەرەبی ، لەچاپکراوەکانی مجمعی علمی عراقییە •
١٠ ـ المؤنثات السماعیة بەعەرەبی ، لەچاپکراوەکانی مجمعی علمی عراقی •
١١ ـ فەلسەفەی ئایینی ئیسلام بەکوردیی،چاپی سلیمانی لەساڵی ١٩٣٨م ـ ١٣٥٧ھ•
١٢ ـ تەفسیری جزمی «عم»ە بەکورتی وە بەکوردیی ، چاپی سلیمانی لەساڵی ١٩٣٥م ـ ١٣٥٤ •
١٣ ـ ژیانی ملا محمدی خاکی لەگەڵ ڕاڤەی چەکامەی نووری بەکوردیی •
١٤ ـ باباطەری هەمەدانی بەکوردی •
١٥ ـ ژیانی سید جمال‌الدینی ئەفغانی بەکوردیی •
١٦ ـ پێشگرو پاشگر •
١٧ ـ مخطوطات مکتبة الشیخ محمد الخال بەعەرەبی •

### ( چاپنەکراوەکان )

١ ـ جزمی «تبارك» و«قد سمع‌الله»و«والذاریات» •
٢ ـ کۆمەڵە ووتارێك کە ناوبراوە بە «ناڵەی دەروون» لەچوار بەرگا ، سیانیان بە کوردییو چوارەمی بەعەرەبی ، لەسەر باس «موضوع»ی ئایینییو مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی •
٣ ـ کۆمەڵە دوان «خطبە»ی سەر دوانگەی جمعە ، بەکوردییو بەعەرەبی •
٤ ـ دەستووری زبانی کوردیی بە «صرف»و «نەحو»ە وە بەکوردیی •
٥ ـ کۆمەڵە پەراوێزێك بەعەرەبی بەسەر پەراوێزی ملا عبدالرحمنی پێنجوێنی بە سەر گلنبوی برهانەوە لەعلمی منطقا •
٦ ـ کۆمەڵە پەراوێزێك بەعەرەبی بەسەر پەراوێزی ملا عبدالرحمنی پێنجوێنی بە سەر گلنبوی ئادابەوە •
٧ ـ کۆمەڵە پەراوێزێك بەعەرەبی بەسەر سید عبدالله‌ی صرفی‌یەوە لەعلمی صرفدا•
٨ ـ کۆمەڵە پەراوێزێك بەعەرەبی بەسەر «سعدالله»ی پچووك لەعلمی نحودا •

